# تەفسیری خاڵ

منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamonada.com

بەقەڵەمی

شێخ

محمدی خاڵ

ئەندامی مجمعی علمي عراقي

**جزمی یەك**

**چاپی یەکەم**

چاپخانەی ( أسعد ) ـ بەغدا

١٣٨٩ی ك ـ ١٩٦٩ی ز

بە یارمەتیی وزارتی کاروباری شمال لەچاپدرا

# پێشکەشکردن

پێشکەشبێ :

یەکەم ـ بەگیانی پاکی پێغەمبەر « درووودی خوای لێبێ » کە ئەم قورئانە پیرۆزەی لە خواوە بۆ هێناین کە نەخشەی هەموو جیهانە ، وە تاقانە رێگایەکە بۆ گەیشتنی ئادەمیی بە چلەپۆپەی ژیان لە هەردو جیهانا ، وە گەورەترین کتێبێکە کە بە هەموو زبانێك وەرگێرراوە، وە هەرچی نامەخانەی مسلمانان هەیە هەمووی بۆزانینو روونکردنەوەی ئەوە ، وە بە هەزاران هەزار وێنەی لەبەر نوسراوەتەوە ، یا لەچاپدراوە ، بێئەوەی کە یەك هەڵەیان تیابێ ، وە یا وێنەیەکی ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش لەگەڵ وێنەیەکی ئەمرۆیدا جیاوازیی ببێ بە سەرێك ، یا بە ژێرێك ، یا بە خاڵێك ، وە لە هەموو دەمێکا بە هەزاران هەزار کەس یا لەبەریانەو دەوری ئەکەنەوە ، وە یا خەریکی لەبەرکردنینی ، وە لە نامەخانەی گاوورو جوولەکەو مسلمانو بووزاییو بورەهماییو زەرردەشتیی و بێبررواو برروادارا چونیەك هەیە ، وە هەرچی زانای بەرز هەیە لە هەمووجیهانا ئەیخوێننەوە ، هەروەك گەلێکیشیان ئەیکۆڵنەوە ، وە دەستووری جوانی لێوەرئەگرن •

دووهەم ـ بە گەلی کورد کە مسلمانی بەراستیین ، وە ئەم ئایینە پاکەیان بە دەموودەست گرتووە ، وە پەیرەویی ئەکەن ، وە هەمووکاتێك سەرو ماڵی خۆیان بەختئەکەن لەپێناوی ئەوا •

محمدی خاڵ

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## سەرەتا

سوپاس بۆ ئەوخوایەی کە ئەوەتی خۆمناسیوە کردوومی بە پەروانەی قورئان ، پەروانەیەکیوا کە زۆرجار تینو تەووژمی لەوانەبووە کە بمسووتێنێ ، وە ئەوەتی بیرم کردوەتەوە کردوومی بە بلبلی شێتو شەیدای قورئان ، بلبلێکیوا کە هەمیشە گۆرانیم بە ئایەتەکانیو سۆزم بە فەرموودەکانییەوەیە .

جا لەبەرئەوە تائێستا هەرچیم دیبێ دەربارەی قورئان خوێندوومەتەوە ، وە هەرچیم پێ جوان بووبێ لای خۆم نووسیومەتەوە ، بەرەنگێك کە بەپێی رۆژ دەستمایەیەکم لە قورئانا پەیداکرد ، دەستمایەیەکیوا کە بتوانم تەفسیری لێبکەم ، بەڵام هەمیشە چاوەروانی هەلێکم ئەکرد کە دەستی بدەمێ ، تا لەم چەند ساڵی دواییەدا ناوچەکەمان تێكچوو ، وە زۆرو ستەمو دەستدرێژیی تیا گەیشت بە ئەندازەیەك کە کەس بەتەمای سەروماڵی خۆی نەما ، وە هەمووکەسێك ـ وەك کەڵەشێری لۆقەنتە ـ هەمیشە چاوەروانی دەستێکی چەپەڵ بوو کە چەقۆیەك بە ملیا بێنێ ، لەبەرئەوە هەرچی دەرگای هیوا بوو هەمووی داخرا ، وە هەرچی رووناکیی بوو کووژایەوە ، تەنیا قاپی لای خوا نەبێ ، وە هەموو کەسێك پەرێشانییو ترسو بیمی گەیشت بەئەندازەیەك هەمیشە دڵی لێیئەدا ، وە لەپێش خۆراکی جەستەدا عەوداڵی خۆراکی گیان بوو ، منیش هەروا بەشوێن شتێکا ئەگەرام کە پاڵی پێوە بدەمو دەستێ پێبگرم ، دیارە باشترین شت بۆ خۆشمو گەلەکەشم هەر قورئانە کە بە زبانی کوردیی تەفسیرێکی رەوانی لێبکەم ، تەفسیرێکیوا کە هەمووکەسێك بەپێی خۆی بەهرەی لێوەرگرێ ، بەڵام قورئان دەریایەکی بێپایان.. و جیهانی ئەمرۆ تاریك .. و ئاسمان لێلو ئاڵۆز .. و شەوگار دوورو درێژ .. و هۆشو بیر پەرت .. و دڵ تەنگ .. و تەمەن لە پایزی ژیانا .. و من بە بەلەمێکی شەقو شرِی

یەك کەسی یەوە ئەم دەریا بێ‌پایانە ، وە ئەم رێگە دوورو درێژە چۆن ببڕم ؟! ساخوا بەمیهرەبانیی خۆی یارمەتیم بدات بۆ تەواو کردنی هەروەك یارمەتیی دام بۆ دەست‌پێ کردنی •

* * *

خوای مەزن دوو کتێبی گەورەو پیرۆزی داناوە ، یەکێکیان گویا « ناطق »و ئەویتریان بێ‌دەنگ ، گۆیاکەیان قورئانو بێ‌دەنگەکەیان بوونەوەر « کون »ە •

ئایەتەکانی بوونەوەر ئەگەر خامۆش‌و بێ‌دەنگ بن ، وە مەردوم بە بێ‌دەنگیی پەندو ئامۆژگاری‌یان لێ‌وەرگرن ، وە تاك‌و تەنیـایی خوایان تیـا بخوێننەوە ، ئایەتەکانی قورئان گۆیاو قسەکەرن خوا بە مەردوم ئەناسن ، وە رێگای راست‌و دروستیان نیشان ئەدەن •

بەڵێ قورئان بۆ نیشاندانی خوا بوونەوەرێکی گۆیاو قسەکەرە ، هەروەك ئەم بوونــەوەرە قورئانێــکی خامۆش‌و بێ‌دەنگە ؛ یاخۆ بڵێین ئــەم بوونەوەرە کۆشکێکی گەورەو بێ‌پایانە ، وە ئەم قورئانە نەخشەو خەریتەی ئەوە •

من بەش‌بەحاڵی خۆم هەرچەند لە قورئان وورد ئەبمەوە وەك لە بوونەوەر وورد بمەوە وایە ، واتە چەند ئەم بوونەوەرە بێ‌پایانە بە هەزاران ملیون رۆژو مانگ‌و ئەستێرەیەوە بە دەست‌کردی ئادەمیی ئەزانم ، قورئانیش ئەوەندە بـە دەست‌کردی ئادەمیی ئازانم •

یاخۆ بڵێین بوونەوەر چەندە بەڵگەیەکی ئاشکراو نمایانە لەسەر بوونی خوا ، ئــەم قورئانەش لە پێغەمبــەرێکی نەخوێندەوارەوە ئەوەندە بەڵگەیــەکی ئاشکراو نمایانە لەسەر پێغەمبەریەتیی پێغەمبەر ، هەروەك قورئان خۆشی ئیشارە بۆ ئەم قسەیە ئەکات لە سوورەی « رعد »دا ئەفەرموێ « وَيَقولونَ لَسْتَ

مُرْسَلا • قُلْ كَفَى بِاللهِ شَهِيداً بَيني وبَيْنَكم ومَنْ عِنْدَهُ عِلمُ الكتاب »(١) •

بەلام داخەکەم زۆرکەس نە لە بوونەوەر وورد ئەبنەوەو نە لە قورئان ، وە نە بەم دڵیان دائەچڵەکێو نە بەو ، بۆیە قورئانیش بۆ ئەویان ئەفەرموێ « وكَأَيِّن منْ آيةٍ في السماوات والأرضِ يَمُرّونَ عليها وهم عَنْها مُعْرِضون »(٢) وە بۆئەمیان ئەفەرموێ « أفَلا يَتَدَبَّرونَ القرآنَ أمْ على قلوبٍ أقْفالُها »(٣) •

قورئان پوختەو پاڵاوتەی هەموو ئاینەکانی پێشووە ، وە تۆمارێکی پاكو تەمیزە بۆ ئەو هەموو ئامۆژگاری‌یە جوانانەی کە پێغەمبەران بەرودا پێشکەشی کۆمەڵی ئادەمی‌یان کردووە لە بەرەبەیانی مێژووەوە تا ئەمرۆ •

قورئان دواوان « ملتقى » یکی زۆر گەورەو بەفەررە بۆ ئەو هەموو پەندە بەرزانەی کە لە هەزاران ساڵەوە دراوە بە گوێچکەی ئادەمی‌دا •

قورئان جوانترینو راست‌ترین تەعبیرە لە باسی ئەو ئامۆژگاری‌یانەی کە نووحو ابراهیمو مووساو عیساو محمد کردویانە هەریەکە بۆ گەلی خۆی •

قورئان سەرمەشقە بۆ مسڵمانان تا هەمیشە چاوی لێبکەن ، وە زانستگا « جامعة »یەکی بەرزە تا هەموو رۆژێك دەرسی تیا وەگرن •

قورئان دەستووری پەروەردەیی « تربیە »یە ، هەروەك دەستووری ژیانی کردەوەیی « حیاتی عملی » یە •

---

(١) واتە ئەوانەی کە بێبڕوان ئەڵێن : تۆ رەوانەکراو(ی خوا ) نیت ، بڵێ خوا بەسە بە گەواه لە ناوەندی منو ئێوەدا لەگەڵ ئەوانەی کە زانان بەقورئان •

(٢) واتە زۆر نیشانە ( ی تاكو تەنیایی خوا هەن ) لە ئاسمانەکانو زەوی‌دا کە ( ئادەمیی ) بەسەریا تێئەپەڕنو رووی لێوەرئەگێڕن •

(٣) واتە بۆچی لە قورئان وورد نابنەوە ؟! یا ( نێرراوەتە خوارەوە ) بۆسەر دڵو دەرووني داخراو ؟!! •

قورئان کورتەی هەموو هەوڵو تەقەلای پێغەمبەرانو پیاوچاکانی جیهانە لەگەڵ تاقی کردنەوەو بەراووردی هەزاران ساڵی ئادەمی کە پێشکەشی ئەکات بە مسڵمانان بۆ ئەوەی ببێ بە توێشووی ڕێگای دوورو درێژیان •

قورئان ئامۆژگارێکی دڵسۆزە وا بەسەر دووانگە « منبر »ی دوواندەریی « خطابة »یەوە ، هەمیشە هاوار ئەکاتە مسڵمانان ئەڵێ : ئەی مسڵمانینە ئەمە بکەنو ئەوە مەکەن ، ئەوە دۆستتانەو ئەوە دوژمنتانە ، ئەوە جێی مەترسی‌یە ئاگاتان لیێ بێو خۆتانی لێ بپارێزن ، وە یا خۆتانی بۆ ئامادە بکەن •

قورئان نامەیەکی ئاسمانی‌یە لای خواوە هاتۆتە خوارەوە بۆسەر دڵو دەروونی پێغەمبەری ئیسلام بەهۆی فریشتەی سرووشەوە بۆ ڕاگەیاندنی بە مەردوومی سەرزەویی بە ڕەشو سپیو زەردو سووری‌یەوە ، وەك لە سوورەی « فرقان »دا ئەفەرموێ « تَبارَكَ الَّذي نَزَّلَ الفُرقانَ على عَبْدِهِ ليكونَ للعالمينَ نَذيرا »[١] •

قورئان نامەیەکی دینیو کۆمەڵایەتیو ئابووریی « اقتصادی »و مێژوویی‌یە ، وە نامەی ڕەووشتو خوییو رامیاریی « سیاسیی »و زانیاریی « علمی »یە ، دەستوورو باوی خوا نیشان ئەدات لە هەر دو جیهانا ، وە هۆی پێشکەوتنو پاشکەوتنو مردنو زیندوبوونەوەی گەلان پێش‌چاو ئەخات ، لەبەرئەوە قورئان لە زۆرکۆنەوە بە هەموو زمانێکی زیندوو تەفسیرو ترجمە کراوە ، بە زبانی کوردیی نەبێ کە لە زۆر لەوزبانانە کەمتر نی‌یە •

## ( مێژووی دەستکردن بە هاتنەخوارەوەی قورئان )

قورئان لە مانگی ڕمضانا دەستی‌کردووە بە هاتنە خوارەوە، وەك دەرئەکەوێ لە ئایەتی « شَهْرُ رمَضانَ الذي أُنْزِلَ فيه القرآن »[٢] •

---

(١) واتە بەپیتو بەرەکەتە ئەو خوایەی کە قورئانی ناردە خوارەوە بۆ بەندەی خۆی تا ببێ بە ترسێنەری هەموو ئادەمی •

(٢) واتە مانگی رەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی تیا هاتۆتە خوارەوە •

ئایەتی « إنَّا أنزَلْناه في ليلة القَدر »[1]یش نیشانئەدات کە یەکەم سرووش لە شەوی « قدر » دا بووە ، بەڵام نازانین ئەوشەوی قەدرە کامشەوە لە مانگی ناوبراوا ، زانایانی ئیسلام لە دیاریی‌کردن « تعیین »ی ئەوشەوەدا زۆریان قسە کردووە ، هێندێك ئەڵێن لە یەکێك لە شەوە تاکەکانی بەشی سێهەمی رەمەزانا بووە ، شیخ حسنی بصری ئەفەرموێ لە شەوی ۱۷ی رەمەزانا بووە بەرێکەوتی ٦/٨/٦١٠ ، وەك ئایەتی سوورەی « أنفال » ئەیگەیەنێ کە ئەفەرموێ « إنْ كُنْتُم آمَنْتُمْ بِالله وَمَا أنزَلْنَا عَلى عَبْدِنا يَوْمَ الفُرقَانِ يَوْمَ التَقَى الجَمْعانِ »[2] ، چونکە « یوم الفرقان » ئەورۆژەیە کە لەشەوەکەیا دەست‌کراوە بە ناردنە خوارەوەی قورئان ، وە « یوم التقی الجمعان »یش ئەورۆژەیە کە جەنگی « بەدر »ی گەورەی تیا قەوماوە کە ئەویش لە ۱۷ی رەمەزانی ساڵی دوودا بووە ، بەرێکەوتی ساڵی ٦٢٤م ، ئنجا ئەم ئایەتە ئەفەرموێ : ئەورۆژەی کە دەست‌کرا بە ناردنە خوارەوەی قورئان لە ساڵی ٦١٠دا هەر خود « عین »ی ئەورۆژەیە کە جەنگی بەدری گەورەی تیا کرا لە ساڵی ٦٢٤دا ، واتە ئەم دوو رووداوە لە یەك رۆژ ، وە لە یەك مانگا بوون با ساڵەکانیشیان جیابن[3] .

هەر بەمرەنگە قورئان ئایەت بەئایەت‌و سوورەت بەسوورەت بەپێی رووداو هاتۆتە خوارەوە تا دوایی ساڵی دەی کوچیی کە لە نۆی مانگی « ذی الحجة » بەرێکەوتی ساڵی ٦٣٢م ئایەتی « اليومَ أكْمَلْتُ لكم دينَكم ، وأتْمَمْتُ

---

(۱) واتە ئێمە قورئانمان ناردە خوارەوە لە شەوی « قدر »دا .

(۲) واتە ئەگەر برواتان هەیە بەخواو بەوەی کە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ بەندەی خۆمان ( محمد ) لە رۆژی ( ناردنی ) قورئانا ئەورۆژەی کە دوو لەشکر دایان بەیەکا ( لە بەدردا ) .

(۳) وەرگیراوە لە تەفسیری طبری‌و دائرة معارفی سەدەی بیستەم‌و « تاريخ القرآن »ی محمد طاهری کوردیی‌و « تاريخ القرآن »ی أبی عبدالله زەنجانی‌و « معجم » القرآنی عبدالرؤفی مصری ، جلدی ۲ ل ۹۱و ووتارێکی طه الراوي لە ژمارەي چواري ساڵي دوو لە گۆڤاري « القضاء » دا .

عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي ، وَرَضِيتُ لَكُمُ الاِسْلامَ دِيناً »[1] هاتە خوارەوە •

## ( مكى و مدنى )

قورئان یەکەمجار لە مکە دەستی‌کردووە بە هاتنە خوارەوە ، وە پێغەمبەر (١٢) ساڵو پێنج مانگو (١٣) رۆژ لە مکەدا مایەوە ، لەپاشا کە نائومێد بما لەبەر لاساریی‌و قیرسیچمەیی گەلەکەی ئیتر مکەی بەجێ‌هێشتو چوو بۆ مدینە ، ئنجا هەرچی لەوماوەیەدا هاتبێتــە خوارەوە پێی‌ئەڵێن « مکی » ئیتر چ لە مکە هاتبێتە خوارەوە چ لە دەوروبەری ، وە هەرچیش لەدوای گەیشتنی بە مدینــە هاتبێتە خوارەوە پێی‌ئەڵێن « مدنی » ئیتر چ لە مدینە هاتبێتــە خوارەوە چ لـــە دەوروپشتی •

قورئان ١١٤ سوورەتە ، ٢٢ یان مدنیین‌و ئەوانیکەی‌تری مکین ، مدنی‌یەکان هەرچەند بــە سوورەت کەمن بــەڵام وەکی‌تر زۆرن ، وە سێ‌یــەکی قورئانن ، ئایەتەکانی مکی هەمووی هەر باسی خواو تاکو تەنیایی ئەوە لەگــەڵ باسی رۆژی دوایی‌و پرسینەوەو بەهەشتو دۆزەخو پاداش‌و سزاو هانەهانەی مەردوم لەسەر رەوشتو خووی بەرزو جوان •

## ( چۆنێتی کۆکردنەوەی ئایەتانی قورئان )

ئایەتەکانی قورئان بەپێی رووداو « حوادث » ئەهاتنــە خوارەوە ، واتــە لەگەڵ شتێك رووی‌بدایێ ، یا پێویستێك ببوایە ، بەوبۆنەیەوە ئایــەتێك یا دوو یا زیاتر ئەهــاتە خوارێ ، وە هەموو ئایەتێك کــە بۆ وەرامی پرســیارێك یا بۆ روون‌کردنەوەی مەبەسێك ئەهات وەك ئاوێکی ساردو شیرین وابوو کە بدرێ بە تینویەك کــە چاوەروانی ئاو بێ ، جگە لــەوە کە رووداني ئــەو رووداوەو

(١) واتە ئەمرۆ ئايینەکەتانم بەپایان گەیاندو ، نعمتی خۆمم بۆ تەواو کردن ، وە ئايینی ئیسلامم بە هەڵبژاردە بۆ دانان •

چاوەروانی پێغەمبەرو مسڵمانان بۆ وەرام ئەبوو بە رافە « شرح » بۆ ئەو ئایەتانەی کە ئەهاتنە خوارەوە ، وەك پەندێکی پێشینان کە یەکێك لە شوێنی خۆیا بیخوێنێتەوە چۆن ئەو شوێنە تایبەتی یە رافەی ئەو پەندە ئەکات ، وە مەبەسەکەی دەرئەخات ، ئەو بەسەرهاتو رووداوانەش کە ئایەتیان تیا ئەهاتە خوارەوە ئاوا رافەی ئایەتەکانی ئەکرد ، لەبەرئەوە زۆر هاورێی نەخوێندەواری پێغەمبەر بەهۆی ئەوەی کە لە ناوچە « ظروف »ی ئایەتەکانا بوون بەقەد زانایەکی بەرزی ئەمررۆ لە قورئانەکە گەیشتوون ، وە هەر لەبەرئەمفەلسەفەیەیە کە قورئان هەمووی بەجارێك نەهاتۆتە خوارەوە ، وەك خوا خۆی ئەفەرموێ « وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلا أُنْزِلَ عَلَيْهِ القُرآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلا »(١) .

هەموو ئایەتێك کە ئەهاتە خوارەوە پێغەمبەر ئەیخوێندەوە بەسەر نووسەری سرووش « کاتبی وحی »دا ، وە ئەیفەرموو ئەمە ئایەتی ئەوەندەهەمە لە فلان سوورەت ، لەکاتێکا کە ئەو سوورەتە لەوەپێش بەشێکی لێ هاتبێتە خوارەوە بەخۆیو ناوەکەیەوە ، وە ئەگەر هیچی لێ نەهاتبایەتە خوارەوە ، یا چەند ئایەتێکی لێ بهاتایە بەبێناوەکەی ئەو ئایەتە هەڵئەگیرا تا ناوی سوورەتەکەی ئەهاتە خوارەوە ، ئەوحەلە پێغەمبەر ئەیفەرموو : فلان ئایەت کە لە فلان وەختا هاتووە ئایەتی ئەوەندەهەمە لەم سوورەتە کە ئەمررۆ ناوەکەی هاتووە ، خولاسە هەر ئایەتێك بهاتایەتە خوارەوە ، بە فەرمانی پێغەمبەر ، وە لە بەردەمی پێغەمبەرا ئەنوسرایەوە ، وە ژمارەی ئەدرایە ، وە لە ماڵی پێغەمبەر هەڵئەگیرا ، هەروەك بە دەرس ئەیفەرموو بەزۆر لە هاورێکانی خۆی ، وە ئەوانیش ئەوەندەیان دەور ئەکردەوە لە بەردەمی پێغەمبەرا تا لەبەریان ئەکرد ، هەروا بەورەنگە ئەوانیش بۆ مەردومیتر ، وە ئەمە رۆژو دوو رۆژو ساڵو دوو ساڵ نەبووە ، بەڵکو ٢٣

---

(١) واتە ئەوانەی کە بێبرروان ووتیان : بۆچی بەجارێك قورئانی بۆ نەهاتە خوارێ ، هەروا بەپەراگەندە بۆمان ناردییت تا دڵت دامەزرێنیین بەو قورئانە ، وە ( بەوبۆنەیەوە ) ئایەتانی خۆمم بۆ ناردن بەرەودوا .

ساڵ لەسەریەك درێژەی سەندووە ، وە هەر ئایەتێك بهاتایەتە خوارەوە پێغەمبەر خۆی لەبەری ئەکرد ، وە هاورێکانی ـ کە لێیان وەرئەگرت ـ لەبەریان ئەکرد ؛ وە هەموو لە نوێژا دەوریان ئەکردەوە ، وە پێغەمبەر لە نوێژی ئێوارانو شێوانو خەوتنانا بەدەنگی بـەرز قورئانی ئەخوێنـد لەدوای فاتحـە ، وە مسڵمانەکان گوێیان بۆ ئەگرت ، جگە لەوە کە نزایان هەر بە ئایەتی قورئانو پاررانەوەیان هەر بە قورئانو نوێژیان هەر بە قورئانو کۆرری زانین « مجلسي علم »یان هەر بە قورئانو دوواندن « خطبه »یان هەر بە قورئان بووە •

خولاسە فریشتەی سرووش قورئانی لەخواوە هێنا ، بێئەوەی دەستکاریی بکات ، وە پێغەمبەریش بەورەنگە لە فریشتەی سرووشی وەرگرتو گەیاندی بە مسڵمانان ، وە هاورێکانیش « أصحاب » بەورەنگە وەریان گرت لەپێغەمبەر ، لەپاشا چینبەچین مسڵمانان لەیەکەوە وەریانگرت تا ئەمررۆ بەورەنگەی کـە ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش هاتۆتە خوارەوە ، بێئەوەی جیاوازیی ببێ بە سـەرێك ، یا بە بۆرێك ، یا بە ژێرێك ، یا بە هەڵکشاوییەك ، یا بە داکشاوییەك ، یا بە گیراوییەك ، یا بە خاڵێك ، هەر بەورەنگە ئێمەش ئەیدەینە دەست چینێکیتر ، وە چینبەچین دەوری ئەکەنەوە بۆ یەکتریی تا ئەورۆژەی هەموو ئەچنەوە لای خوا، وە خوا خۆی پارێزگاریی ئەکات وەك ئەفەرموێ « إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وإِنَّا لَهُ لَحافِظُونَ » واتە ئێمە خۆمان قورئانمان ناردۆتە خوارەوە ، وە ئێمە ئاگاداریی ئەکەین •

هێندێ ئایەت لەپێش کۆچکردن بۆ مدینە هاتووە ، بەڵام چونکە سوورەتیان نەبووە کە پێیانەوە بنوسێنرێ ماونەتەوە تا دوای کۆچکردن ، ئەوجەلە ئنجـا نووسێنراوون بە سوورەتێکی مدنییەوە ، کـە ناوەکەی لە مدینـە هاتووە ، هەروەك هێندێ ئایەت لە مدینە هاتووە ، کەچی نووسێنراوە بـە سوورەتێکی مکییەوە ، کـە لەوەپێش لـە مکە هاتۆتە خوارەوە ، لەبەر مناسبەی لەگـەڵ ئایەتەکانی ئەوا ، وەك سوورەی « مزمل » کە ١٩ ئایەتی لە سەرە وە لە ساڵی سێهەمی پێغەمبـەریەتیدا هاتۆتە خوارەوە لە مکە ، بەڵام ئایەتی بیستەمی کـە

ئەفەرموێ « إنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أنَّكَ ... » تادوایی سوورەتەکە دوای سیانزە ساڵ لە مدینە هاتووە ، هەروەك لە قورئانا لە سەرەتای هێندێ سوورەتەوە نوسراوە : کە ئەم سوورەتە مکی‌یە ئایەتی فلانو فلانی نەبێ کە مدنیین ، یا ئەم سوورەتە مدنی‌یە فلان ئایەتی نەبێ کە مکی‌یە ، خولاسە هەمیشە سێ چوار سوورەت بەکراوەیی بووە تا پڕئەبووەوە ، وە پێغەمبەر ئەیفەرموو ئەم سوورەتە تەواو بوو .

لەمەوە دەرئەکەوێ کە ریزکردنی ئایەتو سوورەتەکانی قورئان بەمجۆرەی کە ئێستا هەیە ، هەمووی بە فەرموودەی پێغەمبەر بووە ، وە ئەو ژمارەی داوە بە هەموو ئایەتێك لە هەموو سوورەتێکا .

## ( نووسینەوەی قورئانو کۆکردنەوەی )

پێغەمبەر « دروودی خوای لێبێ » نووسەری زۆری بووە لە هاورێ گەورەکانی وەك أبو بکرو عمرو عثمانو علیو زبیری کوڕی عوامو أبیّ کوڕی کعبو زیدی کوڕی ثابتو کەلێکی‌تر کە ژمارەیان لە مدینە گەیشتۆتە ٤٣ کەس ، خوایان لێ رازیی بێ ، وە هیچ وەخت لە پێغەمبەر دوور نەئەکەوتنەوە ، وە هەمیشە لەسەفەریشا سێ چوارێکیان لە خزمەتیا بوون[١] ، بەڵام زۆرتر پێغەمبەر لە مدینە زیدی کوڕی ثابتی بانگ کردووە ، چونکە کەنجێکی زیرەكو وریاو خەتخۆش بووە .

زید ئەفەرموێ : هەرچەند بانگ ئەکرام بۆ خزمەت پێغەمبەر ، ئەو ئایەت بەئایەت ئەیخوێندەوە ، وە من ئەمنووسی‌یەوە تا تەواو ئەبوو ، ئنجا پێغەمبەر ئەیفەرموو بۆمبخوێنەرەوە ، منیش بۆمئەخوێندەوە ، ئەگەر هەڵەیەکم بکردایە راستی ئەکردەوە .

(١) وادەرئەکەوێ لەم ژمارە زۆرەوە کە پێغەمبەر ویستوویەتی هەرچی بزانێ بنووسێ ئەم رێزەی بداتێ ، وە بیکا بە نووسەری سرووش تا مەردومی‌تر چاویان لێبکەن وە فێری نووسین ببن .

لەبەرئەوەی کە لەورۆژەدا کاغەز نەبووە ناچار ئایەتەکانی قورئانیان ئەنووسی‌یەوە لە پێستی ئاسك ، یا لقی دار خورما ، یا دەفەی شانە حوشتر ، یا بەردی تەنکی لووس ، وە ئەمانەیان لە ماڵی پێغەمبەر هەڵئەگرت ، زۆر کەس ئایەت بە ئایەت کە ئەهاتە خوارەوە ، بەتایبەتیی ئەی‌نووسی‌یەوە بۆخۆی ، هەروەك زۆرکەسیش ئایەت بە ئایەت لەبەری ئەکرد ، وە هەموو لە دەم پێغەمبەریان وەرئەگرت ، وە لە ماوەی یەك دوو رۆژا ئەو ئایەتانەیان بلاو ئەکردەوە بەناو هەموو مسڵمانەکانا بە ژن‌و پیاوەوە ، وە ئەوانەی کە ئایەتەکانیان لەبەر ئەکرد ، ناوبەناو ئەچوونە خزمەت پێغەمبەرو دەوریان بۆ ئەکردەوە بۆ دڵنیایی ، لەم‌دوایی‌یەدا کە خەریك‌بوو قورئان بە پایان بگات ناوبەناو ئەچوونە خزمەت پێغەمبەر خەتمێکی قورئانیان بۆ ئەکرد ، وە ئەویش گوێی لێ‌ئەگرتن(١) ، تەنانەت لەپێش کۆچکردنی پێغەمبەرا بەماوەیەکی کەم سێی جزمەی قورئان لەسەرەوە تا خوار بەم خوێندنەوەیە « قراءة »ی کە ئێستا مسڵمانان دەوری پێ‌ئەکەنەوە لە بەردەمی پێغەمبەرا دەوور کراوەتەوە ، وە گوێی بۆ هەمووی گرتووە ، وە زیدی کوڕی ثابت یەکێك‌بووە لەوانەی کە حازری ئەم قورئان خوێندنە بوون •

کاتێك کە پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد قورئان ــ بەوجۆرەی کە ووتمان ــ لە ژوورێك هەڵدرابووەوە لە ماڵی پێغەمبەرا ، تا لە جەنگی « یمامە »دا حەفتا کەس لەوانەی کە هەموو قورئانیان لەبەربوو کوژران(٢) ، وە أبوبکرو عمر ترسیان لێ‌نیشت کە ئەگەر جەنگێکی‌تری‌وا ببێ نیوەی قورئان وون ببێ‌و نەمێنێ ، لەبەرئەوە بڕیاریاندا کە قورئان ئایەت بەئایەت‌و سوورەت بە سوورەت بە ڕیزکراویی هەمووی کۆبکەنەوە لە یەك دەفتەرا ، وە حەزرەتی أبوبکر فەرمانی‌دا بە زیدی کوڕی ثابت ــ کە نووسەری سروش ، وە یەکێك بووە

(١) تأریخ القرآنی أبی عبداللّٰە زەنجانی ل ١٧ •

(٢) دائرة معارفی سەدەی بیستەم ، جلدی ٧ل ٦٦٧ ، بەڵام لە سەرەتای « الاخلاق والواجبات »ی عبدالقادری مغربی‌دا ئەڵێ : حەوت‌سەد کەس کوژران لەوانەی کە قورئانیان لەبەربوو •

لەوانەی کە هەموو قورئانی لەبەربووە ــ بە کۆکردنەوەی قورئان ، وە حەزرەتی عمر بلاوی کردەوە لە شاری مدینەدا کە هەرکەسێك شتێکی لەلایە لە قورئان ــ کە لە پێغەمبەری بیستبێ ــ با بێ ، وە حەزرەتی أبو بکر فەرمانیدا بــە عمرو زیدی کوڕی ثابت کە لەبەر قاپی مزگەوت دانیشن ، وە هەر ئایەتێك دوو کەس گەواهیی لەسەر دا کە ئەمە ئایەتی ئەوەندەهەمە لە فلان سوورەت ، وە لە دەمی پێغەمبەریان بیستووە بێنووسنەوە ، وە ژمارەی خۆی بدەنێ ، لەگــەڵ ئەوەدا هەرچیش لە ماڵی پێغەمبەرا بوو لەو شتانەی کــە ئایەتی قورئانی تیانوسرابوو ئەوانەشیان هەموو هێنا ، جا زید ئەفەرموێ هەموو ئایەتێکی قورئان بە دوو ئەواه جێ کیر « ثابت » بوو .

ئنجا بەم‌رەنگە سیی جزمەی قورئانیان کۆکردەوەو ریزیان‌کرد ، لە ماوەی ساڵێکا ، وە نووسیانەوە لەسەر دەفتەرێکی گەورە لە پێستی ئاسك[1] ، بەلام سوورەتی « براءة » بە بێ « بسم الله »مایەوە ، چونکە دوای هاتنە خوارەوەی « براءة » پێغەمبەر ئەوەندە نەمایەوە کــە بفەرموێ « براءة » و « انفــال » یەك سوورەتن یا دوو سوورەتن[2] ، وە کەس گەواهیی نەدا کە پێغەمبەر بسم اللەی بۆ کردووە ، وە بــە هەموو هاورێکانی پێغەمبــەر نەیان‌توانی بسم‌اللەیەکی بۆ دابنێن ، لەمەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە ئەو دەستانەی قورئانیان کۆکردۆتەوە زۆر پاکو تەمیز بوون ، لەپاشا ئەو نسخە قورئانەیان دانا لای أبوبکر ، دوای ئــەو لای عمر بوو ، دوای ئەو لای حفصەی کچی بوو ، کە خێزانی پێغەمبەر بوو ، کەس پێویستی بەو نسخە قورئانە نەبوو ، چونکە هەزاران کەس یا لەبەریان بوو ، وە یا خەریکی لەبەرکردنی بوون ، بەلام کاتێك کە قورئان هاتە خوارێ حەوت شێوەی قسە کردن بوو لە مکەو دەوروبەریدا ، وەك شیوەی «قریش»و «قیس»و « تمیم » « هزیل » و « أسد » و « خزاعە » و « کنانە »[3] ، جالەبەرئەوەی کە

(۱) تأریخ القرآنی محمد طاهری کوردیی ل ٥٨ .

(۲) تأریخ القرآنی أبی عبداللەی زەنجانی ل ٤٢ .

(۳) دائرة معارفی سەدەی بیستەم ، جلدی ٧ ل ٢١٦ .

پێغەمبەر خۆی لە قورەیش وە شێوەی قسەکردنی قورەیشی بوو ، وە شێوەی قورەیشیش لە هەموو شێوەکانیتر رەوانتر بوو قورئان بەشێوەی قورەیش هاتە خوارەوە ، بەڵام لەبەرئەوەی کە گران بوو لەسەر تیرەکانیتر خوێندنەوەی قورئان بەشێوەی قورەیش ، خواو پێغەمبەر رێی بۆ دان کە هەرکەسە بەشێوەی خۆی دەوری قورئان بکاتەوە ، وە پێغەمبەر فەرمووی : قورئان بە هەر حەوت شێوەکە هاتۆتە خوارەوە ، وە هەر تیرەیەك قورئانی وەرگرت لە دەم پێغەمبەر بەشێوەی خۆی ، وە هەموو تیرەیەك دەوری قورئانی ئەکردەوە بەوشێوەیەی کە لای ئاسان بوو[١] ، تەنانەت زۆرجار رێئەکەوت کە ئەم تیرەیە ئاگای لە خوێندنەوە « قراءة »ی ئەو تیرەیە نەبوو ، وە لەسەر ئەوە دەمقاڵێ پەیدا ئەبوو ، وە ئەچوونە خزمەت پێغەمبەر لێیان ئەپرسی ، وە ئەویش ئەیفەرموو هەردوکیان راستەو لە خواوەیە ، پێویستە لێرەدا ئەوەش فەرامۆش نەکەین کە ئەمشێوانە مەبەسو گیانی قورئانەکە تێك نادەن •

ئەمە هەروا مایەوە تا ئیسلامییەت بڵاوبووەوە ، وە هەموو دانیشتووانی جزیرەی عەرەب مسڵمان بوون ، وە زبانی قورەیش بوو بە زبانی رەسمی ، واتە بوو بە زبانی ئایینو زانینو رامیاریی « سياسة » ، وە بەمبۆنەیەوە زاڵبوو بەسەر هەموو شێوەکانیترا ، وە ئەوان کزبوون ، وە بەرەبەرە دەستیانکرد بە خۆشاردنەوە ، وە مسڵمانان بڵاوبوونەوە بەخۆیانو ئەم حەوت شێوەیەوە لە قورئان ، وە زۆر لە گەلانیتریش مسڵمان بوون ، وە بەمبۆنەیەوە جۆرە دووبەرەکییەك پەیدابوو لەناو مسڵمانانا لە خوێندنەوەی هێندێ ووتەی قورئان ، وە ئەمە گەیشتەوە بە حەزرەتی عثمان لە مدینە ، خێرا لیژنە « لجنـه »یەکی دروستکرد لە دوانزە کەس لە پیاوانی گەورەی کۆچکەران « مهاجرين » و یارمەتی دەران « انصار » بە سەرۆکایەتی زیدی کورری ثابت[٢] ، وە بە

---

(١) سەرەتای « الاخلاق والواجبات »ی عبدالقادری مغربی ل ١٠ ، ١١ •

(٢) ئەم زیدی کورری ثابتە لە جاری یەکەما کە قورئانی کۆکردەوە بە فەرمانی أبوبکر تەمەنی ٢٢ ساڵ بوو ، لە جاری دووهەما کە قورئانەکانی نووسییەوە بە فەرمانی عثمان تەمەنی ٣٥ بوو •

چاودێریی خۆی ، وە ناردیان ئەو قورئانەی کە لەلای حفصەی خێزانی پێغەمبەر بوو ، وە لەکاتی حەزرەتی أبو بکرو عمرا کۆکرابووەوە ـ هێنایان ، وە چوار وێنەیان لێ گرتەوە[١] ، وە حەزرەتی عثمان سەرو دانەی نارد بۆ مکەو کووفەو بصرەو شام ، وە ئەمە لە ساڵی ٣٠دا بوو[٢] .

خولاسە کۆکردنەوەی قورئان سێجار بووە ، یەکەم لەکاتی پێغەمبەرا بوو بەمڕەنگە هەر ئایەتێك بهاتایەتە خوارەوە لە پارچە چەرمێك یا بەردێك یا ئێسقانێك یا لقی دارخورمایەك نوسراوەتەوە لەگەڵ ناوی سوورەتەکەیاو ژمارەی ئایەتەکانیا .

دووهەم لەکاتی أبوبکرا بوو بەمڕەنگە هەموو سوورەتو ئایەتەکانی قورئان بەریز کراویی خرانە سەر دەفتەرێکی گەورە لە پێستی ئاسك لە سەرەوە تا خوار وەك قورئانی ئەمرۆ .

سیهەم لەکاتی عثمانا بوو بەمڕەنگە لەبەر نسخەکەی ئەبو بکر چوار نسخەی لێگرتەوەو بڵاوی کردنەوە ، تا مسڵمانان وێنەی لێ بگرنەوە ، وە دووبەرەکیی نەکەوون[٣] ، وە بەمە حەزرەتی عثمان هەموو شێوەکانی قورئانی کرد بە یەك شێوە کە شێوەی قورەیشە ، وە شێوەکانی‌تر مانەوە لەناو کونو قوژبنی کتێبا کە ئێستا ناوبەناو قورئان خوێنەکانی مصر بە یەکێك لەو شێوانە ئەخوێنن لە ئێستگەی خۆیانەوە ، وە بەمە حەزرەتی عثمان « ڕەزای خوای لێ بێ » دوایی هێنا بە دووبەرەکی لە خوێندنەوەی قورئانا[٤] ، وە لەو حەلەوە تائێستا بە هەزاران هەزار وێنەیان بە دەست لەبەر گیراوەتەوە لەسەر پێستی ئاسكو کاغەزی تورمە بە جوانترین دەستنووسو زەرکفت‌کاریەوە ، هەروەك بە ملیونو

(١) تأريخ القرآني محمد طاهری کوردیی ل ٤٨ .

(٢) سەرەتای « الاخلاق والواجبات »ی عبدالقادری مغربی ل ١٠ ، ١١ .

(٣) « نظرات من القرآن »ی محمدی غزالی ل ٤٣ ، ٤٤ .

(٤) سەرەتای « الاخلاق والواجبات »ی عبدالقادری مغربی ل ١١ .

بلیون وێنەی لێ چاپکراوە(١) ، لەگەڵ ئەمەشا هەمیشە بە ملیون کەس یا قورئانی لەبەرەو دەوری ئەکاتەوە ، وە یا خەریکی لەبەرکردنیەتی •

بەڵێ هەموو برروامان هەیە بە هەر حەوت خوێندنەوەکە ، وە ئەزانین کە هەموویان دەماودەم لە دەم پێغەمبەر وەرگیراوون ، بەڵام ئەمرڕۆ کە ئەو شێوانە نەماوون هیچ پێویستێك نەما بە خوێندنەوەیان ، نەخوازەلا لە لە کویچکەی مسلمانانیشا زۆر بێکانەن ، بەڵکو ئەتوانم بلیم سەری لە هەموو قورئانخوێنێك تێك‌داوە ، تەنانەت لە زۆر پرسەدا بیستوومە لە قورئان خوێنەکانی خۆمان کە خوێندنەوەکەی خۆیان لێ‌تێکچووە ، ئەمەش هیچ فەلسەفەیەکی تیا نی‌یە تەنیا ئەوە نەبێ ئەوانەی کە ئەیخوێنن نیشانی بدەن کە قورئان بە هەر حەوت شێوەکە ئەزانن ، ئیتر گوێی لەوە نی‌یە کە مسلمانان تووشی زیان ئەبن ، یا زۆرکەس بەجۆرێکی‌تری تێ‌ئەگەن ، نەخوازەلا بێگانەن • بەڵێ ئەگەر بە یەك‌شێوە بخوێنرێ لەسەرەوە تاخوار هەر باشترە لەوەی کە هەموویان تێکەڵ بکرێن •

ئەمە لە دەمێکەوە گرێ‌بوو لە دڵما لەگەڵ گرێی ئیملای قورئان ، وە خوا خوای ئەورۆژەم بو کە بچم بۆ قاهرە ، وە بە خزمەت شیخی جامع الأزهر بکەم ، وە لەبابەت هەردو گرێکەی دڵمەوە قسەی لەگەڵ بکەم ، تاخوا رێکی‌خست چووم بۆ قاهرە ، وە لە رۆژی ١٩٦٧/٤/٦ بە رێکەوتی ١٣٨٦/١٢/٢٩ چووم بۆلای شێخی جامع الأزهر ، زانای بەرزو بەناوبانگ ماموستای گەورە شێخ حسن مأمون ، وە ئەم گرێ‌یەم کردەوە لەگەڵیا ، وە نیوسەعاتی تەواو قسەم لەگەڵ کرد ، وە هەرچیم زانی پێم‌ووت ، بەڵام بەداخەوە هیچم سەوز نەکرد •

## ( بەتەنگ قورئانەوە بوونی مسلمانان )

لەرۆژێکەوە کە قورئان هاتۆتە خوارەوە تائەمرڕۆ ، مسلمانان بەدەستو بەدەم گرتویانە ، وە لەگەڵیا خەریك بوون ، وە لە هەموو گۆشەو قوررنەیەکەوە

(١) تأريخ القرآني أبي عبدالله زەنجانی ل ٢٤ و ٢٥ •

نیی ووردبوونەتەوە ، وە هەزاران کتێبیان نووسیوەو علمیان داناوە بۆ خزمەتی قورئان ، وە سەدها تەفسیرو اصولی تەفسیریان بۆداناوە ، ئەوانەی کە نەشیانتوانیوە تەفسیری لێبکەنو کتێبی تیا بنووسن ، هێندێکیان قورئانیان نووسیوەتەوە بە دەستنووسێکیوا جوان کە چاو روون بکاتەوە ، وە هێندێکیان سەرەتای قورئانو سوورەتەکانیان رازاندۆتەوە بە نەخشی جوانو زەرکفتکاریی، وە هێندێکیان ئایەتو ووتەو پیتەکانیان ژماردووە ، کە ئایەتەکانی ( ٦٦٦٦ )و ووتەکانی ( ٧٦٤٤٠ )و پیتەکانی ( ٣٢٣٦٧١ ) دەرچوون ، هەروەك هەمووجۆرە پیتێکیان ژماردووە کە ئەوەندە ألفو ئەوەندە بێو ئەوەندە تێی تیایە ، تا هەر ٢٨ پیتەکە ، وە ئەوەندە پیتی خاڵدارو ئەوەندە پیتی بێخاڵی تیایە ، وە لەخاڵدارەکانیا ئەوەندەیان یەکخاڵیو ئەوەندەیان دووخاڵیو ئەوەندەیان سێ خاڵین ، وە ئەوەندە خاڵە لە هەموو قورئانا هەیە ، وە دۆزیویانەتەوە کە پیتی ( ط ) لە ووتەی ( ولیتلطف ) لە سوورەی ( کهف )دا ناوەراستی قورئانە ، وە هێندێکیان بەرگو کیفەکەیان رازاندۆتەوە ، وە ئەوەی ئەمانەشی نەزانیبێ یا پارەی زۆری داوە بۆ نووسینەوەی قورئان ، وە یا بۆ لەچاپدانی ، وە یا بۆ لەبەرکردنی ، هەروەك بە هەزاران وەقف دانراوە بۆ خزمەتی قورئانو قورئانخوێن .

جگە لەوە کە قورئان بە هەموو زبانێك وەرگێرراوە ، وە هیچ نامەخانەیەك نەماوەتەوە لە جیهانا ــ بە هەر زمانێك بێ ــ کە ئەمرۆ وەرگێرراو « ترجمە »ی قورئانی تیا نەبێ بە زبانی خۆی مەگەر نامەخانەی کوردیی ...!!

بەڵی قورئان ئەوەتی هاتۆتە خوارەوە جیهانێکی خستۆتەگەرر ، وە دەرگای زانینو زانیاریی خستۆتە سەرپشت ، وە بەبۆنەی قورئانەوە هەزاران کتێب نوسرا ، وە نامەخانە « مکتبە »ی ئیسلام بەڵکو زۆر لە نامەخانەی بێگانانیش پرربوون لە نوسراوی نایابی بەکەڵکیوا کە ژیریی و بیر پەییان پێنابات ، وە مەردوم کە لەناو ئەو نامەخانانەدا ئەوێستێ ، بێبەروا سامی لێئەنیشێ ، وە سەری شەرمو شکۆوە دائەنەوێنێ بەرانبەر بەبەرزییو گەورەیی قورئان .

ئاشکرایە لە هەموو کەسێکەوە کە قورئان بناغـەی ئاینێکی جیهـانیی‌و شارستانێتی‌یەکی زۆر گەورەیە ، وە مایەی شۆرشێکی زیریی‌و بیرو زانین‌و زانیاری‌یە ، وە رێگای مێژووی ئادەمیی گۆرریوە •

سەرکەوتنی هەموو شۆرشێك بەستراوە بە ئەندازەی ئەو بیرو باوەررەی کە لە دەوروبەری ئەو شۆرشە پەیدا ئەبێ ، وە چاووراوی بۆ ئەکات ، لەبەرئەوە هەموو شۆرشێکی کۆمەڵایەتیی ئەبێ شۆرشێکی وێژەیی « أدبی » لەگەڵا بێ‌و پێشی‌کەوێ ، وە بـە هەموو هێزو تەوانایی خۆیـەوە چاووراوی بۆ بکات‌و خزمەتی بکات •

زۆرجار شۆرش بەرپا ئەبێ لەناو گەلێکا نەك لەبەر هۆیەکی نیشتمانیی ، بەڵکو لەبەر هۆیەکی خۆیی « شخصی » لەمحەلەدا مێژووشناسان بە چاوێکی قووڵ تەماشای ئەو شۆرشـە ، وە چاوەروانیی هیچی لێ ناکەن ، بەڵام ئـەو شۆرشانەی کە لەگەڵ بێداربوونەوەیەکی تێکراییدا بێ ، وە بیرو باوەررێکی گەرم‌و گورری لەگەڵا بێ ، ئـەوە شۆرشێکی زۆر گرنگـە ، وە شتی زۆر گرنگتری بەدوا دا دێ !!

// ئێمە ئەگەر بە چاوێکی وورد بوونەوە تەماشای کردموەکانی محمدعلی پاشای والی مصر بکەین ئەبینین کە ئەم هەڵکەوتووە زۆر خزمەتی مصری کرد ، وە شورشێکی تیا بەرپا کرد ، وە سەرکەوتنێکی عەسکریی وەرگرت بەرەنگێك کە دوژمنـەکانی لەترسانا خەویان لێ‌نەئەکەوت ، بـەڵام لەگـەڵ کابرا مرد شۆرشەکەش لەگەڵ ئەوا مرد ، بۆچی ؟ چونکە ئەو شۆرشـە لە دڵ‌و دەروونی کۆمەڵەو گەلەوە نەبوو ، وە وێژەرو خاوەن قەڵەمەکانی لەگـەڵا نەبوو ، وە زانایان‌و خوێندەواران‌و نووسەران‌و خاوەن بەهرەکان بەبیرو باوەرری خۆیان ئاویان نەئەداو خزمەتیان نەئەکرد تا ریشە داکوتێ // •

لەپێش ئەم شۆرشەدا بە دوو سێ ساڵ شۆرشی مافی ئادەمیی « حقوقی انسان » بوو لە فەررەنسە کـە هەرچی خوێندەواران‌و نووسەران‌و دواندەر

« خطیب »انو بوێژ « شاعر »انو زانایان بوو هەموو دوای کەوتن بــە زبانی تیژو ، قوررگی درێژو ، قەڵەمی رەوانو ، نووسینی جوانەوە ، وە تۆوی ئازادیی و سەربەستیی یان لەناو دڵو دەروونی کۆمەڵەو گەلا ناشت ، وە بە خوێنی گەشی لاوان ئاویاندا تا سەوز بوو •

هەروا بەم رەنگە شۆرشی لاتو کرێکارەکان لە رووسیا ، کــە دەوڵەتی رووس هەڵیگیرساند ، چۆن هەڵگیرساندنێك ؟ هەڵگیرساندنێکی وا کە هەرچەند بهاتایەتە کووژانەوە بە هەزاران بەرمیل نەوتو بەنزینی چاووراوی پیا ئەکرد ، تا لەجاران خۆشتر هەڵ ئەگیرسایەوە •

هەروا بەم رەنگە شۆرشیی پێغەمبەری ئیسلام حەزرەتی محمد « درووودی خوای لێ بێ » ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش کە بوو قورئانی لەگەلا بوو ، چۆن لەگەڵ بوونێك ؟ لەگەڵ بوونێکی وا کــە هەرچی گرێو کۆسپێك بهاتایەتە پێشــەوە خێرا لای ئەبرد ، وە هەر خراپەیەك بگیرایە وەرامی ئەدایەوە ، وە هــەر چاووراوێك بکرایــە لێی ئــەداو ئەی رروخاند ، وە هــەر ناپاکی یــەك بکرایە بەدزی یەوە خێرا پەردەی لەسەر لائەبردو ئاشکرای ئەکرد ، وە هەر قسەیەك بەشەو لە کونی ژوورەوە بکرایە بەیانی ئەی زرراندو دەری ئەخست ، وە هەر زەبوونی یەك رووی بکردایەتە یەکێك یا چەندکەسێك لــە مسڵمانەکان خێرا چارەی ئەکرد ، وە هەر پرسیارێك بکرایە وەرامی ئەدایەوە •

خولاسە قورئان بۆ شۆرشی ئیســلام رۆژنامــەی بوو ، گوڤاری بوو ، ئیستگەی بوو ، نووسەری بوو ، دواندەری بوو ، بوێژی بوو ، نامەخانەی بوو ، ئەتوانم بڵێم ئەوی قورئان کردوویەتی بۆ شۆرشی پێغەمبەری ئیسلام بە هەزاران وەزارەتی دعایــەو چاووړراو ، وە بە هــەزاران زبانی تیژو قوررگی درێژو قەڵەمی رەوانو نووسینی جوان نەئەکرا •

شۆرشی پێغەمبەری ئیسلام شۆرشی تاقەکەسێك نەبوو کــە لەگەڵ خۆی مرد شۆرشەکەشی بمرێ ، بەڵکو بە یارمەتیی قورئانەوە شۆرشی هەموو ئادەمیی

بوو ، چۆن شۆرشێك ؟ شۆرشێكیوا كە وەك تافگەكەی « زەلم »و « بێخاڵ »و « نیاگارا » هەڵئەقوڵا لە دڵی مسلمانانا ، ئەو دڵانەی كە بە رووناكیی بیروو برروا ئاوەدان بووبوونەوە ، ئەو مسلمانانەی كە هەموویەكێكیان وای‌ئەزانی كە ئەم ئایەتە بەتایبەتیی لەقورئانا هەر بۆ ئـەو هاتۆتە خوارەوە كـە ئەفەرموێ « قُلْ إنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لله رَبِّ العَالَمِينَ ، لا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ المُسْلِمِينَ »(١) انعام/١٦٢ •

بەڵێ پەیوەندیی مسلمانان لەگەڵ قورئانا هەزاران جار بەهێزتر بووە لـە پەیوەندیی دیموقراتی‌یەكان بـە نووسینەكانی « رۆسـۆ »(٢)و پەیوەنـدیی شیوعی‌یەكان بـە نووسینەكانی « ماركس »ەوە ، چونكە ئـەوان بەسەرو ماڵی خۆیان ، وە بۆ خوا وە لـەرێی خوادا جەنگیی‌وون ، وەك قورئان ئەفەرموێ «ألَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللهِ بِأمْوالِهِمْ وَأنْفُسِهِمْ أعْظَمُ دَرَجَةً عِنْدَ اللهِ »(٣) توبە ٤٠ •

جگە لەوە كە ئەو تینو تەووژمەی لـە قورئانەوە ئەباریی بەسـەر دڵو دەروونی مسـلمانانا وەك بارانی بەهار ، وە ئـەو فداكاری‌یەی كـە قورئان دای‌ئەدروێ بەسەر شانی پیاوانی خۆیا ، گەلێ بەرزترو گەورەترە لەوەی كە بێت بەراووردی بكەیت لەگەڵ نامەیەكی وێژەیی ئەم یا ئەوا •

هەر لەبەر ئەم تینو تەووژمی قورئانەیە لە دڵو دەروونی مسلمانانا كـە سیاسی‌یەكانی رۆژهەڵاتو رۆژئاوا لە زۆر كۆنەوە بـە هەموو هێزو تەوانایی خۆیانەوە ئەجەنگن لەگەڵ قورئانا چ بە چەك ، چ بە پارە ، چ بە فررووفێڵ ، وە

---

(١) واتە بڵێ : بەراستیی نوێژمو خواپەرستییمو ژیانمو مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهـانیانە ، وە بەمـە فەرمـانم پێدراوە ، وە من یەكـەمینی فەرمانبەرانم •

(٢) فەیلەسووفێكی فەرەنسی‌یە ، نووسەرێكی زۆر بەرزو وێژرێكی رەوان بووە ، شۆرشی فەرەنسە تینو تەووژمی نووسینەكانی ئەوە •

(٣) واتە ئەوانەی برروایان هێناو كۆچیان‌كرد ، وە بەسەرو ماڵی خۆیان جەنگیین لەرێی خوادا پایەو پلەیان گەورەترە لای خوا •

ئەیانەوێ ئەم چرایە بکوژێننەوە لە دڵو دەروونی مسڵمانانا ، تا بە تاریکیی بمێننەوە ، وە هەرچێکیان هەیە لێ‌یان‌بدزن .

نابینیت هەر دزێك کە بی‌یەوێ بە شەو ماڵێك ببرڕێ ، لەپێشەوە چراکانی ئەکووژێنێتەوە ، وە تەلی کارەباکەی ئەبرڕێ ، ئنجا بە ئارەزووی خۆی تالآنی ئەکاتو گەسکی لێ‌ئەدات .

ئەمە کردەوەی رۆژهەلآتیی‌و رۆژئاوایی‌یەکانە لە زۆر کۆنەوە ، کە دەستی دزیی‌و ناپاکی‌یان درێژ کردووە بۆ ناو مسڵمانان ، وە هەرچێکیان هەیە ئەیدزن‌و کێشەی لێ‌ئەکەن ، تەنانەت بۆ کتێبە دەستنووسەکانیشیان .

ئێستاش ئەو قسەیەی کە سەرەك وەزیری إنگلیز « گلاستۆن » کردوویەتی لە مجلسی عموم ، وە لە ئاخرو ئۆخری سەدەی ١٩هەما ـ دەنگ ئەداتەوە لـە گوێچکەی هەموو مسڵمانێکی مەردا ، کە بە هەموو بێ‌شەرمی‌یەکەوە ووتوویەتی: کۆسپی هەرە گەورەمان لە وولآتی ئیسلاما دوو شتە کە ئەبێ هەڵگیرێن بە هەر نرخێك ببێ ، یەکەم قورئان ، دووهەم کعبە .

بەڵێ ئیستعمار قورئانی ناوێ چونکە وەك شاخەکانی کوردوستان لەبـەر سێلآوی ئەوانا وێستاوە ، وە شـەوو رۆژی چەند جـار شرینقەی مەردیی‌و نەبەردیی ئەدات لـە مسڵمانان ، وە جڵەوگیری‌یان ئەکات لـە دۆستایـەتیی بێ‌برواویانو تێکەڵی‌یان ، وە ئەفەرموێ « يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا بِطَانَةً مِنْ دُونِكُمْ لا يَأْلُونَكُمْ خَبَالاً »[1] آل عمران/١١٨ .

وە ئەفەرموێ « يَا أَيُّها الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الأَمْرِ مِنْكُمْ »[2] نساء /٥٩ .

---

(١) واتە ئەی ئەوانەی کە برواتان هێناوە ، دۆستی گیـانیی مەگرن لەوانەی کە هاودین‌تان نین ( چونکە ) دریغ ناکەن لە تێکدانتان .

(٢) واتە ئەی ئەوکەسـانەی کە برواتان هێناوە فەرمانبـەریی خواو پێغەمبەرو فەرماندارانێ بکەن کە لە خۆتان بن .

وە ئەفەرموێ « فَمَنِ اعْتَدَى عليكم فَاعْتَدُوا عليه بِمِثْلِ ما اعْتَدى عَلَيكُم وَاتَّقُوا اللهَ »[١] بقره /١٩٤ ٠

وە ئەفەرموێ « وَقَاتِلُوا في سَبيلِ اللهِ الَّذينَ يُقاتِلُونكُمْ ، ولا تَعْتَدُوا »[٢] بقره /١٩٠ ٠

وە ئەفەرموێ « وَأعِدُّوا لهم ما اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِباطِ الخَيلِ تُرْهِبُونَ بهِ عَدُوَّ اللهِ وَعَدوَّكم ، وَآخَرينَ لا تَعْلَمُونَهُمُ اللهُ يَعْلَمُهُمْ »[٣] أنفال /٩٠ ٠

ئەم ئایەتانەو سەد ئەوەندەی‌تر لە ئایەتانی توندترو تیژتر دەست نادەن بۆ ئیستعمار ، ئەوی بۆ ئەوان دەست بدات ئایەتەکەی إنجیلە کە ئەڵێ « إذا ضَرَبَكَ عَلى خَدِكَ الأيمنِ فَأدِرْ لَهُ الأيْسَر »[٤] بۆیە هەموو دەوڵەتە إستعماری‌یەکان بە هەموو هێزو تەوانایی خۆیانەوە هەووڵ ئەدەن بۆ بلاوکردنەوەی إنجیل تا بەمجۆرە ئایەتانە شرینقە بدەن لە مسڵمانەکان ، وە رەگی مەردیی‌و نەبەردیی‌یان بمرێنن ٠

بەڵێ ئەم پێشکەوتنەی کە ئێستا هەیە لەناو رۆژئاوایی‌یەکانا لە ئاینەکەیانەوە نی‌یە ، هەروەك پاشکەوتنی مسڵمانان لە قورئانەکەیانەوە نی‌یە ، بەڵکو ئێمەو ئەوان پێچەوانەی یەك کەوتووین ، ئێمە لە سەرەتای ئیسلامی‌یەتەوە پێشکەوتن‌و بەرزبوونەوەمان لە سایەی ئاینەکەمانەوە بووە ، وە دواکەوتنی ئەمرۆمان بەهۆی لادانمانەوەیە لە ئاینەکەمان ٠

(١) واتە هەرکەسێك دەستدرێژیی بۆ کردن ئێوەش دەستدرێژیی بۆ بکەن بە وێنەی دەستدرێژی‌یەکەی ئەو بۆ ئێوە ، وە لە خوا بترسن ٠

(٢) واتە جەنگ بکەن لەرێی خوادا لەگەڵ ئەوانەی کە جەنگتان لەگەڵ ئەکەن ، وە دەستدرێژیی مەکەن ٠

(٣) واتە تا ئەتوانن خۆتان ئامادە بکەن لە ( مایەی ) هێزو تەوانایی ، وە لە هۆی سواریی ، تا بترسێنن دوژمنانی خواو خۆتان ، وە چەند دوژمنێکی‌تر کە ئێوە نایانزانن وە خوا ئەیانزانێ ٠

(٤) واتە ئەگەر زللەیەکیان مالی بە روومەتیی راستتا روومەتی چەپیشتی بۆ ببەرە پێشەوە ٠

بەڵام رۆژئاوایی‌یەکان نادانیی‌و دواکەوتنی جارانیان لە ئاینەکەیانەوە بووە ، وە پێشکەوتنی ئەمرۆیان لە لادانیانەوەیە لە ئاینەکەیان •

یاخۆ بڵێین ئێمەو ئەوان ئایەتەکانی قورئان‌و انجیل‌مان گۆڕیوەتەوە ، واتە ئەمرۆ ئێمە بەئایەتەکەی إنجیل‌و ئەوان بە ئایەتەکانی قورئان رەفتار ئەکەن •

بەراستیی ئەو هێرشەی کە بێگانەکانی رۆژهەڵات‌و رۆژئاوا کردیانە سەرمان دەستەیەکی دروست‌کردووە لەناومانا ، لە رۆڵەو جگەرگۆشەی مسڵمانان کە زۆر بێ‌ئاگان لە قورئان‌و لە ثقافتی قورئان ، نایەڵن تێ‌بگەن ، وە کردوشیانن بە داردەستی خۆیان‌و ئامانجیان ، هەروەك دەستەیەکی‌واشی دروست‌کردووە کە هەر برروایان بە خواو پێغەمبەرو قورئان نی‌یە •

## « خەت‌و نووسین لەپێش ئیسلاما »

سەدساڵ لەپێش ئیسلاما خەت‌و نووسین نەبووە لەناو عەرەبی حجازا ، وە لەبەر جەنگ‌و ئاژاوەی ناوخۆیان دەستیان نەپەرژاوەتە سەر فێربوونی نووسین‌و خەت ، بەڵام ئەوانەی کە دراوسێی فارس‌و رووم بوون لەکۆنەوە خەتیان بووە ، بەڵێ چەندکەسێك لە عەرەبی حجاز لەوانەی کە ئەچوون بۆ شام‌و عراق فێری خەتی « نبطی »و « عبری »و « سریانی » بوون ، وە وتاری عەرەبی‌یان بەوخەتانە ئەنووسیی ، لەپاشا لە خەتی « نبطی »یەوە خەتی « نسخ »و لە « سریانی »یەوە خەتی « کوفی »یان دەرهێنا ، وە یەکەمین کەسێك کە فێری خەتی کوفی بوو « بِشْر »ی کوڕری عبدالملکی کندی بوو کە لە مکە « صهباء »ی کچی حربی هێنا کە خوشکی أبوسفیان بوو ، وە چەند کەسێکی لە قورەیش فێری ئەم خەتە کرد •

کاتێك کە ئیسلام هات لە هەموو حجازا چەندکەسێك بوو کە خەتی کووفیی بێ ، وەك عمر ، عثمان ، علی ، أبوسفیان ، معاویە ، طلحەو چەندکەسیکی‌تر • وە ئەم خەتی کووفی‌یە مایەوە تا « ابن مقلە » لە سەدەی چوارەمی کۆچی‌دا

وەری گێزرایە سەر خەتی « ثلث »ی عەرەبی[١] ، وە لەوحەلەوە دەستووری ئیملای تازەیان دانا ، وە هەرچی نوسرابیو بنوسری بەو ئیملایە ئەنوسرێ ، قورئان نەبێ کە هەر بە ئیملا کۆنەکەی خۆی مایەوە کە نووسینو خوێندنەوەی لە گەلێ شتا لەیەك جیان •

## ئیملای عثمان بەشەش جۆر پێچەوانەی ئیملای عەرەبی یە

١ ـ لەئیملاو رەسمی عثمانا هێندێ پیت « حرف » نەنوسراوە کە بە ئیملای ئەمرۆ ئەبێ بنوسرێ ، وەك لەم شوێنانەدا :

أ ـ فرێدانی « ی » لە « تُعَلِّمَنِ ، رَبِّي أَكْرَمَنِ ، فَأَرْسِلُون » •

ب ـ فرێدانی لامێك لە « اليل ، الذي ، الذان ، الذين ، التي ، الئي » •

ج ـ فرێدانی ألف لە « بسم الله »و « لَتَّخذْتَ عَلَيْهِ أجْرا » •

الفی « وَسْئَل »و « فسْئَل » لە هەموو قورئانا فرێدراوە ، کەچی الفی « واسْتَغْفِرْهُ ، واسْتَغْنَى ، واسْتَغْشَوْا » نوسراوە •

لە چواردە وتەدا الفی دوای واو فرێدراوە ، وەك «القَوٰعِد ، وٰحِدَةً ، إخْوٰنكم ، أخَوٰتكم ، أزْوٰجُهُ ، لَوٰقِحْ ، ألْوٰنكُمْ ، أبوٰبا ، أموٰلَكم ، الصَّوٰعِق ، رَوٰسِيَ ، بِأكوٰبٍ ، بِأفْوٰهِهِمْ ، السَّمٰوٰتِ » کەچی الفی دوای واو فرێ نەدراوە لە « الواقعة ، توارت ، الجَوار ، الكَوافِر ، لَهِيَ الحَيَوٰان ، الكواكب ، أكواب ، الحواريون ، أبواب ، لواحة ، خُوار ، الثواب »دا •

الف فرێدراوە لەم وتانەدا « قالوا جَزٰؤُه ، وذٰلك جَزٰؤا ، و جَزٰؤا سَيِّئَة » لەكاتێکا کە ئەم ألفانە فرێ نەدراوون لە « جَزاؤُهم عِنْدَ ربهم ، جزاؤكم جزاءً مَوْفُورا ، لهم جَزاءُ الضِّعْفِ » •

(١) دائرة معارفی سەدەی بیستەم ل ٧٢١و ٧٢٢ •

الف فرێدراوە لەم‌ووتانەدا « لِبَیِّن ، لِعبین ، لِغیهْ ، لِقیهْ » کەچی لە « لاهِیَةً قُلوبُهم »دا فرێ نەدراوە •

ئەو ألفانەی کە همزەیان بەدوادا دێ بەزۆریی نوسراوون وەك « حدائق ، الأرائِك ، الخائِضِین ، خائِفا ، طائفة ، وابتغاؤکم ، هذا بصائر ، » کەچی لە « سُحُتِ ، کبُرَ الاثم ، الخبُث ، إسرائیل »دا نەنووسراون •

هەموو واوێکی جمع ألفی لەدواوە نوسراوە لەم چوار شوێنەدا نەبێ : « جاءُو ، فاءُو ، باءُو ، تبوؤ » کە الفەکانیان فرێدراوە •

٢ ـ هێندێ پیت ئەنوسرێن کە بە ئیملای ئەمڕۆ نابێ بنوسرێن وەك ئەمانە :ـ

أ ـ الف لە « لکنّا هو اللهُ رَبّي » و « أو لأأذبَحنَّهُ » و « وجایءَ یومئذٍ بجهنم » و « ولا تقولَنَّ لشایءٍ » و « ألا إنَّ ثمودا كفروا ربَّهُمْ » و « قواریرا » و « سلسلا » •

ب ـ واو لە « سأوریکم آیاتی » و « أولئك » و « هؤلاء » و « أولاء » و « أولوا » •

ج ـ یێ لە « والسماء بنیناها باییدٍ » و « باییکم المفتون » و « بلقاءی ربهم » و « أفاین مَاتَ » •

٣ ـ هێندێ پیت بە هێندێ پیتەوە ئەنوسرێن کە بە ئیملای ئەمڕۆ ئەبێ لە یەك جیا بکرێنەوە وەك ئەمانە :

أ ـ « وی » و « كأنَّ » لە « ویکأنَّ اللهَ »دا •

ب ـ « لکی » و « لا » لە « لکیلا تحزنوا »دا •

ج ـ « أنْ » و « لَنْ » لە « ألَّنْ نجمعَ عظامَه » و « ان » و « لو » لە « وألّو استقاموا »دا •

٤ ـ هێندێ پیت لە هێندێ پیت ئەبچڕێنرێ کە بە ئیملای ئەمڕۆ ئەبێ بەیەکەوە بنوسرێن وەك :

أ ـ لامی « لهذا » لە « مال هذا الكتاب »دا •

ب ـ « كل » لە « ما » لە « كل ما دخلت امة »دا •

ج ـ « مِن » لە « ما » لە « فَمِن ما ملكت »دا •

٥ ـ هێندێ پیت گۆڕراوە بە پیتێکی‌تر وەك :

أ ـ الفی « صَلاة » و « زكاة » و « حَياة » و « نَجاة » و « غَداة » و « مناة » و « مِشكاة » و « رِبا » کە بە واو ئەنوسرێن لە « الصلوٰة » و « الزكوٰة » و « الحيوٰة » و « النجوٰة » و « الغدوٰة » و « منوٰة » و « مشكوٰة» و « الربوٰ »دا •

ب ـ تێی گرد بە تێی درێژ نوسراوە لە چواردە شوێنا کە یەکێکیان « ان رحمت الله »یە •

ج ـ نوونی دوایی لە « لَيَكونَنْ » و « لَنَسْفَعَنْ »دا بە الف نوسراوە لە ئایەتی : « لَيَكوناً من الصَّاغِرين » و « لَنَسْفَعاً بِالنَّاصِيَةِ »دا •

د ـ یێ « أقصى » بە ألف نوسراوە لە « إلى المَسْجِدِ الأقْصَا »دا •

٦ ـ لە چل شوێن لە قورئانا همزە بە پێچەوانەی دەستووری تازەی خۆی نوسراوە وەك :

« أءِنَّا » أءِنَّكَ » کە ئەبوو بنوسرانایە « أئِنا » أئِنك » •

جگە لەمانە زۆر جار ووتەیەك لەلایەك باش نوسراوە کەچی لەلایەکی‌تر بەجۆرێکی‌تر نوسراوە وەك ئەمانە :

لدى أجل ( كتاب )[١]
وكذبوا بآياتنا ( كذابا )[٣]
فما من ( طغى )[٥]
لقد ( رأى ) من آيات ربه[٧]
إلا من بعد ما جاءتهم ( البينة )[٩]
إن الصفا والمروة من ( شعائر ) الله[١١]
وإن تعدوا ( نعمة ) الله لا تحصوها[١٣]
( سنة ) من قد أرسلنا قبلك[١٥]
إذ القلوب (لدى) الحناجر[١٧]
وامتازوا اليوم (أيها) المجرمون[١٩]
قال ( ابن أم ) إن القوم[٢١]

الم ذلك ( الكتب )[٢]
لا يسمعون فيها لغوا ولا (كذبا)[٤]
إنا لما ( طغا ) الماء[٦]
و ( رءا ) المجرمون النار[٨]
فهم على ( بينت ) منه[١٠]

والبدن جعلنا لكم من ( شعئر ) الله[١٢]
وإن تعدوا ( نعمت ) الله لا تحصوها[١٤]
فلن تجد ( لسنت ) الله تبديلا[١٦]
والفيا سيدها ( لدا ) الباب[١٨]
سنفرغ لكم (أيه) الثقلان[٢٠]
قال ( يبنؤم ) لا تأخذ بلحيتي[٢٢]

---

(١) الرعد ٣٨ ·
(٢) البقرة ٢ ·
(٣) النبأ ٢٨ ·
(٤) النبأ ٣٥
(٥) النازعات ٣٨ ·
(٦) الحاقة ١١ ·
(٧) النجم ١٨ ·
(٨) الكهف ٥٣ ·
(٩) البينة ٤ ·
(١٠) فاطر ٤٠ ·
(١١) البقرة ١٥٨ ·
(١٢) الحج ٣٦ ·
(١٣) النحل ١٨ ·
(١٤) ابراهيم ٣٤ ·
(١٥) الاسراء ٧٧ ·
(١٦) فاطر ٤٣ ·
(١٧) غافر ١٨ ·
(١٨) يوسف ٢٥ ·
(١٩) يس ٥٠ ·
(٢٠) الرحمن ٣١ ·
(٢١) الاعراف ١٥٠ ·
(٢٢) طه ٩٤ ·

وَنُقِرُّ في الأرحام ( ما نَشاء )[٢٣]

أوْ أنْ نَفْعَلَ من أموالنا ( ما نَشَـوٴا )[٢٤]

القرون الاولى (بَصائِرَ) للناس[٢٥]

هذا ( بَصُئِرُ ) للناس[٢٦]

أُنْظُرْ كَيفَ ضَرَبُوا لكَ ( الامثال )[٢٧]

وتلك ( الأَمْثلُ ) نَضْرِبُها للناس[٢٨]

(تبارَكَ) الذي إنْ شاءَ جَعَلَ[٢٩]

( تَبٰرَكَ ) الذي بِيَدِهِ الملك[٣٠]

قال له(صاحِبُهُ)وهو يُحاوِرُهُ[٣١]

إذ يقول ( لِصٰحِبه ) لا تحزن[٣٢]

وأصْحٰبُ ( الأيكة ) وقومُ تُبَّعٍ[٣٣]

كَذَّبَ أَصْحٰبُ ( لْئَيْكَةِ ) المرسلين[٣٤]

( كي لا ) يكونَ دُولَةً بينَ الاغنياء[٣٥]

( لكيلا ) تَأسَوْا على ما فاتكم[٣٦]

( أئذا ) متنا وكنا ترابا[٣٧]

( أءذا ) كنا ترابا[٣٨]

وأنا ظَنَنَّا (أنْ لَنْ) تقولَ الانس[٣٩]

أيحب الانسانُ ( ألَّنْ ) نجمع عظامه[٤٠]

واذا ( لاتَّخَذُوكَ ) خليلا[٤١]

لو شِئْتَ (لَتَّخَذْتَ) عليه أجرا[٤٢]

---

(٢٣) الحج ٥ .
(٢٤) هود ٨٧ .
(٢٥) القصص ٤٣ .
(٢٦) الجاثية ٢٠ .
(٢٧) الاسراء ٤٨ .
(٢٨) العنكبوت ٤٣ .
(٢٩) الفرقان ١٠ .
(٣٠) الملك ١ .
(٣١) الكهف ٣٧ .
(٣٢) التوبة ٤٠ .
(٣٣) ق ١٤ .
(٣٤) الشعراء ١٧٦ .
(٣٥) الحشر ٧ .
(٣٦) الحديد ٢٣ .
(٣٧) الواقعة ٤٧ .
(٣٨) الرعد ٥ .
(٣٩) الجن ٥ .
(٤٠) القيامة ٣ .
(٤١) الاسراء ٧٣ .
(٤٢) الكهف ٧٧ .

| | |
|---|---|
| وما ( دُعاءُ ) الكافرين إلا في ضلال[٤٣] | وما ( دُعؤا ) الكافرين إلا في ضلال[٤٤] |
| حتى إذا (استَيئَسَ) الرُسُلُ[٤٥] | ( وَلا تايئَسوا) من رَوحِ الله[٤٦] |
| وهو الذي ( أَحياكم )[٤٧] | وكنتم أمواتا ( فأحيٰكم )[٤٨] |
| ( لا يَستَأخِرون )[٤٩] | ( فلا يَستَئخِرُون )[٥٠] |
| ( يمحوا ) اللهُ ما يشاءُ[٥١] | ( ويَمحُ ) اللهُ الباطلَ[٥٢] |
| ( أءُلقي ) الذِكرُ عليه[٥٣] | ( أؤنبئكم ) بخيرٍ[٥٤] |
| واذ ( قال ) ربك للملائكة[٥٥] | ( قل ) ربِ احكم بالحق[٥٦] |
| ( وعَتَوْا ) عن أمر ربهم[٥٧] | ( وعتو ) عتوا كبيرا[٥٨] |
| والذين ( سَعَوْا ) في آياتنا[٥٩] | والذين ( سَعَوْ ) في آياتنا[٦٠] |
| ( ورأيتَ ) الناسَ يدخُلون[٦١] | ( أرءيتَ ) الذي يُكذّب[٦٢] |
| واذ قال ( إبراهيم )[٦٣] | واذابتلى ( ابراهيمَ ) ربُه[٦٤] |
| فلا تخشوهم (واخشوني)[٦٥] | فلا تخشوهم (واخشون)[٦٦] |
| فقال ( الضُعفاءُ )[٦٧] | فيقول ( الضُعفؤا ) للذين[٦٨] |

(٤٣) الرعد ١٤ .
(٤٤) غافر ٥٠
(٤٥) يوسف ١١٠ .
(٤٦) يوسف ٨٧ .
(٤٧) الحج ٦٦ .
(٤٨) البقرة ٢٨ .
(٤٩) اعراف ٣٤ .
(٥٠) يونس ٤٩ .
(٥١) رعد ٣٩ .
(٥٢) شورى ٢٤ .
(٥٣) قمر ٢٥ .
(٥٤) آل عمران ١٥ .
(٥٥) بقرة ٣٠ .
(٥٦) أنبياء ١١٢ .
(٥٧) أعراف ٧٧ .
(٥٨) فرقان ٢١ .
(٥٩) حج ٥١ .
(٦٠) سبأ ٥ .
(٦١) نصر ٢ .
(٦٢) ماعون ١ .
(٦٣) أنعام ٧٤ .
(٦٤) بقرة ١٢٤ .
(٦٥) بقرة ١٥٠ .
(٦٦) مائدة ٣ .
(٦٧) ابراهيم ٢١ .
(٦٨) غافر ٤٧ .

لەمەوە دەرئەکەوێ کـە ئیملای ئەورۆژە کـە قورئانی پێ نوسراوەتەوە بەتەواویی یەکی‌نەگرتووە ، وەك ئیمـلای ئەمرڕۆی ئیمە کـە هەرکەسێك بەجۆرێك ئەنووسێ ، وە تاقەیەك‌کەس ، لە یەك لاپەڕەدا ، ووتەیەك لە دوو لاوە بە دوو ئیملا ئەنووسێ ، کەواتە ئەم یەك‌نەگرتنی ئیملایە ١٤٠٠ سـاڵ لەمەپێش بە نەگ نازمێرڕێ ، وەك لە زمانی انگلیزیی‌دا کە زۆر پیت ئەنوسرێ‌و ناخوێنرێتەوە ، یا نانوسرێ‌و ئەخوێنرێتەوە ، جگە لەوە کە ئەمەش ئەگەیەنێ کە مسڵمانان لە هەموو رووی زەمینا ، لەرۆژێکەوە کە قورئان هاتۆتە خوارەوە تا ئەمرڕۆ دەستکاری‌یان نەکردووە ، وە بەهیچ‌رەنگێك بیریان لـە گۆڕرینی نەکردووە ، تەنانەت لە گۆڕرینی ئیملاکەشی •

من خۆم دەستووری زمانی کوردیی‌و نووسینیم داناوە ، کەچی هێشتا نووسینی خۆم بەتەواویی یەکی نەگرتووە ، وە ئەگونجێ لەم‌تەفسیرەدا ووتەیەکم لە دوولاوە بە دوو ئیملا نووسیی‌بێ ، چونکە هەر خوا هەڵە ناکات •

## ( بیروباوەرری زانایانی ئیسلام لە ئیملای عثمانا )

لە نووسینی قورئانا دوو بیروباوەرر هەیە :

یەکەم : بیروباوەرری امامی احمد کە ئەفەرموێ قورئان ئەبێ هەر بـە ئیملای کۆنی خۆی بنوسرێ ، وە نابێ لەو ئیملایە لابدرێ ، بۆچی ؟ چونکە ئەوحەلە قورئان هـەر بەدەست نوسراوەتەوە ، وە زۆر مەترسیی‌کراوە کـە هەریەکێك بە جۆرە ئیملایەك بی‌نووسێتەوە •

دووهەم : بیروباوەرری عزالدینی کورری عبدالسـلام‌و قاضی أبوبکرو « ابن خلدون » کە ئەفەرموون دروستە قورئان بە ئیمـلای ئەمرڕۆ بنوسرێ ، بەڵکو عزالدین ئەفەرموێ : ئەمرڕۆ دروست نی‌یە بەو ئیملا کۆنە بنوسرێ ، چونکە هەموو کەسێك ناتوانی بیخوێنێتەوە •

بەراستی ئیمـلای قورئان بووە بـە پلەیەکی زۆر سەخت لـە ناوەندی خوێندەوارانی ئەمرڕۆو قورئانا ، بەڵـکو لەریی هەمووکەسێکا کـە بەتایبەتیی قورئانی لە مامۆستا وەرنەگرتبێ ، لەبەرئەوە نووسینی قورئان بە ئیملای ئەمرڕۆ

ـ وەك زانای گەورەو بەبانگی ئیسلام عزالدین عبدالسلام ئەفەرموێ ـ پێویستێکی دینی‌یە ، وە دروست نی‌یە بە ئیملا کۆنەکە بنوسرێ ، چونکە سەر لە مەردوم ئێك ئەدات .

لە لایەکی تریشەوە جێی شانازی‌یە کە ئەمە ١٤٠٠ ساڵە قورئان بەو ئیملایە نوسراوەتەوە کە لە کاتی پێغەمبەرا پێی نوسراوە ، وە بەمە قورئان پارێزراوە لەوەی کە هەرکەسێك هەستێ‌و بە ئیملایەك بی‌نوسێتەوە ، بەڵام ئەمرۆ ـ کە ئیملای عەرەبی جێی خۆی گرتووە ، وە ئیتر گۆررینی بەسەرا نایەت ـ زۆر پێویستە کە قورئان بە ئیملای ئەمرۆ بنوسرێ‌و لەچاپ‌بدرێ لەژێر چاودێری لیژنەیەکی عالەمی‌دا لە زانایان‌و دڵسۆزانی ئیسلام ، بەڵام گەورەیی‌و پیرۆزیی قورئان کارێکی‌وای کردووە نە کەس نەوێرێ ئەو هەنگاوە بنێ ، وە نە کەس ئەتوانێ ئەو پررکێشی‌یە بکات ، هەرچەند ئەوەش خزمەتی قورئانە .

جا لەبەرئەوەی کە ئەمەش لە دەمێکەوە گرێیەکی زۆر گەورە بوو لە دڵما ، وە ئاواتم ئەوەبوو کە رۆژێك بێ قورئان بە ئیملایەکی تازە بنوسرێ‌و لەچاپ بدرێ ، وە ئەم کۆسپە لەرێی مسڵمانانا هەڵبگیرێ ، لە سەفەرەکەی قاهرەما ئەم باسەشم لەگەڵ شێخی جامع الازهر کردەوە ، وە پێم‌ووت : هەموو عالەمی ئیسلام چاوەروانی ئەوروژدیە کە مشیخەتی أزهر لەم‌رووەوە فتوایەك دەرکات ، وە هەرخۆی قورئان لەچاپ‌بدات‌و بڵاوی بکاتەوە بە هەموو جیهانا ، وە ئەم پلە سەختە هەڵگرێ لە ناوەندی قورئان‌و مسڵمانانا ، شێخیش فەرمووی : من وەختێك کە مفتی قەڵەمرەوی مصر بووم لەم‌رووەوە پرسیارم لێکراوە ، وە فتوام داوە کە دروستە قورئان بە ئیملای ئەمرۆ بنوسرێ بۆ ئەو منالانەی کە لە قوتابخانەدا قورئان ئەخوێنن ، منیش ووتم إمامی مالکیش ئەم فتوایەی داوە ، بەڵام ئەمە پلەیەکی زۆر سەختە بە نووسینی چەند دێررێك لەسەر کاغەز ئەمە هەڵناگیرێ ، وە کەس ئەم پررکێشی‌یە ناکات ، بەڵکو ئەبی مشیخەتی أزهر خۆی ئەم رچەیە بشکێنێ ، وە ئەم کۆسپە هەڵگرێ .

سەد هەزار رەحمەت لە جمـال الدینی قاسمییو سید قطبو شیخ احمد مصطفیی مەراغیی کە هەرسێکیان لـە تەفسیرەکەی خۆیانا قورئانەکەیان بـە ئیملای ئەمرۆ نووسیوە ، بەڵام ئەمانیش « بسم اللە الرحمن الرحیم »و « لا إله إلا اللە » و « هذا ، ذلك ، هأنتم ، هؤلاء ، ههنا ، أولئك ، أولاء ، أولو ، لكن ، اذاً ، طـه ، الذین »یان هـەر بە ئیملا کۆنەکـە نووسیوە ، هەروەك هەموو نووسەرێکیتریش ئەمانە هەروا ئەنووسن لـە نووسینی رۆژانـەی خۆیانا ، لەکاتێکا کە ئەبێ وا بنوسرێن « باسم اللاە الرحمان الرحیم ، لا إلاە الا اللاە ، هاذا ، ذالك ، ها أنتم ، هاألاء ، هاهنا ، ألائك ، ألو ، الاءِ ، لاكن ، إذنْ ، طاها ، اللذین » .

باشە ئەوا قورئان لەبەر پیرۆزیی کەس ناوێرێ دەست بداتە ئیملاکەی ، ئەی خوێندەوارانی ئەمرۆ ئیملای ئەمووتانە بۆ راستناکەنەوە لە نووسینی خۆیانا ، وە بۆچی بە ئیملای راست نایاننووسن ؟ جا وا ئێمەش لەم تەفسیرەمانا قورئانەکە وەك جمالالدینو سید قطبو شیخ أحمدی مەراغیی ئەنووسین .

## ( خەریبكبوونم بە نووسینەوە )

لە ساڵی ١٩٣٥ەوە دەستمکردووە بە نووسین ، وە تەفسیرێکی کورتم لە جزمی « عَمَّ » نووسییو لەچاپمدا ، وە خوێندەوارانی ئەورۆژە بە نۆبەرەیەکی تاسوقو پیرۆز وەریانگرت ، وە ئەوە بوو بە یەکەم هاندەرم لەسەر نووسین .

لە ساڵی ١٩٥٦دا چاوێکم بە تەفسیری جزمی « عم » ما خشاند بینیم زۆر پێویستە بە دەستلێدان ، وە لە ساڵی ١٩٥٧دا تەفسیرێکیتری رێكوپێکم لێکرد ، لەپاشا ویستم تەفسیری جزمی « تبارك »یش بنووسم ، وە لە سـاڵی ١٩٦٥دا ئەویشم نووسیی .

هەر لەوساڵەدا بڕیارمدا کە هەر لە سەرەتای قورئانەوە دەست بکەم بە تەفسیر لێکردنی تا هـەرچەندێکم بۆ نوسرا ، وە تەفسیری جزمی یەکـەمو دووهەمم نووسیی ، وە ناونرا « تەفسیری خاڵ » .

**سلیمانی : ٢١ی شعبانی ١٣٨٦ هـ** **محمدی خال**

**١٩٦٦/١٢/٥ م**

# سورة الفاتحة
## بسم الله الرحمان الرحيم

سوورەی ( فاتحە )یە

مکی‌یە ، ٧ ئایەتە

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوورەی ( فاتحە )یە

مکی‌یە ، ٧ ئایەتە ، ٢٥ ووتەیە ، ٢٢٠ پییتە

## بسم الله الرحمان الرحيم
## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە لە ( مکە ) ، وە لەپێش هەموو سوورەتەکانی‌ترەوەو هاتۆتە خوارەوە ، وە ناونراوە ( فاتحە ) ، واتە سەرەتا ، چونکە سەرەتای قورئانی گەورەیە ، وە ئاوێنەیەکی بالآنمایە بۆ هەموو قورئان ، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر « درووودی خوای لێبێ » ئەم سوورەتە لە هەموو سوورەتەکانی‌تر گەورەترو پیرۆزترە ، بۆیە خراوەتە ناونوێژەوە •

( بسم الله ) بەناوی خوا ، واتە ئەم سوورەتە ئەنێرمە خوارەوە بە ناوی خواوە ، نەك بە ناوی ئەوکەسەی کە ئەیخوێنێتەوە کە پێغەمبەرە •

هەر بەمڕەنگە هەرکەسێك « بسم الله » بکات لەکارێکا ، واتە ئەم‌کارە ئەکەم بەناوی خواوە کە یارمەتیم بدات بۆ تەواوکردنی ، واتە نە بەناوی خۆمەوە ئەیکەم ، وە نە بەناوی یەکێکی‌ترەوە ، چونکە هیچ‌کەسێك هیچی بەدەست نی‌یە تەنیا خوا نەبێ ، وە ئەگەر یارمەتی ئەو نەبێ هیچ‌کارێك ناچێتە سەر ، کەوابوو مەردوم هەمیشە پێویستە بە داواکردنی یارمەتی لەوخوایەی کە ( الرحمان الرحيم ) بەخشندەی میهرەبانە ، واتە بەهرە « نعمة »ی گەورەو

اَلْحَمدُ لِلّهِ رَبِّ الْعالَمِينَ (٢)

ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان (٢)

پچووك ئەبەخشێ لە هەردو جیهانا •

خوای گەورە لە سەرەتای قورئانی پیرۆزەوە « بسم الله »ی کرد بۆئەوەی نیشمانمان بدات تا ئێمەش کە دەستمان دایە هەر کارێکی باش « بسم الله »ی بۆ بکەین‌و ناوی خوای لێ‌بێنین •

« بسم الله » لە سەرەتای هەموو سوورەتێکەوە نوسراوە ، تا لە سوورەتەکەی پێشووی جیابکاتەوە •

( الحمد لله ) هەمووجورە سوپاس‌و ستایشێك بۆخوایە ، واتە سوپاسی هەرکەسێك بکرێ لەسەر هەرچاکەیەك ئەوە سوپاسە بۆخوا ، چونکە هەر خوایە کانگای هەموو چاکەیەك ، وە سەرچاوەی هەموو بەهرەو نازو خۆشی‌یەك ، هەر چاکەیەك کە بە مەردوم بگات‌و شایستەی سوپاس بێ ، لە هەرکەسێکەوە بێ ، ئەوە هەر لەخواوەیە ، وە سوپاسەکەی بۆ هەرکەسێك بێ ئەوە هەر بۆخوایە •

( رب العالمین ) ئەوخوایەی کە پەروەردگای هەموو جیهانیانە بەئادەمیی‌و گیان لەبەرو شینایی‌یەوە ، وە ئاگاداری‌یان ئەکات لە یەکەم پلەی بوونیانەوە تائەیانگەیەنێ بە پلەی هەرە بەرزی خۆیان •

مەردوم ئەگەر بە چاوێکی ووردبوونەوە تەماشای ئەم ئایەتە بکات تێ‌ئەگات کە دووشت ئەگەیەنێ ، یەکەم تاك‌و تەنیایی‌و پەروەردگاریی خوا بۆ هەموولایەك ، دووهەم یەکێتی ئادەمیی ، کە هەموولایەکیان یەك خێزانی گەورەن‌و هەڵیان‌داوە لەسەر زەویی ، هەروەك نیشان ئەدات کە ئەم سوورەتە سەرەتای

الرَّحْمانِ الرَّحيمِ (٣) مَالِكِ يَوْمِ الدِّين (٤) إيَّاكَ نَعْبُدُ

بەخشندەی میهرەبان (٣) خاوەنی رۆژی سزا (٤) ( خوایە ) هەر تۆ ئەپەرستین

نەمەیەکی عالەمی‌یە بۆئەوەی کە هەموو هۆزو تیرەو گەلێـك کۆبکاتەوە لەژێر بەیداخی یەك ئاینا ، وە جیاوازیی هەڵگرێ لەناویانا ، وە هەموویان بکات بـە برای یەك ، وە ئاشتی بخاتە ناویانەوە ، وە هەموو برروا بێنن بە یەك خواو بـە یەك پێغەمبـەر ، وە رووبکەنە یەك رووگـە « قبلە » ، وە بـە یەك زبان بڵێن « الحمد لله رب العالمین » •

( الرحمان الرحیم ) بەخشندەی میهرەبانە •

( مالك یوم الدین ) خاوەنی رۆژی تۆڵەو سزایە ـ کە رۆژی دوایی‌یە ـ واتە لەورۆژەدا کەس هیچی بەدەست نی‌یە تەنیا ئەو نەبێ •

( إیاك نعبد ) خوایە هەر تۆ ئەپەرستین ، وە بەندەیی هەر بۆ تۆ ئەکەین ، چونکە هەر تۆ دروست کردووین‌و هێناوتینە جیهانەوە ، وە هەر تۆ ژیانت داوینێ‌و چاوو گوێ‌و هۆش‌و گۆش‌و ژیریی‌و بیرو هەسـتو تێگەیشتنت پێ‌داوین ، وە ئاگاداریی‌مان ئەکـەیت‌و ئەمان پارێزیت لـە هەموو تەنگانـەو چەڵەمەیەکا ، وە رۆژیی « رزق »مان ئەدەیتێ‌و بەخێومان ئەکەیت ، وە لـە نەخۆشی ‐ چاکمان ئەکەیتـەوەو تەندروسـتی‌مان پێ‌ئەدەیت ، وە بۆ خۆشی‌و خۆشبەختی ئێمە ، ئەم‌جیهانەت دروست‌کردووە ، بە شەوو رۆژو سـاڵ‌و مانگی‌یەوە ، وە بە پاییزو زسـتان‌و هاوین‌و بەهاری‌یـەوە ، وە رۆژو مانگ‌و ئەستێرەو زەوییت بۆ خستووینەتە گـەرر ، بەدەوورمانا هـەڵئەسـووررێن‌و ئیشمان بۆ ئەکەن تا ئێمە بەخۆشیی‌و شادمانیی بژیین •

خوایە ! نازو‐نعمتی تۆ لە ژمارە نایەت ، کەوابوو چۆن ئەبێ برروات پێ‌نەهێنین‌و نەتپەرستین ، وە سەری بەندەگیت بۆ دانەنەوێنین‌و ناوچەوانت بۆ نەخەینە سەر خاك ، دارو بەردو ئاسمان‌و زەویی سجدەت بۆ ئەبەن ، ئێمە

وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥)

وە هەر لە تۆ داوای یارمەتیی ئەکەین (٥)

چۆن سجدەت بۆ نەبەین ؟ بوونەوەر « کون » سوپاسو ستایشت ئەکات ، ئێمە چۆن سوپاست نەکەین ؟!

خوایە ! سەگ بە سەگیی خۆیەوە کلکەلەقێو پاسەوانیی بۆ ئەوکەسە ئەکات کە پارچە نانێکی رەقی بداتێ ، وە خۆی ئەکات بە بالآگەردانی ، خوایە ! ئێمە چۆن سوپاست ناکەین !؟ وە سەری بەندەگییت بۆ دانانەوێنین ؟! بۆچ بەخششو میهرەبانیی‌یەکانی تۆ لە نانەرەقەی خاوەن سەگەکە کەمترە ؟!٠

وایاك نستعین ) وە هەر لە تۆ داوای یارمەتییو دەستگیرۆیی ئەکەین ٠

دەستدانە هەموو کارێكو جێبەجێ کردنی بەستراوە بە بوونی چەند هۆیەكو نەبوونی چەند بەرهەڵستێکەوە ، کە بەپێی دەستوورو باوی خوا لە جیهانا بوونی ئەو هۆیانەو نەبوونی ئەو بەرهەڵستانە مایەی سەرکەوتنو بەرگرتنی ئەو کارەیە ، ئنجا ئەو هۆو بەرهەڵستانە هێندێکیان لە تەوانای ئادەمییدانو هێندیکیان لە تەواناپانا نین ، بەڵکو هەر لە تەوانای خوادان ، لەبەرئەوە پێویستە لەسەرمان ــ کە لەگەڵ دەستمان دایە کارێك ــ بە هەموو هێزو تەوانایی خۆمانەوە دەستی بدەینێ ، وە چیمان لەدەست بێ درێغو کۆتاهیی تیا نەکەین ، وە داوای یارمەتیی تیا بکەین لەمولەو ، وە چیشمان لە دەست نەهات بیدەینە دەست خوا ، وە هەر داوای لەخوا بکەین ٠

خاوەن کشتوکاڵ ئەبێ زەوی‌یەکەی بکێڵێو وەردی بداتەوەو تۆوی پێوەبکاتو ئاگاداریی بکات ، ئنجا بۆ بارانو پاراستنی لە هەموو جۆرە دەردو بەلآیەکی ئاسمانییو زەمینی ئەبێ بیداتە دەستخوا ، چونکە ئەمانە لە دەست کەسا نین خوا نەبێ ، ئەگەر هاتو داوایان لە یەکێکیتر کرد ئەوە گومڕایی‌یە ٠

إهْدِنا الصِّراطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦)

رێنموونیمان بکە بۆ رێی راست (٦)

خوای گەورە لەمجیهانەدا بۆ هەمووشتێك جۆرە دەستوورو باوێکی داناوە کە هەرگیز ناگۆررێ ، وەك قورئان ئەفەرموێ « ولن تجد لسنة الله تبديلا » واتە باوی خوا ناگۆررێ • نەخۆشیی ، ساغیی ، دەوڵەمەندیی ، هەژاریی ، بازرگانیی، کشتیاریی ، پیشەسازیی ، جەنگ ، ئاشتیی ، هەریەکە جۆرە دەستوورو باوێکی تایبەتیی خۆی هەیە ، نابێ لێی لابدرێ ، کەوابوو ئومێدی چاکبوونەوەی نەخۆشی بە بێ دەرمانو پەزیشك ، یا دەوڵەمەند بوون بە بێ هەوڵو تەقەلادان لەرێی خۆیەوە ، کشتیاریی بەبێ بەراوورد کردنی دەستووری خۆی ، یادوژمن شکاندن بەبێ چەكو پیلانی جەنگ پێچەوانەی دەستوورو باوی خوایە ، هەرگیز نەبووەو نابێ ، یەکێك دوای ئەم جۆرە شتانە ئەکەوێ کە ئاگای لە باوی خواو دەستووری ئیسلام نەبێ •

( اهدنا الصراط المستقيم ) خوایە رێنموونیمان بکە بۆ رێی راست ، بەرەنگێکیوا کە هەڵە نەبین ، وە لە دەستوورو باوی خۆشییو خۆشبەختی لانەدەین •

خوا پێنج جۆرەی رێنموونیی « هداية » هەیە ، چواریانی بەخشیوە بە هەموو ئادەمییەك ، بەڵام پێنجەمەکەی هەر داوە بە پێغەمبەرانو پیاوچاکان •

یەکەم – رێنموونیی سروشتی « فطری » ، خوائەم رێنموونییەی داوە بە ئادەمیی لە رۆژێکەوە کە دێتە جیهانەوە ، نابینیت مناڵ کە لەگەڵ لەدایکی کەوتە خوارەوە ، هەرچەند برسیی بوو ، دەست ئەکات بە گریان ، کە لەگەڵ مەمکیان دایە خێرا دەستئەکات بە مژینی بەرەنگێکیوا کە پیاوی گەورە نازانێ بەوجۆرە بیمژێ ، ئەمەش بە بێئەوەی کە یەکێك پێیبڵێ ، یا فێری بکات •

دووهەم : رێنموونیی هەست « حس » ، وە ئەم رێنموونییە لەگەڵ رێنموونیی یەکەم لە ئادەمیشو لە گیانداریتریشا هەیە ، بەڵکو لە گیانداریترا

زۆرترە ، چونکە لەما بە چەند رۆژێك دوای لەدایكبوونی ئەگاتە پەرری ئەوپەرری ، بەڵام لە ئادەمییدا بەرەبەرە ، وە لە ماوەیەکی ئێجگار زۆردا ئەگاتە پلەی بەرزی خۆی ، تەماشا ئەکەیت لەدوای لەدایکبوون تا ماوەیەك نەگوێی ئەبیەتو نە چاوی ئەبینێ ، لەپاش حەفتەیەك ئنجا دووریو نزیکی لەیەك جیاناکاتەوە ، وە زۆرجار دەستدرێژ ئەکات بۆ گرتنی مانگ ، لەگەڵ ئەمەشا ئادەمیی تا مردنی ناوبەناو هەستی هەر لە هەڵەو ساتمەدایە ، وە شتی زۆر گەورەی دوور بە پچووکو داری راست لەئاوا بە خوار ئەبینێ •

سیهەم : رێنموونیی ژیریو بیر « عقلو فکر » کە گەلێ لە رێنموونیی هەستو سروشت بەرزترە • خوا ئادەمیی دروست کردووە بۆئەوەی کە بە کۆمەڵیی بژین ، وە رێنموونیی هەستو سروشتیی بەس نییە بۆ ئەم ژیانە بەکۆمەڵییەی ، بەڵکو پێویستە بە ژیرییەك کە ساتمەو هەڵەی بۆ راست بکاتەوە •

چوارەم : رێنموونیی ئایین ، کە ئەمە زۆر پێویستە بۆ ئادەمیی ، ئەو ئادەمییەی کە زۆرجار ژیریو بیریشی وەك هەستی بەهەڵەدا ئەچێ ، هەروەك زۆرجار مەردوم بەگوێی ژیریو بیرو هەستی خۆی ناکات ، وە بەهۆی هەوەسو ئارەزووەوە رێگای خوارو خێچ ئەگرێ ، وە لەرێی راست لائەدات ، بەڵکو ئەم هەموو رێنموونییانەش کە باسمان کرد بەکاریان دێنێ لەرێی خراپەو پاڵنان بە قازانجو سوودی مەردومو دەستدرێژیی بۆ سەرو ماڵو ناموسیان •

ئنجا لەلایەك ژیریو بیرو هەست بە هەڵەدا بچن ، یا هەواو هەوەس لایانبدات لەرێی راست ، ئیتر چۆن ئەگونجێ کە ئادەمیی بژیی بە خۆشییو برایەتیی ، وە بەبێجەنگو ئاژاوەو دووبەرەکیی ، وە بەبێ فرروفێڵو زۆرو ستەمو دەستدرێژیی ؟! لەبەرئەمانە ئادەمیی زۆر پێویستە بە رێنموونیی ئایین ، تا هەمیشە دەست گیرۆیی بکات بۆ رێی راست ، وە لەرێگای چەوتو چەوێل بیگێررێتەوە •

قورئان لە زۆر شوێن ئیشارە بۆ ئەم رێنموونییانە ئەکات ، وەك لە

صِراطَ الَّذینَ أنْعَمْتَ عَلَیهِمْ

ڕێی ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردوون ،

ئایەتی « وَهَدَیْناهُ النَّجْدَینِ » •

واتە ڕێی چاك‌و خراپمان نیشانی ئادەمیی دا بە سروشت‌و بە هەست‌و بە زیریی‌و بە ئایین •

وە ئایەتی « وَأمّا ثَمُودَ فَهَدَیْناهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَی عَلی الْهُدی »دا •

واتــە ڕێنموونیی گــەلی ثموودمان کرد بۆ ڕێی ڕاست ، بــەڵام ڕێ خراپەکەیان گرت •

پێنجەم : ڕێنموونیی‌یەکی‌ترە کــە لە چوارەکەی پێشوو تایبــەتی‌ترە ، چونکە ئەوان هەر بەمەعنا ڕێ‌نیشاندان بوون ، وە ڕاگرتنی ئادەمیی بوو لەسەر دووڕیانێکی‌وا کە یەکێکیان بی‌گــەیەنی بە مەبەس‌و ئەویتریان نەیگەیەنێ ، بەڵام ئەم ڕێنموونی‌یە بە مەعنا گرتنی ڕێ‌چاکەکەو گەیشتنە بــە مەبەس ، وەك قورئان ئیشارەت بۆ ئەم ڕێنموونی‌یە ئەکات بــە ئایەتی « أولئِكَ الَّذِینَ هَدَی اللهُ فَبِهُداهُمُ اقْتَدِهْ » •

واتە ئەوانەی کە باسکران لە پێغەمبەران‌و پیاوچاکان خوا خستنیە سەر ڕێی ڕاست ، وە لەســەر ئەو ڕێیــە مانەوە تا مردن ، ئنجــا ئێوەش چــاو ئەوان بکەن •

ئەم ڕێنموونی‌یە وەك چوارەکەی‌تر بە هەمووکەسێك نەدراوە بۆیــە خوا لێرەدا فەرمانمان پێ‌ئەدات کە پێنج فەرزە لە نوێژا لێی‌بپاڕێینەوە ، وە داوای ئەم ڕێنموونی‌یەی لێ‌بکەین ، وە بڵێین : خوایە بمانخەرە سەر ڕێی ڕاست کام ڕێ ؟! ( صراط الذین أنعمت علیهم ) ڕێی ئەوکەسانەی کــە

غَیرِ المَغْضُوبِ عَلَیهِمْ ، وَلا الضَّالِّینَ (٧)

نەك ( ڕێی ) ئەوانەی کە خەشمت لێگرتوون ، وە نەك ( ڕێی ) گومرایان (٧)

بەخششی خۆتت بەسەرا ڕشتوون لە پێغەمبەرانو پیاوچاکانی گەلانی ڕابوردوو ، وە کردووتن بە سەرمەشقی چاکیی و پاکیی و ڕەووشتو خووی بەرزو جوان •

واتە مێژووی گەلانی ڕابوردوو بخوێننەوە ، وە لە سەرگوزەشتو بەسەرهاتیان بگەن ، وە پەندو ئامۆژگاری‌یان لێوەرگرن ، وە وورد بنەوە لە مایەی زانینو نەزانین‌یانو هێزو زەبوونی‌یانو گەورەیی‌و بچوکی‌یانو دەوڵەمەندیی‌و هەژاری‌یانو پێشکەوتنو پاشکەوتن‌یانو ئاوەدانی‌و وێرانی‌یانو ژیانو مردنیان ، وە بزانن بەچی تووشیی ڕێ باشەکان بوون ئێوەش ئەو ڕێگایە بگرن ، وە بەچی تووشی ڕێ خراپەکان بوون ئێوە خۆتانی لێبپارێزن •

( غیر المغضوب علیهم ) نەك ڕێگای ئەوانەی کە خەشمی تۆیان لێگیراوە ، بەمڕەنگە ئایینی تۆیان پێ‌گەیشتووە کەچی هەر بە ئارەزوو لێی لائەدەن •

( ولا الضالین ) وە نەك ڕێگای گومراهانو سەرلێشێواوان •

ئەم دەستانەی کە خوا باسی‌کردن سیانن ، چونکە مەردوم یا ئاگادارە بە ڕێی ڕاست ، یا ئاگای لێ‌نی‌یە ، ئەوی کە ئاگای لێیە یا کار بە زانینەکەی خۆی ئەکات ، ئەوە دەستەی یەکەمە کە ئیشارەتی بۆ کرد بە « صراط الذین أنعمت علیهم » ، یا کاری پێ ناکات ، ئەوە دەستەی دووهەمە کە ئیشارەتی بۆ کرد بە « غیر المغضوب علیهم » ئەوی کە ئاگاشی لێ‌نی‌یە ، ئەوە دەستەی سیهەمە کە ئیشارەتی بۆ کرد بە « ولا الضالین » •

( آمین ) واتە خوایە ئەم پاڕانەوەو نزایەمان گیرا بکە •

ئەم ووتەیە لە سوورەی « فاتحە » نی‌یە ، بەڵام هەرچەند پێغەمبەر فاتحەی بخوێندایە ئامینی ئەکرد ، وە لە نوێژی ئاشکراشا نوێژکەرەکانی دوایەوە هەموو بەجارێك بەدەنگی بەرز لەگەڵ ئەوا ئامین‌یان ئەکرد •

# سوورەی ( بقره ) یە
## مدنی یە ، ٢٨٦ ئایەتە ، ٤١٢١ ووتەیە ، ٢٥٥٠٠ پیتە
## بسم الله الرحمان الرحیم
## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

خوای گەورە لە سەرەتای ٢٩ سوورەتەوە لە قورئانی پیرۆز پیتێك یا چەند پیتێك ناوئەبات ، کە ئەمپیتانە یا یەك پیتن وەك « ص • ق • ن » یا دوانن وەك « طه • یس • طس • حم • » یا سیانن وەك « الم • الر • طسم » یا چوارن وەك « المص • المر » یا پێنجن وەك « کهیعص • حم عسق » •

زانایانی ئیسلام زۆر قسەیان لەم پیتانە کردووە هەریەکە بەرەنگێك ، هێندێکیان ئەڵێن : ئەمپیتانە شفرەیەکن لە ناوەندی خواو پێغەمبەرا ، وە کلیلی ئەمشفرانە هەرلای پێغەمبەر بووە ، وە کەس نەیزانیوەو نایزانێ مەگەر یەکێك کە لە پێغەمبەری وەرگرتبێ •

امامی غەزالیی‌و شیخ محی‌الدینی عەرەبی‌و زۆر لە زانایانی‌تر ئەڵێن : ئەمپیتانە لەگەڵ ئەو مەبەسانەی کە تیایانایە ، بۆ بێدارکردنەوەی مەردومیشن ، چونکە هەرچەند پێغەمبەر سروش « وحی »ی بۆ بهاتایەو بیخوێندایەتەوە ، بێبرِرواکانی مکە واقیـان وورِئەما چ لەبابەت بـەرزیی‌و رەوانیی قورئان‌و چ لەبابەت ئاهەنگ‌و شێوەو چ لەبابەت مەبەس‌و ئامانجی‌یەوە ، ئنجا بۆ ئەوەی کە کاریان تێنەکات گەورەکانی قورەیش پێیانئەووتن : گوێی بۆ مەگرن ، وە لەوکاتەدا هەراهەراو دەنگەدەنگ بکەن تا کەس گوێی لێنەبێ ، وەك قورئان خۆی ئەمە ئەگێرێتەوە ئەفەرموێ « وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا : لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُم تَغْلِبُونَ »[1] • ئنجا لەبەرئەوەی کـە زۆرتر لەدوای ئەمپیتانەوە باسێکی زۆر گرنك دێ ، وە بۆئەوەی کـە گوێ‌و دڵی بێبرِرواکان راکێشێ بەلای خۆیا ، هات ئەم پیتانەی بەکارهێنا لە سەرەتای ئەم سوورەتانەوە ، کە ٢٧یان « مکین »و دوانیان « مدنین » کە یەکێك لەو دوانە ئەم سوورەتەیە کە ئەفەرموێ :

---

(١) واتە بێبرِرواکان ووتیان : گوێ لەم قورئانە مەگرن ، وە دەنگەدەنگی تیابکەن بەڵکو ئێوە زاڵ ببن ( بەسەریا ) •

# سورة البقرة

## بسم الله الرحمان الرحیم

الم ذٰلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ ،

---

## سوورەی ( بقره )یە

### مدنی‌یە ، ٢٨٦ ئایەتە

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەلف لام میم ، ئەم قورئانە هیچ گومانێکی تیا نی‌یە ،

---

( الم )

ئەم‌پیتانە یەکەیەکە ئەخوێنرێنەوە ، نەك بە لێکدراویی ، بەم‌رەنگە ئەڵێیت : ئەلف لام میم ، وە ئەمە یەکەم‌جارە لەجیهانا کە نامەیەکی وەك قورئان ئەم‌شێوەیە بەکاردێنێ .

بەراستیی ئەمە مەبەستێکی زۆر جوان‌و دڵچەسپە بۆ ئەم‌پیتانە ، چونکە ئەمرۆ دەستوورو باوێکی تێکراییی‌یە لە هەموو جیهانا هەرکەسێك بی‌یەوێ قسەیەکی زۆر گرنگ بکات لەناو کۆمەڵێکا ، وە چاوو دڵیان راکێشێ بەلای خۆیا ، لەپێشەوە قسەیەك ، یا شتێکی‌وا ئەکات کە هەموو گوێ‌گران ئاگادار بکاتەوەو رووی دڵیان بکاتە خۆی ، بەم‌رەنگە ئەڵێ : براکان ، یا گەورەکان ، یا گوێ‌گرەکان ، یا گوێ بگرن ، یا ئاگادار بنەوە ، یا دووسێ چەپڵە لێ‌ئەدات ، خولاسە تا ئەو قسەیەی لەپێشەوە ئەکرێ ، نەبیستراوتر بێ ، گوێ‌گران باشتر گوێی بۆ ئەگرن ، خۆ ئەگەر هەر مەبەستێکی تایبەتیی نەبێ وەك ووتنەی « هەلاو »ی سەر تەلەفۆن ئەوە باشترە .

ئەم سوورەتە درێژترین سوورەتە لە قورئانا ، وە لە هەموو سوورەتێك زیاتر باسی گرنگ‌و بەنرخی تیایە ، جاری پێشەکیی باسی قورئان ئەکات کە بەرزترین نامەی ئاسمانی‌یە ، وە هەرچی گومان بێ تیا نی‌یە ، ئەفەرموێ ( ذلك الكتاب ) ئەم‌نامەیە کە قورئانە ( لا ريب فيه ) هیچ جۆرە گومانێکی تیا نی‌یە ، کە نامەیەکی

خوایی‌یە ، ڕێنموونیی ئادەمیی ئەکات بۆ ڕێی ڕاست‌و خۆشبەختیی لە هەردوو جیهانا ، واتە هەرکەسێك لێی ووردبێتەوە بە دڵێکی پاك‌و خوێندەواری‌یەکی چاکەوە ، تێ ئەگات کە ئەم‌نامەیە سرووش « وحی » ێکی خوایی‌یە ، هاتۆتە خوارەوە بۆسەر دڵ‌و زبانی پێغەمبەر کە نەخوێندەوار بووە ، کە بەپێی دەستووری باوی خوا لە جیهانا ، هەرگیز نەبووەو نابێ کە نەخوێندەوار کتێبێکی‌وا دابنێ •

دەستووری باوی خوایە لە جیهانا هەر بیروباوەڕێکی تازە کە هاتە پێشەوە ، دەستەیەك دوای ئەکەوێ‌و ، دەستەیەك بەرانبەری ئەوێستن ، دەستەیەکیش بە سامناوەندیی ئەمێننەوە ، نەئەوێرن دوای کەوون نەئەشتوانن بەرانبەری بوێستن ، وە بەم‌ڕەنگە تا ماوەیەك دڵی هەردولا ڕائەگرن ، ئنجا کاتێك کە پێغەمبەر بەناچاریی کۆچی‌کرد بە خۆی‌و هاوڕێکانی‌یەوە بۆ « مدینە » ، زۆر لە مدینەیی‌یەکان مسڵمان بوون ، وە لەگەڵ مسڵمانەکانی مکەدا هێزێکی‌وا پێك‌هات کە شەرمی لێ‌بکرێ ، وە بەم‌بۆنەیەوە سێ دەستە کۆبوونەوە لە مدینە ، یەکەم موسڵمانەکان ، دوهەم بێ‌بڕواکان ، سێهەم ناپاك « منافق »ەکان ، کە ئەمەیان ناوچەی مدینە دروستی کردن ، چونکە زۆر لە پیاوە گەورەکانی مدینە کەس‌وکارو دەست‌و پێوەندیان مسڵمان بوبوون ، ناچار خۆشیان بۆئەوەی کە گەورەیی‌و ناوو نیشانیان لەدەست نەچێ هاتن بەدیمەن مسڵمان بوون ، کە یەکێك لەوان عبداللەی کوڕی « ابیّ » بوو کە لەپێش چوونی پێغەمبەر بۆ مدینە ، بە چەندڕۆژێك گەلەکەی نیازیان بوو بیکەن بە سەرۆکی خۆیان ، ئنجا بۆئەوەی کە پێغەمبەرو مسڵمانان ئەم سێ دەستەیە بناسن ، قورئان باسێکی هەرسێی دەستەکە ئەکات ، وە بە مسڵمانەکانیان ئەناسێ ، وە وەسفێکی دوورو درێژی دەستەی سێهەم ئەکات ، وە چەند وێنەیەکیان ئەگرێ‌و نیشانی ئەدات ، وە پەردەیان لەسەر لائەبات ، کە ئەمە بۆ هەموورۆژێك بەکەڵکە ، چونکە تا جیهان جیهان بێ ئەم سێ دەستەیە هەر هەن ، ئنجا هەر ڕۆژەی بەجۆرێك ، وە هەر چەرخەی بە ڕەنگێك ، وە ئەم چەند ئایەتە دەستوورێکی تێجگاریی

هُدىً لِلْمُتَّقِينَ (٢) الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ

ڕێنیشاندەری پارێزگارانە (٢) ئەوانەی کە بڕوا ئەهێنن بە شتی نادیار ،

دائەمەزرێنێ ، کە لە هەموو چەرخێکا تازە ئەبێتەوە ، وە لە هەموو ڕۆژێکا ، ڕێگای دوورو درێژی مسڵمانان ڕووناك ئەکاتەوە ، کە ئەمە گۆشەیەکی زۆر بچکۆلانەیە لە معجزەی قورئان •

ئنجا لە باسی دەستەی یەکەما ئەفەرموێ : ئەم قورئانە ( هدی للمتقین ) ڕێنیشاندەرە بۆ ئەوانەی کە لەخوا ئەترسن •

وشەی « تقوی » لە قورئانا بە مەعنا خۆپاراستنە لە سزای خوا لە هەردو جیهانا ، ئنجا خۆپاراستن لە سزای جیهان بەوە ئەبێ کە دەستوورو باوی جیهان بزانیت‌و پێچەوانەی نەکەیت ، خۆپاراستن لە سزای ڕۆژی دواییش بەوە ئەبێ کە بێفەرمانیی ئایین نەکەیت •

خۆلاسە خوا بۆ هەمووشتێك دەستوورو باوێکی داناوە کە نابێ لێی لابدرێ، ئنجا قورئان هەروەك کۆمەڵە دەستوورێکی ئایینی‌یە ، وە ئاگاداریی کردنی مایەی سەرفرازیی ڕۆژی دوایی‌یە ، کۆمەڵە دەستوورێکی جیهانیش نیشان ئەدات ، کە لێلادانیان مایەی زیانە ، کەوابوو قورئان ڕێنیشاندەری ئەوکەسانەیە کە لەترسی خوا نە پێچەوانەی فەرموودەو فەرمانی ، وە نە پێچەوانەی دەستوورو باوی ئەکەن •

ئنجا باسی هێندێك سفەتی ئەو پارێزگارانە ئەکات ئەفەرموێ ( الذین یؤمنون بالغیب ) ئەوانەی کە بڕوا ئەهێنن بە شتی نادیار ، واتە ئەوشتانەی کە بەر هەست ناکەوون ، وەك خواو فریشتەو ڕۆژی دوایی ، هەرکەسێك ئەم سیفەتەی تیا نەبێ بەهرە لە قورئان وەرناگرێ ، وە دوای ڕێنموونیی ئەو ناکەوێ ، بۆیە بەتایبەتی ئەم سیفەتەی پێش‌خست •

وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ

وە نوێژ ئەکەن

برروا بە خواو رۆژی دوایی ، یەکەم پلەیە بۆ جیابوونەوەی ئادەمیی لە گیاندارانی‌تر ، بۆیەلـەپێش هەموو سیفەتێکا پێیان ئەڵێ : « الـذین یومنون بالغیب » ، وە لەدوای ئەوە ئنجا پێیان ئەڵێ ( ویقیمون الصلاة ) وە نوێژی بەراستی ئەکەن لەکاتی خۆیا بەهۆش‌و گۆشەوە ، وە ئەزانن چی‌ئەکەن ، وە چی ئەڵێن ، وە چۆنی ئەکەن ، وە بۆچی ئەیکەن ، وە بۆ کێی ئەکەن •

ئەوەتی ئادەمیی هاتۆتە سەر زەویی هێشتا خواپەرستی‌یەك دانەنراوە وەك نوێژ ، کە گەورەیی خواو زەبوونیی بەندە نیشان بدات ، بەراستی هەرچێکی تیایە لە گوفتارو لە کردار ، یەك‌لـەیەك جوانترو بەمەعناترە ، لـە هەمووی جوانتر دابەستنەکەیەتی بە ووتەی « الله اکبر » ، وە دوایی هێنانێتی بە ووتەی « السلام علیکم » دابەستنەکەی ئەگەیەنێ کە خوا لە هەموو کەسێك گەورەترە ، وە بەندە ئەبێ هەر بەندەی ئەو بێ ، وە هەر لەو بترسێ ، وە لە ترسی ئەو لـە چوارچێوەی ئادەمێتی دەرنەچێ ، ووتەی چوونە دەرەوەکەشی ، ئەگەیەنێ کـە نوێژی بەراستی ئەبی ببێ بە مایەی برایەتیی‌و ئاشتێتی لەناو مسڵمانانا ، وە هەر کەڵکێکی ببێ هـــەر بۆ خۆیانە ، وە خوا هیچ جۆرە قازانجێـك ناکات لـە خواپەرستیی ئەوان •

نوێژ دانراوە بۆئەوەی کە خوا بیری مەردوم بخاتەوە ، وە چەند دەمێك لەیادی گەورەیی‌و دەســەڵاتی خوادا نوقومی بکات ، وە ترسی خوا لـە دڵو دەروونیا برروێنێ ، تا بەگیـان بەهرەی لێوەرگرێ ، وە تا نوێژی ئایـنـدە ، بێ‌بچرڕێتەوە لە گوفتـارو کرداری خراپ ، وەکو قورئان ئەفـەرموێ « إِنَّ الصَّلاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشاءِ وَالْمُنكر » عنکبوت/٤٥ •

واتە نوێژی بەراستی ، مەردوم ئەگێرڕێتەوە لە کاری خراپ‌و نابەسەند ، کەواتە هەر نوێژێك وانەبێ ئەوە نوێژی پێ‌ناڵێن ، بەڵکو کردەوەیەکی تایبەتی‌یە

وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ (٣)

رالەوەی کە کردوومانە بەرۆزی‌یان بەخت ئەکەن ( لەرێی خوادا ) (٣)

کە لە ماڵی‌یەوە خووی پێوە گیراوە ، بەراستی نوێژی زۆرکەس لە نوێژکەران لە کاتی ژێرییو بیریا جیاوازیی نی‌یە لەگەڵ ئەو نوێژەی کە بە ماڵیی لاسایی باوكو دایکی پێ‌کردۆتەوە ، واتە نوێژەکانیان گوفتارو کردارێکی بێ‌گیانە ، کە هەرگیز کار ناکاتە سەر هەستو رەووشتو خوویان ، باشترین چارە بۆ ئەم نەخۆشیی‌یە ، ئەوەیە کە نوێژکەر هەرچی ئەڵێ لە نوێژەکەیا ئاگای لە مەعناکەی بێ ، وە بەبێ‌مەعنا نەروا بەسەریا •

( ومما رزقناهم ینفقون ) وە لەوەی کە پێمان بەخشیی‌وون لە دارایی ، یا دەسەڵات ، یا زانینو زانیاریی هێندێکی لێ بەخت ئەکەن لەرێی چاکـە وە دەست‌گیرۆیی‌دا ، واتە بە هەموورەنگ ئەبێ یارمەتیی هەژارانو لێ‌قەوماوانو نەخوێندەواران بدەن ، بەم‌رەنگە ئەوانەی کە دارایی‌یان هـەیە ، بەدارایی ، ئەوانەی بەرێزو قسەرەوان ، بە قسە ، ئەوانەی زاناو خوێندەواری بەرزن بە نووسینو دووان ئەبێ خزمەت بکەن ، نەخوازەلا خزمەت لەپێناوی قازانجی تێکرایی‌دا •

بەراستی پارە بەخت‌کردن لـەرێی خوادا گەورەترین بەڵگـەو نیشانەیە لەسـەر بڕوا بـە خواو رۆژی دوایی ، وەلێ خواپەرستی‌یەك کـە پارەی تێ‌نەچێ وانی‌یە •

مەردوم ئەگەر بەچاوێکی ووردبوونەوە تەماشـای مێژووی ئادەمیی بکات تێ‌ئەگات کە سەرچاوەی هەموو ناکۆکی‌یەك ، دووقسەیە ، یەکەم : « کە خۆم تێربووم ئیتر باکم نی‌یە ئەگەر یەکێکی‌تر بمرێ لەبرسا » ، دووهەم : « تۆ کار بکە تا من بیخۆم ، وە تۆ ماندوو بە تا من بحەسێمەوە » • قسەی یەکەم وەك بوومەلەرزەیەکی بەتینو تەووژم ئادەمیی هێنایە لەرزە ، وە لەیەکی هەڵوەشاند • قسەی دووهەم وەك نەخۆشیی سەرەتان خوێنی لە جەستەی ئادەمیی‌دا نەهێشت ،

وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِنْ قَبْلِكَ ، وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ (٤) أُولَٰئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِنْ رَبِّهِمْ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٥)

وە ئەوانەی کە برروا ئەهێنن بەونامەیەی کە بۆ تۆ نێرراوە ، وە بەونامانەی کە پێش تۆ نێرراونەتە خوارەوە ، وە برروایان هەیە بە رۆژی دوایی (٤) ئەوانە لەسەر رێی راستن لەلایەن پەروەردگاریانەوە وە هەر ئەوانن رزگار (٥)

بەڵام ئایینی ئیسلام ریشەی هەردوو قسەکەی دەرهێنا لەبن ، یەکەمیان بە دانانی « زکاة »و دووهەمیان بە قەدەغە کردنی سوود •

بەراستی ، هەزار لەناو مسڵمانانی بەراستیدا وەك بزیی لەناو دڵو دەروونو گلێنەی چاوا ، وە لەناو نامسڵمانانا وەك بزیی لەژێر نینۆکو چنگو کەلبەدا وایە •

( والذين يؤمنون بما أنزل اليك ) ئەوانەی کە برروا ئەکەن بەو قورئانەی کە بۆ تۆ نێرراوە ( وما انزل من قبلك ) وە بەو نامە ئاسمانییانەی کە لەپێش تۆدا نێرراوون بۆ پێغەمبەرانیتر ، وەك تەوراتی مووساو ئنجیلی عیسا بێ ( وبالآخرة هم يوقنون ) وە ئەوان برروایان بە رۆژی دوایی هەیە ، وە لە بوونی ئەورۆژەدا بێگومانن •

کەسێك بەراستی برروای بە خواو رۆژی دوایی ببێ ، هەرگیز گوناهی گەورە ناکات ، وەك ستەمکردنو پیاوکوشتنو داوێنپیسیو گەواهییدانێ بەدرۆ ••• هەرکەسێك بێبەروا ، یەکێك لەم گوناهانە بکات برروکەی بایەخی پێ نییە •

( اولئك على هدى من ربهم ) ئەودەستەیەی کە خاوەنی ئەم رەووشتانەن لەسەررێی راستونیشانی دروستن لەلایەن پەروەردگاریانەوە ( واولئك هم المفلحون ) وە ئەوانن رزگار لە رۆژی دواییدا •

★ ★ ★

إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنْذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ (٦)

بەراستی ئەوانەی کە بێبڕروا بوون بۆ ئەوان چونیەکـە ئایا بیانترسێنیت یا نەیانترسێنیت ئەوان بڕروا ناهێنن (٦)

لەدوای باسی بڕرواداران ، بە خۆیانو سیفەتە بەرزەکانیانەوە ، ئنجا باسی دەستەی دووهەم ئەکات لەو بێبڕروایانەی کە لەبەر خراپی خۆیان دەرگای دڵو دەروونیان داخراوە ، وە پەردەی رەشی بەسەرا هاتووە ، بەرەنگێکیوا کە لە هیچ‌لایەکەوە رووناکیی وەرناگرێ ، ئەفەرموێ ( ان الذين كفروا ) ئەوانەی کە بێبڕروا بوون ، وە سەرچاوەی دڵو دەروونیان کوێر بۆتەوە ( سواء عليهم ) بۆئەوان چونیەکە ( أأنذرتهم أم لم تنـذرهم ) ئایا تۆ بیان ترسێنیت یا نەیان ترسێنیت ، واتـە هەزارجار سـەرزەنشـتیان بکەیت ، ئـەوان ( لا يؤمنون ) بڕرواناهێنن •

مەبەس لەم بێبڕروایانە ئەوانەن کە خوا زانیویتی کە پەردەی رەش بەسەر دڵو دەروونیانا هاتووە ، وە دەرگای ژیریی‌و بیریان داخراوە ، بەرەنگێکیوا کە ڕێی چوونەژوورەوەی بڕروا نەماوەتەوە •

ئەم بێبڕروایانە چەند جۆرێکن :ــ

١ ــ ئەوانەن کە ئایینی راستیان پێگەیشتووە ، وە ئەزانن کە راستە بەڵام هەر بە لاساریی بەدرۆی ئەخەنەوە ، وەك أبوجهل‌و أبولهب‌و أميەی کوری خلف‌و وليدی کوری مغيرەو گەلێك لە خوێندەوارانی جوولەکە لەکاتی پێغەمبەرا، کە ئەمانە هەموو مردن لەسەر بێبڕروایی ، کەواتە بەم‌ئایەتە قورئان پێشەکیی خەبەری‌دا لە شتێکی وونی نادیار ، کە ئەمە جۆرێکە لە معجزەی قورئان •

٢ ــ ئەوانەن کە نازانن ئایینی بەراستی کامەیە ، وە ناشیانەوێ بیزانن ، وە هــەر قسـەیەکیان لـەم‌رووەوە بۆ بکـرێ گوێی بۆ ناگرن‌و دڵی نادەنی تا تێبگەن •

خَتَمَ اللّهُ عَلى قُلُوبِهِمْ وَعَلى سَمْعِهِمْ ، وَعَلى أَبْصارِهِمْ غِشاوَةٌ ، وَلَهُمْ عَذابٌ عَظِيمٌ (٧)

خوا مۆری ناوە بەسەر دڵو گوێیانا ، وە پەردە بەسەر چاویانەوەیە ، وە سزای گەورەیان بۆ هەیە (٧)

ئەم دوو دەستەیە هەردوکیان وەك یەك سەرچاوەی چاوو دڵو گوێیان کوێر بۆتەوە ، وە هەرچی خۆیان هۆگرێ نەبووبن ، نە گوێی بۆ ئەگرنو نە دڵی ئەدەنێ ، وەکو ئەفەرموێ ( ختم الله علی قلوبهم وعلی سمعهم ) خوا مۆری ناوە بەسەر دڵو گوێیانا ( وعلی أبصارهم غشاوة ) وە پەردە بەسەر چاویانەوەیە، واتە ئەوەندە بێبروان بە هیچشتێك داناچڵەکێن ، هەروەك دەرگای دڵو گوێیان داخرابێو مۆرکرابێ ، وە پەردە بەسەر چاویانا هاتبێ وایە .

واتە ئەی پێغەمبەر ئەگەر مەردومیوا بێ برروای بە قورئان نەبێ ، ئەوە لەکەموکووڕیی قورئانەوە نییە ، بەڵکو لەوکەسە خۆیەوەیەتێ ، وەك یەکێك کە چاو بقوچێنێ لە رووناکیی تا نەیبینێ ، لەمکاتەدا رووناکیی چ کەڵکێك ئەدات بەوکەسە ، یا ئەو رووناکییە چ نەنگێکی بێ ئەگەر ئەوکەسە چاو نەکاتەوە شت ببینێ ؟

( ولهم عذاب عظیم ) وە بۆ ئەوانە هەیە سزای زۆر گەورە ، چونکە ژیریی‌و بیری خۆیان بەکارناهێنن ، وە خۆیان ماندوو ناکەن بە گەڕران بەشوێن رێی راستا ،وە پەیرەویی فرستادەی خواو رابەرانی ئاین ناکەن ، بەڵکو لەسەر ئەو رێگا چەوتو چەوێڵەی کە لەسەری بوون هەر ئەمێننەوە .

★ ★ ★

لەدوای باسی دەستەی یەکەمو دووهەم کە برروادارو بێبرروان ئنجا باسی دەستەی سێهەم ئەکات کە ناپاکانن ، واتە بەدیمەن مسڵمانو لەدڵا بێبرروان ، وە گەلێ خراپترن لەوانەی کە بە دڵو بە دیمەن بێبرروان ،

وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقولُ : آمَنَّا بِاللهِ وبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُمْ بِمؤْمِنِينَ (٨) يُخادِعُونَ اللهَ والَّذِينَ امَنُوا ، وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاّ أَنفُسَهُمْ

---

هی‌وا هەیە لە مەردوم کە ئەڵێ : برروامان هێناوە بە خواو بەرۆژی دوایی ، کەچی ئەوان برروادار نین (٨) ( بەلای خۆیانەوە ) فریوی خواو ئەوکەسانە ئەدەن کە برروایان هێناوە ، وەلێ کەس فریو نادەن خۆیان نەبێ

---

چونکە ئەمان دوژمنن لە پەردەی دۆستا ، وە تێکەڵی ناوجەرگەی مسڵمانانن ، ئەمانە لە « مدینە » زۆر ئازاری پێغەمبەرو مسڵمانانیان دا ، بۆیە قورئان زۆر بێ‌پەردە باسیان ئەکات ، وە بە پێغەمبەرو مسڵمانانیان ئەناسێ •

لەبەرئەوەی لە هەموو کاتێکا جیهان پررە لەم ناپاکانە بۆیە خوا بەجۆرێکی تێکرراییی هات بەتانیانا ، فەرمووی ( ومن الناس من يقول ) هی‌وا هەیە لـە مەردوم ئەڵێ : ( آمنا بالله وباليوم الآخر ) برروامان هێناوە بە خواو بە رۆژی دوایی ، کەچی درۆئەکەن ، وەکو ئەفەرموێ ( وما هم بمؤمنين ) ئەوان برروادار نین ، ئەگینـا ئەوەندە ناپاکو دووررروو نەئەبوون ، وە جارێك لـە خراپـە ئەگەرانەوە ، بەڵام ئەوان هەر خراپەیەکیان لەدەست‌بێ بەدزی‌یەوە ئەیکەن ، ئەگەر جارێکیش بەئاشکرا نوێژو خواپەرستی‌یەك ، یا چاکەو دەست‌گیرۆیی‌یەك بکەن ، ئەوە هەر بۆ چاوە « رياء »ی مەردومە ، وە بۆ فریودانی خواو پێغەمبەرو مسـڵمانانە ، وەکو ئەفەرموێ ( يخادعون الله والـذين آمنوا ) ئەو ناپاکانـە فێڵ‌ئەکەن لەگەڵ خواو مسڵمانانا بە گوفتارو کرداری باش ، واتە وائەزانن کە خواو پێغەمبەر ئاگایان لە دڵی پیس‌و کرداری ناپەسەندیان نی‌یە ، وە نازانن کە خوا یەك‌بەیەك پێغەمبەر ئاگادار ئەکات بـە هەموو نهێنی‌یەکیان ، کەوابوو هەر فررووفێڵێك بکەن ــ چونکە پێی‌ئەزانرێ ــ وەك لەگەڵ خۆیانی بکەن وایە ، بۆیە ئەفەرموێ ( وما يخدعون الا أنفسهم ) ئەوان هەر فررووفێڵێك بکەن هەر لەگەڵ خۆیانایە ، چونکە هەر زیانێکی بێ هەر بۆخۆیانە •

مەردوم ئەگەر باش ووردبێتەوە لەخۆی تێ‌ئەگات هەرچەند بێتەسـەر

وَمَا يَشْعُرُونَ (٩) فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ ،

و هەستی پێ ناکەن (٩) لەدڵیانا نەخۆشیی ( حەسەدو ناپاکیی ) هەیە ،

کردنی کارێکی خراپ دووشت لەدڵیا راست ئەبێتەوە ، یەکێکیان هانە هانەی ئەدات لەسەر کردنی کارەکە ، ئەویتریان جڵەوگیریی لێ ئەکات ، خۆشی بەدڵ ئەزانێ ، چاکەکە کامەیەو خراپەکە کامەیە ، بەڵام کە ئارەزووی خراپەکەی بوو خۆی خۆی فریو ئەدات ، وە رێ بۆ خۆی پاك ئەکاتەوە ، هەموو کەسێك بۆ هەموو خراپەیەك ، محاکمەیەکیوا لەدڵیا رووئەدات ، لەپێشەوە دەمقاڵیی ، ئنجا خۆتەفرەدان ، ئنجا برریاردان ، ئەم محاکمەیە زۆرجار لە یەك هەناسەدا تەواو ئەبێ ، بەڵکو زۆرجار مەردوم خۆی ئاگای لەخۆی نیی‌یە کە لەدەروونیا ئەم دەمقاڵیی‌یە بووەو برریاری تیادراوە ، بۆیە فەرمووی ( وما یشعرون ) ئەوناپاکانە هەستی پێ‌ناکەن کە چ فێڵێك لەگەڵ خۆیان ئەکەن ، وە چ زیانێك بەخۆیان ئەگەیەنن بەهۆی ئەو بێبرروایی‌یەی کە لەدڵیانا ئەیشارنەوە ، وە ئەوناپاکی‌یەی کە ئاشکرای ئەکەن •

ئەگەر ئەو ناپاکانەی کە وەختی خۆی ئەم ئایەتانەیان دەربارە هاتۆتە خوارەوە ـ مردبن ، قورئان زیندووەو نامرێ ، وە فەرمانی پایەدارە بەسەر مەردوما تارۆژی دوایی ، کەوابوو بەم‌پێ‌یە هەر برروادارێك بەخواو رۆژی دوایی ، دوای ئارەزووی بێ‌شەرعیی بکەوێ ، وە لە فەرمووەدەو فەرمانی خوا دەربچێ ، برواگەی بایەخی پێ‌نیی‌یە ، وە ئەوکەسە ، فێڵ‌ئەکات لەخۆی ، وە ئەیەوێ فێڵیش بکات لەگەڵ خوادا •

ئنجا ئەگەر یەکێك لێرەدا بڵێ : ئەوە بۆچی ئەم‌ناپاکانە ئەم فرروفێڵە ئەکەن ؟ وەرام ئەداتەوە ، ئەفەرموێ ( في قلوبهم مرض ) چونکە لەدڵیانا نەخۆشیی حەسەدو ناپاکیی هەیە ، وە ئەو نەخۆشیی‌یە لایان‌ئەدات لەرێ راست ، وە ئەیان‌گێررێ بەرەنگێك کە شایستە بن بۆئەوەی خوا نەخۆشیی‌یەکەیان

فَزَادَهُمُ اللهُ مَرَضاً ، وَلَهُمْ عَذابٌ أَلِيمٌ بِما كانُوا يَكْذِبُونَ (١٠)
وَإِذا قِيلَ لَهُمْ : لا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ ، قَالُوا : إِنَّما نَحْنُ
مُصْلِحُونَ (١١) أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ ، وَلكِنْ لا يَشْعُرُونَ (١٢)

---

خواش نەخۆشییەکەی زۆرتر کردن ( بە ناردنی قورئان ) ، وە سزای سەختیان بۆ هەیە بەهۆی ئەو درۆیانەی کە ئەیانکرد (و ئەیانووت برروامان هەیە) (١٠) کاتێك پێیان بووترایە : ئاشووب مەنێنەوە لە وولاتا ، ئەیانووت : ئێمە هەر ، رێکخەر « مصلح »ین (١١) بزانن کە هەر ئەوانن ئاشووبگێرر ، بەڵام هەستی پێناکەن (١٢)

---

زیاتر ، وە دەردەکەیان قورستر بکات ، وەکو ئەفەرموێ ( فزادهم الله مرضا ) خواش نەخۆشییەکەی زۆرتر کردن ، چونکە رۆژبەرۆژ پێغەمبەرو مسڵمانەکان بەهێزتر ئەبوونو بەرزتر ئەبوونەوە ، وە ناپاکەکان دەردیان گرانتر ئەبوو ، وە کوێراییان زیاتر دائەهات ( ولهم عذاب الیم ) وە سزای سەختیان بۆ هەیە ( بما کانوا یکذبون ) بەهۆی ئەو درۆیانەی کە ئەیانکردو ئەیانووت : برروامان هەیە بە خواو رۆژی دوایی ، کەچی لەدڵیشا بێبرروابوون •

ئەم ناپاکانە وەك جاسووس وابوون بەسەر مسڵمانەکانەوە ، هەر دەنگو باسێکی نهێنییان ببوایە خێرا بڵاویانئەکردەوە ، وە هەمیشە چاووراوی خراپیان لێئەکردنو دڵی مەردومیان لێ سارد ئەکردنەوە ، وە بە هەمووجۆرێك خەریکی گێرەشێوێنیو ئاشووبگێرران بوون لەناویانا ، ئنجا خوا لە باسی کردەوەی ناشرینیانا ئەفەرموێ ( واذا قیل لهم ) کاتێك پێیان بووترایە ( لا تفسدوا في الارض ) ئاژاوە مەگێررنو خراپە مەکەن لەناو وولاتا ( قالوا ) ئەیانووت : ( إنما نحن مصلحون ) ئێمە هەر ، رێكخەر « مصلح »ین ، چونکە لەسەر بیروباوەرری باوو باپیری خۆمانین ، وە پەیررەویی زاناو پێشەوای خۆمان ئەکەین ، وە دوای قسەی ئێوە ناکەوین ، ئنجا خوا بەدرۆیان ئەخاتەوە ، ئەفەرموێ ( الا انهم هم المفسدون ) بزانن کە هەر ئەوانن خراپو ئاژاوەگێرر ، نەك مسڵمانەکان ( ولکن لا یشعرون ) بەڵام هەستی پێناکەن ، چونکە بەلایانەوە

وإذا قيلَ لَهُمْ : آمِنُوا كَمَا آمَنَ النَّاسُ ، قَالوا : أَنُؤمِنُ كَما آمَنَ السُّفَهاءُ ؟ ألا إنَّهُمْ هُمُ السُّفَهاءُ ،

---

کاتێك پێیان بووترایه : برروا بێنن وەك ئەو مەردومانەی کە برروایان هێناوە ، ئەیان ووت : ئێمە چۆن برروا بێنین وەك ئەو نەفامانەی کە برروایان هێناوە ؟ ، بزانن کە هەر خۆیان نەفامن ،

---

وایە ئەو رێیەی کە گرتویانە رێیەکی راستو باشە ، وە نازانن کە لایانداوە لەرێی راستی پێغەمبەرانو پێشینانی خۆیان ، وە نازانن ئەوانەی کە ئێستا بە زاناو پێشەوایان دائەنێن ، هەموو دەستبررو ناپاکن لەگەڵیانا ، وە ئەوان لەمانگومرراترن •

لەدوای باسی کردەوەی خراپی ناپاکان ، ئنجا باسی بیروباوەرری ناشیرینیان ئەکات ، ئەفەرموێ ( واذا قيل لهم ) کاتێك پێیانبووترایە ( آمنوا كما آمن الناس ) برروا بێنن وەك ئەو مەردومانەی کە برروایان هێناوە ، وەك عبداللەی کورری سەلام کە یەکێکە لە زاناو پێشەوای خۆیان ( قالوا ) لەناوخۆیانا ئەیانووت : ( أنؤمن كما آمن السفهاء ) چۆن ئێمە برروا بێنین وەك ئەو نەفامانەی کە برروایان هێناوە ؟ تەماشا ناکەیت هێندێکیان لە مکەوە دوای محمد کەوتوونو هاتوون بۆ مدینە ، وە دەستیان هەڵگرتووە لە کەسوکارو داراییو وولاتیان ، وە هێندێکیشیانلە مدینە مسڵمان بوون ، وە مکەیییەکانیان کردووە بە هاوبەشی خۆیان لە زیندەماڵو مردەماڵا ، ئەڵێیت برای باوكو دایکییانن • واتە ئێمە بروا ناهێنین ، ئنجا خوا ئەفەرموێ ( الا انهم هم السفهاء ) بزانن کە هەر ئەوان نەفامن نەك مسڵمانەکان ، چونکە ئەوان تائێستا زۆر پێغەمبەریان بۆهاتووە ، وە لەرێی هەموویان لایانداوە ، وە هیچ دەستمایەیەکیان بەدەستەوە نەماوە بۆ رزگاربوونی رۆژیی دواییان تەنیا هیوای هیچوپووچ نەبێ ، بەڵام مسڵمانەکان ـ کە جاران بتپەرست بوون ، وە سەر بەهیچ پێغەمبەرێك نەبوون ـ ئێستا وا برروایان هێناوە بە پێغەمبەری ئیسلامو هەموو پێغەمبەرانیتر وە بە قورئانو هەموو نامەی ئاسمانیی ، دیارە یەکێك کە برروای بە هەموو پێغەمبەرانو نامەی

وَلَكِنْ لَا يَعْلَمُونَ (١٣) وإذَا لَقُوا الّذِينَ آمَنُوا قَالُوا : آمَنَّا ، وإذَا خَلَوْا إلى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا : إنّا مَعَكُمْ ، إنّما نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ (١٤) اللهُ يَسْتَهْزِىءُ بِهِمْ ،

---

بەڵام نازانن (١٣) کاتێك بگەیشتنایە بەوانەی کە برروایان هێناوە ئەیانووت : ئێمەش برروامان هێناوە ، کە بەتەنیاش بوونایە لەگەڵ گەورە فێڵبازەکانیان ئەیانووت : ئێمە لەگەڵ ئێوەین ، ئێمە هەر گاڵتەکەرین ( بەوان ) (١٤) خوا گاڵتە بەوان ئەکات ،

---

ئاسمانیی بێ باشترە لەوانەی کە برروایان نەبێ ، یا هەر بە قسە برروای بێ بە تاقە یەك پێغەمبەر کە بە فەرموودەو فەرمانیشی نەکات •

( ولكن لا يعلمون ) بەڵام ئەوان نازانن کە بررروا چیە تا بزانن خۆیان نەفامن ، یا مسڵمانەکان !

هەروا بەورەنگە باسی سیفەتێکی‌تری ناپاکان ئەکات ئەفەرموێ ( واذ لقوا الذين آمنوا ) کاتێك کە بگەیشتنایە بەوانەی کەبرروایان هێنابوو ( قالوا : آمنا ) بەدرۆ ئەیانووت : ئێمەش وەك ئێوە بروامان هێناوەو مسڵمانین ( واذا خلوا الى شياطينهم ) کە بەتەنیاش کۆببوونایەتەوە لەگەڵ پێشەواو گەورەکانی خۆیانا ، کە وەك شەیتان دەرسیان دائەدانو دەستکاریی بیروباوەرریان ئەکردن ( قالوا : انا معكم ) پێیانئەووتن ئێمە لەسەر بیروباوەرری ئێوەین ( إنما نحن مستهزئون ) ئێمە هەر گاڵتە بە مسڵمانەکان ئەکەین ، وە ئەمانەوێ قسەیان لێبدزینو خۆمانیان لێبپارێزین •

ئنجا خوا هەررەشەیان لێئەکات ، ئەفەرموێ ( الله يستهزىء بهم ) خوا گاڵتە بەوان ئەکات کە بەپێی دەستوورو باوی جیهان چەند رۆژێك مەیدانیان ئەدات ، وە چەند ئاواتێکی هیچوپووچیان بۆ ئەهێنێتەدیی ، لەپاشا لەپرر ئەیانرووخێنێ ، وە بەدناویی جیهانو سزای پاشەرۆژیان بۆ ئەمێنێتەوە ، وەکو

وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ (١٥) أُولَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ بِالْهُدَى فَمَا رَبِحَتْ تِجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ (١٦)

وە ( چەند رۆژێك ) ماوەیان ئەدات تا لە سەرکێشیی خۆیانا سەرکوێر ئەبن (١٥) ئەمانە ئەوانەن کە گومڕاییی‌یان کڕیی بە ڕێنموونیی ! وە بازرگانیی‌یەکەیان قازانجی نەکرد ، وە ڕێی باشیان نەگرت (١٦)

ئەفەرموێ ( ویمدهم في طغيانهم يعمهون ) ماوەیەك ئەیان‌هێڵێتەوە تا لە سەرکێشیی‌و یاخی‌بوونی خۆیانا سەرکوێر ئەبن ٠

( اولئك الذين اشتروا الضلالة بالهدى ) ئەوناپاکانە کەسانێکن کە گومڕاییی‌و سەرلێشیوانیان کڕیی بە ڕێنمونیی ، وە ڕووناکیی‌یان گۆڕریی‌یەوە بە تاریکیی ، واتە پشتیان کردە ڕێنموونیی خوا ، وە لەسەر گومڕاییی خۆیان مانەوە ( فما ربحت تجارتهم ) بازرگانیی‌یەکەیان قازانجی نەکرد ( وما کانوا مهتدين ) وە ڕێی باشیان نەگرت ، چونکە سەرمایەکەیان ــ کە سروشتی پاك‌و ژیریی‌و بیر بوو ــ لەدەست دا ٠

★ ★ ★

تائێستا باسی دەستەی مسڵمانان‌و بێ‌بڕروایان‌و ناپاکانی کرد ، دەستەی یەکەم‌و دووهەم بەکورتیی‌و دەستەی سێهەم بەدرێژیی ، چونکە یەکەم‌و دووهەم هەرچی پێچ‌وپەنا بێ تێیانا نیی‌یە ، ئەویان ڕەپ‌و ڕاست مسڵمان‌و ئەمیان ڕەپ‌و ڕاست بێ‌بڕروایە ، بەڵام دەستەی سێهەم ــ کە ناپاکانە ــ وەك گوریسی ناوهەمانە وانە ، دیمەن جۆرێك‌و دیوی ناوەوە جۆرێك ، گوفتار جۆرێك‌و کردار جۆرێك ، نەخوازەلا کە ئەم دەستەیە زۆر ئازاری پێغەمبەرو مسلمانەکانیشیان دا ، وە دەورێکی زۆر پیسیان دیی لە مدینەدا ، وە هەر ئەمەشە کاری ناپاکان لە هەمووکاتێکا ، وە لە هەمووشوێنێکا ، وە لەگەڵ هەمووکەسێکا تا جیهان جیهان بێ ، ئنجا بۆ ڕووناك‌کردنەوەی حاڵی ئەم‌ناپاکانە، وە بۆ نیشاندانی ئەحواڵی نەبینراویان لە کالاّی بینراوا ، دوو وێنەیان ئەگرێ ، وە تشبیهی چۆنێتی دەستەی سێهەم ئەکات لە هەردوو وێنەکەدا بە شتێکی بینراو تا باش بیان‌ناسین ٠

﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً ، فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ لا يُبْصِرُونَ﴾ (١٧)

وێنەیان وەك یەكێك وایە كە ( لە شەوێكی تاریكا ) ئاگرێك هەڵگیرسێنێ ، كە لەگەڵ دەوروبەری رووناك كردەوە ( خێرا ) خوا رووناكی‌یەكەیان لێ بكووژێنێتەوە ، وە بی‌یانهێڵێتەوە لەناو چەند تاریكی‌یەكی وادا كە هیچ نەبینن (١٧)

لە وێنەی یەكەما تشبیهی چۆنێتی « حاڵ »یان ئەكات بە دەستەیەك كە لە تاریكی‌یەكی ئەوستەچاوا دامابن ، وە بۆ رووناك كردنەوەی دەوروبەری خۆیان ئاگرێك هەڵگیرسێنن ، لەپرر ئاگرەكەیان لێ‌بكووژێتەوە ، وە بە سەرگەردانیی بمێننەوە ، ئەفەرموێ ( مثلهم ) وێنەی ئەم ناپاكانە ( كمثل الذي استوقد نارا ) وەك یەكێك وانە كە لە شەوێكی تاریكی هەورو بارانا ، وە لە دەشتێكی چۆڵو بیابانی سامدارا ئاگرێك هەڵگیرسێنێ بۆ خۆیو هاورێكانی ، تا دەوروپشتی خۆیان ببینن ، وە لە درزندەو جانەوەر دڵنیا بن ( فلما أضاءت ما حوله ) كاتێك كە ئاگرەكە دەوروپشتی رووناك كردنەوە ( ذهب الله بنورهم ) خوا رووناكی‌یەكەیان لێ بكووژێنێتەوە ( وتركهم في ظلمات لا يبصرون ) وە بی‌یان هێڵێتەوە لەناو چەند تاریكی‌یەكا كە هیچی تیا نەبینن ، وەك تاریكی شەوو تاریكی هەورو تاریكی باران ، دیارە مەردوم تا كەمتر ببینێ زۆرتر ترسو بیمی لێ‌ئەنیشێ •

ئەم ناپاكانە هەرچەند لەپێشەوە روویان وەرنەگێررا لە رێ‌نموونیی خوا ، وەك دەستەی دووهەم ، وە گوێی خۆیان كەرر نەكرد لە بیستنی فەرموودەی ، وە چاویان نەقووچاند لە بینینی بەڵگەو نیشانەكانی ، وە دەرگای دڵیان دانەخست لە تێگەیشتنو ووردبوونەوە ، بەڵكو لەپێشەوە ـ وەك لە مثالەكەدا فەرمووی ـ بەشوێن رووناكیی‌و ئاگرێكا گەرران تا هەڵیان‌گیرساند ، وە دەوروپشتی رووناك كردنەوە ، بەڵام دوای ئەوەی كە رووناكی یان دیی‌و رێی راستیان بەدیی كرد ، لایانداو بایاندایەوە سەر بیروباوەرری كۆنیان ، وە دەرگای رێ‌نموونیی خوایان

صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لا يَرْجِعُونَ (١٨) أَوْ كَصَيِّبٍ مِنَ السَّماءِ فِيهِ ظُلُماتٌ وَرَعْدٌ وَبَرق

کەررو لاڵو کوێرن ، ( بۆیە لە گومرایی خۆیان ) ناگەرێنەوە (١٨) یا وەك ( کەسانێکن لە چۆڵ کە ) بارانێکی لێزمەو بەخورر ( یان لیّ‌داکات ) لەئاسمانەوە لەگەڵ تاریکی زۆرو تریشقەو بروسکەدا ،

---

لەخۆیان داخست ، ئیتر نە باوەرریان بە ژیریی‌و بیرو نە بە دڵو دەروونی خۆیان ما ، بۆیە ئەفەرموێ ( صم بکم عمي ) ئەوان کەررو لاڵو کوێرن ، واتە نە بەگوێ قسەی راست ئەبیەن ، نە بە زبان دان بە قسە راستەکەدا ئەنێن ، نە بە چاو بەڵگەو نیشانەی راست ئەبینن ، بەجۆرێك کە ( فهم لا یرجعون ) ئەوان لە گومرایی خۆیان ناگەررێنەوە •

واتە ئەم ناپاکانەش چرای سروشتیان پێشەکی گرراو تروسکەیەکی دایەوە ، وە بررِوایان هێنا ، کەچی کوتوپرر دەستوورو باوی ناشیرینی کۆمەڵایەتیی‌و رەووشتی کۆنی باووباپیریان بیرکەوتەوە ، وە پەردەی رەشی هێنا بەسەر چاوو دڵو گوێیانا ، وە چرای دەروونیان کووژایەوەو دەستەوسان مانەوە •

لە وێنەی دووهەما تشبیهی حاڵی ناپاکان ئەکات بەدەستەیەك کە لەشەوێکی تاریك‌و دەشتێکی چۆڵو بیابانا بارانێکی لێزمەو بەخوورریان لیّ‌داکات ، لەگەڵ گرمەو ناڵەی هەوررو بریق‌و باقی بروسکەو شریخ‌و هووررری هەورە تریشقە ، بەجۆرێك کە لەترسانا کاس‌و سەرسام بین ، ئەفەرموێ ( او کصیب من السماء ) یا وەك کەسانێك وان لە چۆڵو بیابانا کە بارانێکی لێزمەو بەخورریان لیّ‌داکات لە ئاسمانەوە ، بارانێکی‌وا ( فیە ظلمات ) کە چەند تاریکی‌یەکی تێدابێ ، یەك لەسەریەك ، وەك تاریکیی شەوو تاریکی هەوررو تاریکیی باران ( ورعد وبرق )

يَجْعَلُونَ أَصَابِعَهُمْ فِي آذانِهِمْ مِنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ ، وَاللَّهُ مُحِيطٌ بِالكافِرِينَ (١٩) يَكادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ ، كُلَّما اَضَاءَ لَهُمْ مَشَوْا فِيهِ ، وإذا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا ، وَلَوْ شَاءَ اللهُ

( بەجۆرێك کە ) پەنجەکانیان بکەن بەگوێیانا ، لەبەر گرمەی هەورە تریشقە ، بۆ خۆپاراستن لە مردن ، وە خوا دەوری بێبڕوایانی داوە (١٩) نزیكبێ ئەو بروسکەیە ( بینایی ) چاویان بفرێنێ ، هەرچەند رووناکیی بۆ بدانایەتــەوە تیا برۆیشتنایە ، کەتاریکیشی بکردایە لێیان بوێستانایە ، وە ئەگەرخوا بیویستایە

لەگەڵ تریشقەو بروسکە بەجۆرێکیوا کــە پرر بەدڵ بترسن ، وە ( یجعلون أصابعهم في آذانهم ) پەنجەیان بکەن بەگوێیانا ( من الصواعق ) لەترسی هەورە تریشقەی زۆر ( حذر الموت ) بۆ خۆپاراستن لە مردن ، لەگەڵ ئەمیشە کــە گوێ ئاخنین لەوکاتانەدا مەردوم ناپارێزێ لە تریشقە ( والله محيط بالكافرين )وە خوا هەمیشە بەمڕەنگە ، وە لە هەموولایەکەوە دەوری بێبڕوایانی داوە ، وە هەرگیز دەرچوونیان نییە لە دەستی •

دیارە تاریکی شەوو لێزمەی بارانو گرمەو شریخەی هەور ، کە گەیشت بەمئەندازەیە ، ئیتر بروسکەدانەوەش کەڵکی نامێنێ بۆ رێدۆزینەوە لەبــەر سەرسامیی ، وەکو ئەفەرموێ ( يكاد البرق يخطف أبصارهم ) نزیك بێ ئــەو بروسکەیە بینایی چاویان بفرێنێ ، وە هەموجارێك پەردەی رەش بەسەرچاویانا بێنی ، بەجۆرێکیوا کە چاویان رەشکەو پێشکە بکات ، لەگەڵ ئەمیشە ( كلما أضاء لهم مشوا فيه ) هەرچەند رووناکیی بۆ بدانایەتەوە برۆیشتنایە لەناویا ، بەڵام چۆن رۆیشتنێك ؟! وەك رۆیشتنی مەلی سەربڕراو ( وإذا أظلم عليهم قاموا ) کە تاریکیشی لێبکردنایە خێرا بوێستانایە •

وەك یەکێك لێرەدا بڵێ : خوایە ، سزا کە گەیشت بەمئەندازەیە ، بۆچی بەم هەموو شریخەو بروسکەیە کەررو کوێریان ناکەیت تا بۆخۆیان بمرنو رزگار بن ، وەرام ئەداتەوە ئەفەرموێ ( ولو شاء الله ) ئەگەر خوا بیویستایە

لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ إِنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٢٠)
يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ
لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (٢١)

( بەو گرمەو بروسکانە ) کەررو کوێری ئەکردن ، بێ‌گومان خوا دەسەڵاتدارە بەسەر هەمووشتێکا (٢٠) ئەی مەردوم ئەو خوایەی خۆتان بپەرستن کە ئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەی دروست‌کردووە ، بەڵکو ( بەو پەرستشە ) خۆتان بپارێزن ( لە بێ‌فەرمانی ئەو ) (٢١)

( لذهب بسمعهم وأبصارهم ) بیستن‌و بینشی لێ‌ئەسەندنەوە ، بەڵام شایستەی ئەو میهرەبانی‌یە نین ، بەڵکو شایستەی ئـەوەن کە چاویان بمێنێ تا تۆڵەی خوای پێ‌ببینن ، وە گوێ‌یان بمێنی تا سزای خوای پێ‌ببیەن ( ان الله علی کل شیء قدیر ) بێ‌گومان خوا بەدەسەڵاتە بەسەر هەمووشتێکا .

* * *

لەدوای باسی قورئان‌و گیررانی بە سەرمەشقی چاکان ، وە لەدوای باسی دەستەکانی ئادەمیی بەرانبەر بە قورئان لە برروادارو بێ‌برروا‌و ناپاکان ، ئنجا بانگی هەموو ئادەمیی ئەکات بە هەموو تیرەکانی‌یەوە بۆ ئایینی بەراستی ، کە بنیات‌و بناغەکەی ئەم سێ‌شتەیە :

١ ــ پەروەردگاریی‌و تاك‌و تەنیایی خواو پەرستنی .
٢ ــ برروا بە پێغەمبەر .
٣ ــ برروا بە رۆژی دوایی .

لە باسی بنیاتی یەکەمدا ئەفەرموێ ( یا أیها الناس اعبدوا ربکم ) ئەی مەردوم پەروەردگارتان بپەرستن بە پەرستنێکی پرر لە شەرم‌و شکوە ، هەروەك لە بەردەمیا وێستابن‌و تەماشای بکەن ، چونکە ئەگـەر ئێوەش چاوتان لەوەوە نەبێ ئەو چاوی لە ئێوەوەدیە ، واتە هەر چاکەو خواپەرستی‌یەك ئەکەن هـەر بۆ خوا بێ ، وە بەشی کەسی‌تری تیا نەبێ ، چونکە هەر ئەوە خوای خۆشتان‌و باوو باپیرانیشتان ، وەکو ئەفەرموێ ( الذی خلقکم والذین من قبلکم ) ئـەو پەروەردگارەی کە خۆتان‌و باووباپیرانتانی دروست کردووە ، وە پەروەرشی کردوون ( لعلکم تتقون ) بەڵکو بەم پەرستشە خوای خۆتان بناسن ، وە لـە

اَلَّذي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِراشاً ، والسَّماءَ بِناءً ،

ئەو ( خوا )ەی کە زەویی بۆ راخستوونو ئاسمانی بۆ کردوون بە کۆشك ،

دەستوورو باوی بگەن ، وە هەمیشە خۆتان بپارێزن لە پێچەوانەی فەرموودەو فەرمانی •

لەدوای باسی بەهرەی دروستکردنو هێنانەدیی ، ئنجا باسی هێندێك سیفەتی پەروەردگاریی خۆی ئەکات ، ئەفەرموێ ( الذي جعل لكم الارض فراشا ) ئەوخوایەی کە زەویی بۆ راخستوون لەژێر پێتانا بەرەنگێکیوا کە لەسەری بژیین ، بەم‌رەنگە هەزاران شتی بۆ یەك‌خستووە تا وای لێکردووە کە گیانداری لەسەر پەیدا ببێ ، کە ئەم هەزاران شتە هەرگیز لەوانە نین کە بە رێکەوت پەیدابووبن ، چونکە فەرهەنگی زانیاریی ووتەی رێکەوت ناگرێ ، بەڵکو ئەبێ دەستێکی تایبەتیی هەمووی یەك‌خستبن بۆئەوەی کە ئادەمیی بێتەدیی، وەك هەوای سەرزەویی کە بەشێکی تەواوی تیایە لەو عونسرانەی کە پێویستن بۆ ژیان بەنیسبەتێکیوا وورد ، ئەگەر کەمێك زۆرتر یا کەمتر بوونایە ژیان نەئەبوو ، وەك ئوکسجین کە ٢١٪و ئازۆت یا نتروجین لە ٧٥٪و ئانی ئوکسیدی کربۆن لە دەهەزارا ، سێ‌بەشە ، ئەم نیسبەتانە بە بێ‌زیادو کەم پێویستن بۆ بوونی ژیانو پایەداریی گیانداران لەسەر زەویی •

خوا زەویی رام‌کردووە بەهۆی ئەمانەو هەزاران شتی‌ترەوە کە زۆر زۆر پێویستن بۆ پایەداریی ژیان ــ وەك قەبارەی زەوییو رۆژو مانگ ، وە دووریی زەویی لە رۆژو مانگەوە ، وە ئەندازەی گەرمیی رۆژو ئەستووریی توێکڵی زەوییو سوورانەوەی بەدەوری خۆیا لە بیستو چوار سەعاتاو سوورانەوەی بەدەوری رۆژا لەساڵێکاو کلایی تەوەرە « محور »ی‌و نیسبەتی ئاوو وشکانی لەسەرزەویی هەتەد • ئەمانەو هەزاران شتی‌تریوا بە هەموویان زەوییان گێرراوە بەجۆرێك کە گیان لەبەرو خواردەمەنی لەسەر پەیدا ببێ ، ئەگەر ئەمانە نەبوونایە ئەم ژیانە نەئەبوو ، وەك بە دوورو درێژیی باسمان کردووە لە تەفسیریی سوورەی « ملك »دا •

( والسماء بناء ) وە ئاسمانی گێرراوە بە کۆشك ، واتە چۆن کۆشك لە

وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَكُمْ ، فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَاداً وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٢٢)

وە ئاوی بارانی دارشتووە لە ئاسمانەوە ئنجا دەری‌هێنا بەوئاوە هەموو جۆرە میوەیەك بۆ رۆزیی ئێوە ، کەواتە هاوتای بۆ پەیدا مەکەن ، وە ئێوە خۆتان ئەزانن ( کە بێ‌هاوتایە ) (٢٢)

گەلێ پارچە دروست ئەکرێ ، وە پارچەکانی بە گەچ یا بە شتێکی‌تر بەیەکەوە ئەنوسێنرێن ، ئاسمانیش لە هەزاران ملیۆن رۆژو مانگ‌و ئەستێرە دروست‌کراوە ، وە ئەم ئەستێرانە - با زۆریش لەیەکەوە دووربن - هەموو بەهێزی کێشندە بەیەکەوە بەستراوون •

( وانزل من السماء ماء )وە ئاوی بارانی دارشتووە لەلای ژوورووەوە ( فاخرج بە ) ئنجا دەری‌هێناوە لە زەویی بەهۆی ئەو بارانەوە ( من الثمرات رزقا لکم ) هەمووجۆرە بەرێك لە میوەو دانەوێڵە بۆ رۆژیتان ، کەواتە ( فلا تجعلوا للە أندادا ) هاوتا بۆ خوا پەیدا مەکەن‌و هاوار لە کەسی‌تر مەکەن ، وە ئەوشتانەی کە هەر خوا ئەتوانێ بیانکات داوای لـە یەکێکی‌تر مەکەن ( وأنتم تعلمون ) وە ئێوە خۆشتان ئەزانن کە خوا هیچ‌جۆرە هاوبەشێکی نی‌یە •

واتە ئەی مەردومی ژیری خاوەن‌بیر ئەو خوایەی کە ئەم جیهانەی بۆ تۆ هێناوەتە دیی ، وە ئاسمان‌و زەویی بۆ رام‌کردوویت ، وە رۆژو مانگ‌و ئەستێرەو زەویی بۆ خستوویتـە گەرر ، وەك چەرخـەچی ئەخولێنـەوە بۆ خزمەتگوزاریی تۆ ، تا بەخۆشیی بژییت - شایستەی ئەوەیە کە بی‌پەرستیت‌و دان‌بنێیت بە خوایەتیی ئەوا •

لەدوای باسی بنیاتی یەکـەم - کـە پەروەردگاریی خواو تاك‌و تەنیایی ئەوبوو - ئنجا باسی بنیاتی دووهەم‌و سێهەم ئەکات - کە پێغەمبەرێتی پێغەمبەرو

وإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ ، وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٢٣)

ئەگەر لەم قورئانەی کە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ بەندەی خۆمان ( محمد ) ـ لەگومانان ، دە سوورەتێك بێنن بەوێنەی ئەو ، وە بانگی هاوکات «معاصر»ەکانتان بکەن (لە شاعرانو رەوانبێژان) ، بێجگە لە خوا ئەگەر راست ئەکەن بە فەرموودەی خوای نازانن (٢٣)

زیندوکردنەوەی رۆژی دوایی‌یە[1] ئەفەرموی ( وان کنتم في ریب ) ئەگەر دوودڵی‌یەکیان هەیە ( مما نزلنا علی عبدنا ) لەم قورئانەی کە بە سرووش ناردوومانەتە خوارەوە بۆ بەندەیەکی خۆمان کە پێغەمبەرە ، وە بە فەرموودەی خوای نازانن ( فأتوا بسورة من مثله ) فەرموون ئێوەش بە هەمووولایەکتانەوە ـ ئەی رەوانبێژانی عەرەب ـ تاقە یەك سوورەت بێنن بەوێنەی قورئان ( وادعوا شهداءکم من دون الله ) وە بانگی هەموو هاوکات « معاصر »ەکانتان بکەن لە شاعرانو رەوانبێژان بێجگە لەخوا تاکو یارمەتی‌تان بدەن ( ان کنتم صادقین ) ئەگەر راست ئەکەن کە قورئان بە فەرموودەی خوا نازانن •

ئەمە ئاشکراو نمایانە لە هەموو خوێندەوارێکەوە ، کە هەر پێغەمبەرەی جۆرە معجزەیەکی بووە ، وە معجزەکانیان بەپێی ئەورۆژە بووە کە تیاهاتوون ، واتە لەورۆژەدا چی باو بووە معجزەکانیان لەوجۆرە شتانە بووە ، بەمرەنگە لەکاتی مووسادا جادوو « سحر » باو بووە ، لەبەرئەوە معجزەکەی ئەمیش شتێك بووە وەك جادووی جادووگەران ، بەڵام ئەمراستو ئەوان درۆ ، وە هەرچەند بێ‌ویستایە بەرانبەر بە جادووگەرەکانی فیرعەون ـ کە بەجادوو ئەژدەهایان دروست ئەکرد ـ داردەستەکەی خۆی فرێ ئەدا ، وە ئەبوو بە ئەژدەهایەکی راستەقینە بەسەر ئەژدەهای جادووگەرەکانا ، بە جۆرێك کە

(١) جگە لەوەکە لەسەرەتای ئەم سوورەتەوە باسی قورئانی کرد بە ئایەتی « ذلك الكتاب لا ريب فيه » وە باسی ئەوەی کرد کە مەردوم بەرانبەر بە قورئان سێ دەستەن برروادارو بێبرروا و ناپاك ، ئنجا پێیان ئەڵێ : « وان كنتم في ريب » •

جادووگەرەکان برروایان پێئەهێناو سەریان بۆ دائەنەواند •

لەکاتی عیسادا پەزیشکیی باو بووە ، لەبەرئەوە معجزەکـەی ئەمیش چاك‌کردنەوەی بەڵەك‌و کوێری زگ‌ماك‌و گەلێ شتی‌تری‌وا بووە لەم‌بابەتانە •

لەکاتی پێغەمبەری ئیسلاما رەوان‌بێژیی « بلاغت » باوبووە ، لەبەرئەوە معجزەی ئەم قورئانێکی رەوان‌بێژ « بلیغ »ە کە هەر خوێندەوارێك لێی وورد بێتەوە برروا ئەهێنێ کە ئەمە لەشێوەو ئاهەنگی ووتاری ئادەمیی‌دا نی‌یە •

ئەمە لەلایەك ، لەلایەکی‌تریشەوە هەموو پێغەمبەرێکی خاوەن‌نامە ، چونکە ئاینەکەیان بۆ ماوەیەکی کەم بووە ، لەپاشا پێغەمبەرێکی‌تری بەدوادا هاتووە بە ئاینێکی تازەوە ، معجزەکانیان بۆ ناوچەیەکی بچکۆلە ، وە بۆ ئەوکەسانە بووە کە بەچاو دیویانە ، بەڵام ئەوانەی کـە بەچاوی خۆیان نەیان‌دیوە ، یا نەیان بیستووە لەوکەسانەی کە بەچاوی خۆیان دیویانە ، توانیویانە پێی باوەرر نەکەن، وە ئەو معجزانە بە بێ‌کەڵك ماونەتەوە ، بەڵام پێغەمبەری ئیسلام چونکە دواترینی هەموو پێغەمبەرانە ، وە پێغەمبەری‌تری بەدوادا نایەت ، وە ئاینەکەی تا رۆژی دوایی پایەدارە ، وە هەمووکەسێکیش پێویستە بە برروا‌هێنان پێی ، جگە لەوە رۆزگاریش روو لە پێشکەوتنە ، وە رۆژبەرۆژ زانین‌و زانیاریی لە پێشکەوتنایە ، وە هەمووشتێك بە ترازووی زانین ئەکێشرێ‌و لە سەنگی محەك ئەدرێ ، لەبەر ئەمانە خوا معجزەیەکی علمی دا بە پێغەمبەر ــ کە قورئانە ــ کە تا رۆزگار لە پێشکەوتنا بێ گەورەیی ئەو باشتر دەربکەوێ ، وە تا زانین سەربکەوێ زانیاریی ئەو جوانتر بدرەوشێتەوە ، وە تا نهێنی بوونەوەر « کون » بدۆزرێتەوە معجزەکەی ئەو چاکتر دەنگ بداتەوە ، ئەو معجزەیەش قورئانە کـە بە زبانێـکی رەوان نوسراوە ، وە هەمووکەسـێك ئەتوانێ تەماشای بکات‌و لێی وورد بێتەوە ، یا بیخوێنێ‌و بیخوێنێتەوە •

ئنجا کاتێك کە پێغەمبەر هات‌و فەرمووی : من پێغەمبەری خوام ، وە ئەم قورئانـە فەرموودەی خوایە ، بـە سرووش بۆم‌دێ ، بێ‌بررواکان باوەرریان

پێ‌نەئەکرد ، وە ئەیانووت : « لَوْ نَشَاءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَذَا » أنفال/٣١ •

واتە ئەگــەر بمانویستایە ئێمــەش شتی‌وامان ئــەووت • ئنجــا بۆ بەدرۆخستنەوەیان یەکەمجار ئایەتی سوورەی « إسراء » هاتە خوارێ فەرمووی : « قُلْ : لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الْانْسُ وَالْجِنُّ عَلَى أنْ يَأتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرآنِ ، لَا يَأتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرا » •

واتە بڵێ : ئەگەر هەرچی ئادەمیی‌و پەریی هەیە کۆبنەوە بۆئەوەی بــە وێنەی ئەم قورئانە بێنن ، هەرگیز نای هێنن با هێندێکیشیان پشتیوانی هێندێکیان بن • کە ئەمەیان نەتوانی ئنجا ئایەتی سوورەی « هود » هات فەرمووی « أمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ ، قُلْ فَأتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ ، وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللهِ إنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ، فَإنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكُمْ فَاعْلَمُوا أنَّمَا أنْزِلَ بِعِلْمِ اللهِ » •

واتە یا ئەڵێن ( محمد خۆی ) هەڵی ئەبەستێ ، ( پی‌یان ) بڵێ : دە (ئێوەش) دە سوورەتی وەك ( سوورەتەکانی ) قورئان بێنن بــە هەڵبەستراویی ، وە کێ ئەتوانن بانگی بکەن بێجگە لە خوا ، ئەگەر راست ئەکەن ، ئنجا ئەگەر نەیان‌توانی بیلێن ئەوا بزانن ئەوەی کە نێرراوەتە خوارەوە بەئاگاداریی خوایە • کە ئەمەشیان نەتوانی ئنجا ئایەتی سوورەی « یونس » هات فەرمووی « أمْ يَقُولُونَ افْتَرَاه ، قُلْ فَأتُوا بِسُورَةٍ مِثْلِهِ » •

واتە ئایا ئەڵێن : ( محمد خۆی ) هەڵی‌ئەبەستێ ، بڵێ : دە ( ئێوەش ) یەك سوورەتی وەك ئەوبێنن •

ئەم سێ ئایەتە هەرسێکیان لە مکە ، وە لەناو کەڵەکەڵەی هۆزی «قریش»دا هاتوونەتە خوارەوە ، کــە خوداوەندی رەوان‌بێژان « بلغــاء » وە سەرچاوەی رەوان‌بێژیی « بلاغت » بوون لە زبانی عەرەبی‌دا ، لەپاشا لە مدینەش بە ئایەتی ئەم سوورەتە هانەهانەی دان بۆ ووتنی سوورەتێکی وەك قورئان •

ئەمە ١٤٠٠ ساڵە ئەم معجزەیە پایەدارە تا ئەمرۆ ، وە کەس نەی‌توانیوە

فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا ـ وَلَنْ تَفْعَلُوا ـ فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ (٢٤)

ئنجا ئەگەر ئەمەتان نەکرد ـ کە هەرگیز ناشی کەن ـ (**ئیتر بێبڕوایی مەکەن**) وە خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە سووتەمەنی‌یەکەی مەردوم (ی بەدکار) و بەردەکە ئامادەکراوە بۆ بێبڕوایان (٢٤)

بیشکێنێ ، وە تا ڕۆژی دوایش هەر وا پایەدار ئەبێ ، وەکو ئەفەرموێ **( فان لم تفعلوا )**[1] ئنجا ئەگەر نەتانتوانی تاقە سوورەتێکی وەك **قورئان بڵێن ( ولن تفعلوا )** کە لەمەولاش تا ڕۆژی دوایی هەر ناتوانن ، ئنجا **کە ئەمەتان** بۆ دەرکەوت ئیتر خۆتان بپارێزن لە سەرپێچی‌و بێبڕوایی **کە مایەی چوونە** ناو ئاگری دۆزەخە ، وەکو ئەفەرموێ **( فاتقوا النار التي وقودها الناس والحجارة )** ئنجا خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە سووتەمەنی‌یەکەی **ئادەمیی بەدکارو بەردە ( أعدت للکافرین )** ئامادەکراوە بۆ بێبڕوایان ، واتە کە **نەتانتوانی بەوێنەی قورئان سوورەتێك بڵێن ئیتر بڕوا بێنن بە پێغەمبەرو بە قورئان** .

ئێمە کە **مسڵمانین بڕوامان هەیە بەم‌ئاگری دۆزەخە کە خوا داینا‌وە بۆ بێبڕوایان** ، وە لە ئاگری جیهان گەلێ گەرمترو بەتینترە ، **بەڵام چونێتی‌یەکەی هەر خوا خۆی ئەیزانێ** .

جیهان وەك بێشەلان وایە ، هەزاران شێری شێرخۆرو **پڵنگی خوێنخۆری تیایە** ، هەرکەسێك تا هەرچەندە زیرەکو بلیمەت ، **یا زاناو دانا ، یا شاعیرو ڕەوانبێژ بێ** ، ئەگونجی یەکێکی لێ‌ڕابەڕێ گەلێ گەلێ **لەو زیرەکترو بلیمەتتر** ، یا زاناترو داناتر ، یا شاعیرترو ڕەوانبێژتر بێ ، **وەك شاعیر ئەڵێ :**

هەر بێشە مەزانە چۆڵ‌وهۆڵە		مەبادا نوستبێ تیایا **پڵنگێك**

ئەگەر لەژیانی خوشـیا لێی‌ڕانەپەڕن ، ئەگونجێ دوای خۆی **هەر**

---

**(١) لەم‌ئایەتەوە تا ئایەتی ٢٦ بنیاتی سێیەم ئەگەیەنێ کە زیندوکردنەوەیە .**

لێی‌راپەررن ، کەوابوو ئەگـەر ئەم قورئانە فەرموودەی خوا نەبوایە ، ئـەم پێغەمبەرە چۆنی ئەتوانی بلێ : « فان لم تفعلوا ولن تفعلوا » وە چۆن نەئەترسا کە بە سەرێنی خۆی ، یا دوای خۆی بەدرۆی بخەنەوە ، وە هەر بناغەیەکی ناوە بەجارێك بۆی برروخێنن،یەکێك شێت نەبێ قسەی‌وا گەورە ناکات،کەوابوو ئەمە قسەی پێغەمبەر نی‌یە ، بەڵکو فەرمودەی ئەوخوایەیە کە ئاگای لە پاشەرۆژە ، وە ئەزانێ کە تا رۆژی دوایی کەس ناتوانی ئەم تەلیسمە بشکێنێ ، وە ئـەم قەڵایە برروخێنێ ، هەر وەك ئێمە وا بەچاوی خۆمان دیمان لەدوای ١٤٠٠ ساڵ •

## ئیعجازی قورئان

مەبەس لە ئیعجاز : دەستەو سانو داماوکردنی یەکێکە لەکارێکا ، وەك بەیەکێك بلێت : شـاخی گۆیژەم بەکۆڵ بۆ هەڵگرە ، دیارە کـەس ناتوانێ هەڵیگرێ ، وە هەموکەسێك لە هەڵگرتنیا دەستەوسانە ، یا بە نەخوێندەوارێك بلێت : کتێبێکم بۆ بنووسە لە باسی پەستەی بەرزیی « ضغطی جوی » یا چینەکانی زەویی « طبقاتی أرض » دا ، دیارە ناتوانێ ، وە دەستەوسانە لە نووسینی‌یان ، ئنجا بەم‌پێ‌یە ئەووترێ قورئان معجزەیە ، واتە کەس ناتوانێ بەوێنەی ئەو بلێ ، ئنجا با بزانین بۆچی وایە ؟ بۆ روون کردنەوەی ئەم مەبەسـە بەتەواویی ، پێویستە چەند جلدێك بنووسین کە ئێرە جێی ئەوە نی‌یە ، کەوابوو با بەکورتیی نیشان بدەین کە قورئان بۆچی معجزە ، وە سرووشێکی خوایی‌یە •

قورئان ١١٤ سوورەتە ، ئەم‌سوورەتانە لە سێ ئایەتی‌یەوە هەیانە تا ٢٨٦ ئایەتیی ، ئایەتەکانیشی کورتیان هەیەو درێژیان هەیە ، واتە لە یەك‌ووتەوە هەیانە تا دوانو سیانو زیاتر ، وە لە دێرێکەوە تا دوانو سیانو زیاتر ، ئەم سوورەتانە هەیانە هەمووی لەسەر یەك قافیە ئەررۆن ، هەیانە قافیەکانی ئەگۆررێن ، بەڵام هەموو مەبەسەکانیان بەرزە ، بەم‌رەنگە یا باسی خواو نیشانە « صفة »کانێتی ، یا باسی زینـدوو بوونەوەو رۆژی دوایی‌و پرسینەوەیە ، یا باسی بەهەشـتو

دۆزەخە ، یا باسی سەرگوزەشتی پێغەمبەرانە لەگەڵ گەلەکانیان ، بەجۆرێکی کورت تا ببێ بە سەرمەشقی پەندو ئامۆژگاریی ، یا باسی خواپەرستیو رەووشتو خووی بەرزە ، یا باسی دروستو نادروستە لــە کردەوەی مەردوم لەگــەڵ یەکتریی‌دا •

ئیعجازی قورئان لەگەڵێ رووەوەیە :

یەکەم : لە وێژەکەیایەتی ، واتە وێژەکەی شتێکی تیایە وەك وەزنی شعر کە هەر مەردومی خوێندەواری رەوانبێژ هەستی پێ‌ئەکات ، بەڵام ناتوانێ باسی لێ‌بکات ، یا وەك جوانیی وایە کــە هەر خاوەن دڵ تیی‌ئەگات ، بەڵام ناتوانێ یەکێکی‌تر تێ‌بگەیەنێ •

ئاهەنگو شێوەی قورئان لە هەموو ئاهەنگو شێوەیەك جیاوازە ، یەکێك تۆزێ شارەزای وێژەی عەرەبی بێ ، ئەزانێ هۆنراوەیەکی زۆر جوانو رەوان لەگەڵ پەخشانێکا ، چەند لەیەك جیان ، ئاهەنگی قورئانیش لەگــەڵ هەموو ئاهەنگێکی عەرەبی‌دا بە هۆنراوەو پەخشانی‌یەوە ، ئەوەندە لەیەك‌جیان •

طه حسین ئەڵێ : قورئان نە پەخشانەو نە هۆنراوەیە ، بەڵکو هەر قورئانە ، وە ناگونجێ هیچی‌تری پێ‌بڵێیت •

هۆنراوە نی‌یە چونکە وەك شیعر ئایەتەکانی بەقەد یەك نین ، وە وەزنی هۆنراوەی نی‌یە •

پەخشانیش نی‌یە چونکە هێندێك شتی تیا دەرمیان کراوە کــە لە پەخشانا نەکراوە ، وەك قافیەکانی بێ •

لەمەوە دەرئەکەوێ کە قورئان ووتەی ئادەمیی نی‌یە ، ئەگینا لە ووتاری ئەوان ئەچوو ، هــەموو زانایــەك یا رەوانبێژێك ئەمە ئەزانێ ، هــەروەك رەوانبێژەکانی کاتی پێغەمبەر لەمە ، گەیشتوون ، بۆیە نەیان‌توانیوە سوورەتێکی بچکۆلانەی سێ ئایەتیی بڵێن •

دووهەم : لێرەدا شتێکی زۆر گرنگ هەیە کە پێویستە بەرچاو بخرێ ، ئەویش ئەوەیە کە وێژەی قورئان لە وێژەی فەرموودە «حدیث»کانی پێغەمبەریش ناچێ ، نــە لە ئاهەنگو نە لــە سەرباسا ، هەروەك هەســت ئەکرێ لەودیو ووتارەکانی پێغەمبەرەوە بەخۆیەتی « شخصیت »یەکی ئادەمیی ، وە بە کەسێك کە هێندێجار زەبوونیی رووی تێبکات ، بەڵام لە قورئانا دەرئەکەوێ لەودیو ووتارەکانییەوە خۆیەتییەکی بەهێزی ، دەستداری ••• بەدەسەڵاتی •• بێباکی •• ئاگاداری •• دادپرسی •• دانا ! وە ئەم خۆیەتییە زەبوونیی تیا هەست ناکرێ لە هیچ روویەکەوە ، تەنانەت لەوشوێنانەشا کە جێی دڵ نەرمییە •

لەمەوە دەرئەکەوێ کە قورئان ئەگــەر فەرموودەی پێغەمبــەر بووایە ، لەگەڵ فەرموودەکانی خۆیا جیــاوازیی نەئەبوو ، چونکە ئاشکرایە کــە هەموو نووسەرێك یەكشێوەو ئاهەنگی هەیە لە نووسینا ، وە کەس ناتوانێ بە دووشێوە بنووسێ بەجۆرێك کە لەیەك نەچن ، کە ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان سرووشی خوایە نەك فەرموودەی ئادەمیی •

سیهەم : شتێکیتری زۆر گرنگ لە قورئانا هەیە کە زۆر جار یەك مەبەست لە سێ چوار لاوە بــە سێ چوار رەنگ بۆت باس ئەکات ، کــە یەك لە یەك جوانترو رەوانترو بەهێزترن ، وە هیچیان لەهیچیان ناچن ، کە ئەمە هەر لــە قورئانا هەیە ، وە هەر لە دەسەڵاتی ئەوایە •

چوارەم : شتێکیتر لەمانە لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە هەموو ووتەیەکی قورئان جۆرە دەنگێکی مۆسیقی هــەیە لە گوێچکەدا بەرەنگێك ئەگــەر ئەو ووتەیە لابەیت ، وە ووتەیەکیتر بەو وەزنو مەعنایە لەجێ دابنێیت ، وەزنەکە ئەگۆررێو رەوانییەکە تێك‌ئەچێ •

پێنجەم : ئەو تینو تەووژمەی کە لە قورئانا هەیە لە هیچ‌شتێکیترا نییە ، هەرکەسێك گوێی بۆ بگرێو دڵی بۆ بکاتەوە تەزووی پیا دێ ، با مسڵمانیش

نەبێ ، لەبەرئەوە خوا قورئان ناو ئەبات بە دوو شت ، یەکەم بە گیان ، دووهەم بە رووناکیی لـە ئایەتی « وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحاً مِنْ أَمْرِنَا مَا كُنْتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلا الإيمانُ ، وَلَكِنْ جَعَلْنَاهُ نُوراً نَهْدِي بِهِ مَنْ نَشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا ، وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ » شوری/٥٢ •

واتە ئاوا سرووشمان بۆ ناردیت بەگیانێك لەلای خۆمانەوە ( کە قورئانە ، لەکاتێکا کە ) نەتئەزانی نامەو برروا چین ، بەڵام گێرِرامان ( ئەو قورئانە ) بە رووناکییەك کە رێنمونیی پێئەکەین بۆ کەسێك کە بمانەوێ لە بەندەگانی خۆمان ، وە تۆ رێنمونیی ئەکەیت بۆ رێی راست •

خوا قورئان ناو ئەبات بە گیـان چونکە وەك گیان دڵی مردوو زینـدوو ئەکاتەوە ، وە بە رووناکیی چونکە وەك رۆژ ، جیهان رووناك ئەکاتەوە ، ئایا هەر ئەم قورئانە نەبوو کە دواکەوتووترینو نادانترین گەلی گەیاند بە چڵەپۆپەی ژیانو بەرزترین پلەی زانیـاریی ، لەکاتێکا کە جیهان لـــە دەریای نادانییدا نوقوم بووبوو •

شەشەم : پاکیی قورئانە لـە هەموو هەڵەو دژایـەتی « تناقض »یـەك ، بەپێچەوانەی نووسینی ئادەمیی ، ئێمە کە تەماشا ئەکەین هەرچی زانا گەورەکان هەیە لـە جیهانا کـە کتێبێك دائەنێن ، لەپێشەوە بیری لێئەکەنەوە ، ئنجـا ئەینووسن ، ئنجا چاوی پیائەخشێنن ، وە جارو دووجارو دەجار بژاری ئەکەن ، وە هەرچی هەڵەیەکی تیابێ راستی ئەکەنەوە ، ئنجا سەرلەنوێ ئەیخەنەوە سەر کاغەزو قەڵەمی تێئەبەن ، ئنجا لەچاپی ئەدەنو بڵاوی ئەکەنەوە ، کەچی کە لێی وورد ئەبیتەوە هێشتا گەلێك هەڵەو ساتمەو پاشوپێشی تیایە ، نەخوازەلا نوسراوێك کە ماوەیەکی زۆری بەسەرا تێپەرِرێ ، کەچی کە تەماشای قورئان ئەکەین وا ١٤٠٠ ساڵی بەسەرا تێپەرِریی ، کەچی رۆژبەرۆژ جوانییو رەوانییو راستییو دروستیی دەرئەکەوێ ، وە لەگەڵ هەمووکاتێکا رێكوپێك دەرئەچێ ،

وەك قورئان خۆی ئەفەرموێ « ولو كان من عنـد غير الله لوجدوا فيـه اختلافاً كثيراً » نساء/٨٢ ٠

واتە ئەگەر قورئان لەخواوە نەبوایە دژایەتی زۆری تیادەرئەکەوت ٠

حەوتەم : قورئان لەزۆر ئایەتا باس ئەکات لە ئاسمانو زەوییو رۆژو مانگو ئەستێرەو هەورو باو بارانو دەریاو دارو درەختو ئادەمییو گیانلەبەرانو گەلێشتیتر ، وە ئەمە ١٤٠٠ ساڵی بە سـەرا تێپەرریی ، وە زانینو زانیاریی لەماوەیەدا هەزاران پلە سەرکەوت بێئەوەی قسەیەکی قورئان بەهەڵە دەرچێ ٠

هەروا قورئان پررە لە داستانی پێغەمبەرانی رابوردوو لەگەڵ گەلەکانیانو مێژووی کۆنیـان ، وە ئەمە ١٤٠٠ سـاڵە بەهۆی کۆڵینـەوە « حفريات »ی زەوییەوە ، هەزاران شتی نوسراو دۆزراوەتەوەو بەڵگە دەرکەوتووە ، بێئەوەی قسەیەکی قورئان هەڵبوەشێنێتەوە ، یا فەرمودەیەکی بەدرۆ بکەوێتەوە ، بەڵکو تا بەڵگە زۆرتر دەرکـەوێو نوسراو زیاتر بدۆزرێتـەوە فەرمایشـی قورئان راستتر دەرئەچێ ٠

هەشتەم : قورئان پررە لـە خەبەردان لە غەیبەوە کـە لەدوای هاتنـە خوارەوەی ئەو ئایەتانە بە دە ساڵ ، یا سەد ساڵ ، یا هەزار ساڵ ، یا هەزارو چوارسەد ساڵ هاتوونەتە دیی ، ئەبێ هیواش ببێ کە لەمەولا بێتەدیی ٠

أ ـ ئەم ئایەتەیە کە ئێستا تەفسیری ئەکەین کـە فەرمووی « فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا » ٠

واتە ئەگەر نەتانتوانی بە وێنەی قورئان تاقە سوورەتێك بڵێن ـ کە هەر ناشتوانن ـ کەواتە بزانن کە ئەم قورئانە سرووشی خوایە ٠ ئەمە ١٤٠٠ ساڵ تێپەرریی بەسەر ئەم خەبەرەدا ، بێئەوەی یەکێـك بتوانی ئەمقسەیە بەدرۆ بخاتەوە ، یا بتوانێ لەشێوەی قورئان دێرێك بڵێ ، یا لەم هەمووشتانەی کە بە زبانی عەرەبیی نوسراوون تا ئەمررۆ یەکێکیان لەسەر شێوەی قورئان بێ ٠

ب ـ ئەم ئایەتەیە ، کە بە پێغەمبەر ئەفەرموێ « وَاللهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ » مائدة/٦٧ ٠

واتە خوا ئەتپارێزێ لە دەست درێژیی مەردوم •

تا ئەم ئایەتە نەهاتبوە خوارەوە ، هەرشەوەی یەکێك لە مسڵمانەکان پاسی پێغەمبەری ئەکرد ، بەڵام کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەر فەرمووی : ئیتر پێویستم بە کەس نەما ، چونکە خوا ئاگاداریم ئەکات ، ئەم ئایەتە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەمە سرووشی خوایە ، ئەگینا یەکێك چۆن ئەتوانێ لە خۆیەوە ئەمە بڵێ لەکاتێکا کە بچێ بەگژ بیرو باوەرری گەلێکی یاخیی سەرکێشی سەررەقا ، وە پلار بگرێتە خۆیانو خوایانو ئایینیان ، وە ئەوگەلە بەجارێك دوژمنی بن ، وە بەخوێنی سەری تینو بن ، وە لەگەڵ گاوورو جوولەکەو ناپاکانی ئەو وولاتەدا هەمیشە خەریك بن بۆ کوشتنو لەناوبردنی ، یەکێك ئەگەر لەگەڵ خواشا ئەم درۆیە بکات ، ناتوانێ لەگەڵ خۆیا درۆیوا بکات •

ج ـ ئەم ئایەتەیە ، کە ئەفەرموێ « وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ ، وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ ، وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا » نور/٥٥ •

واتە خوا بەڵێنیداوە بەوانەی کە بررووایان هێناوە لە ئێوە ، وە کردەوە باشەکانیان کردووە ـ کە ئەیانکات بە جێنشین لەسەر زەویی ، وەك ئەو گەلانەی کە لەپێش ئێوەدا کران بە جێنشین ( وەك یونانو رومان ) ، وە ئاینەکەیان بۆ جێگیر ئەکات ، ئەو ئاینەی کە بۆی پەسەند کردوون ، وە دڵنیایان ئەکات لەدوای ترس ( و بیم ) •

ئەم ئایەتە لە سەرەتای کۆچکردنی پێغەمبەرو یارانی بۆ مدینە ، وە لەکاتێکا هاتۆتە خوارەوە کە مسڵمانەکان لەترسانا بە چەکی خۆیانەوە ئەنوستن ، وە لە تەنگانەیەکا بوون نەیانئەوێرا بەئاشکرا نوێژ بکەن ، وە ئەیانووت : ئاخۆ رۆژێك بێ کە بەبێترس بتوانین خوا پەرستیی بکەین ، سەد ساڵی پێنەچوو

کە لە رۆژهەڵاتەوە تا رۆژئاوا ، وە لـە قازانو سنووری مۆسکۆوە تا دەریای هیندیی مسڵمان بوون ، وە کەوتنە ژێردەستی مسڵمانەکانەوە ، وە بوون بە خاوەنی بەشی زۆری جیهانی ئەورۆژە •

د ـ ئەم ئایەتەیە ، کە ئەفەرموێ « مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أبا أحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ ، وَلكِنْ رَسُولَ اللهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ » أحزاب/٤٠ •

واتە محمد باوکی کەس نی‌یە لەپیاوانی ئێوە ، بەڵام پێغەمبەری خوایە ، وە دواهەمینی پێغەمبەرانە ( کە ئیتر پێغەمبەری‌تری بەدوادا نایەت ) •

لەپێش هاتنی پێغەمبـەری ئیسلاما ، باو بووە هـەر لەناو چەند سـاڵێکا پێغەمبەرێکی تازە هاتووە بە ئایینێکی تازەوە ، ئنجا ئەگەر ئەم‌خەبەرە لەخواوە نی‌یە پێغەمبەر چۆنی زانی کە لەدوای خۆی پێغەمبەرێکی‌تر نایەت ، وە ئـەم دەستوورو باوی پێشووە نامێنی • ئەمە ١٤٠٠ ساڵ تێ‌پەرریی بەسەر ئەم خەبەرەدا هێشتا پێغەمبەرێکی راستەقینە بەدوای پێغەمبەرا نەهاتووە ، وە ئەم معجزەیـە لەکاتی پێغەمبەرا دەرنەکەوتووە ، بەڵام دوای ئەو تا رۆژگار دوور بکەوێتەوە ئەم معجزەیە باشتر روون ئەبێتەوە •

هـ ـ ئەم ئایەتەیە ، کە ئەفەرموێ « وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لا تَعْلَمونَ » النحل/٨ •

واتە ئەسپو ئێسترو کەرمان بۆ دروست‌کردن تا سواریان بن ، وە بین بە مایەی جوانیی ، وە شتی‌واتان بۆ دروست ئەکات کە ( ئێستا ) نایزانن •

بەراستی لـەدوای هاتنـە خوارەوەی ئـەم ئایەتە بە ١٣٠٠ سـاڵ خوا رێ‌نموونیی ئادەمیی کرد بۆ دروست‌کردنی فررۆکـەو باڵۆنو ئوتومەبیـلو شەمەندەفەرو پاپۆرری گەورەو ژێردەریایی « غواصە »و گەلێ شتی‌تری‌وا کە ئادەمیی بەکاری‌بێنێ بۆ سـوارببوونو جوانیی‌و رێگابررینو بارو بارخانـە گواستنەوە •

و ـ ئەم ئایەتەیە ، کە ئەفەرموێ « قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلى أنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذاباً مِنْ فَوْقِكُمْ أو مِنْ تَحْتِ أرْجُلِكُمْ ، أو يَلْبِسَكُمْ شِيَعاً وَيُذيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ » انعام/٦٥ •

واتە بڵێ ( ئەی محمد ) خوا بەدەسەڵاتە کە سزاتان بۆ بنێرێ لە ژوور سەرتانەوە ، یا لەژێر پێتانەوە ، یا بتانکات بـە دەستە دەستەی زۆرو أحزابی ناکۆك ، وە بچەژێ بە هێندێکتان سزای ئەوانیکەی‌ترتان •

دوای ١٣٥٠ ساڵ مەعنای ئەم ئایەتە هاتە دی‌ی لە جەنگی تێکرایی یەکەم‌و دووهەما کە بە بۆمبا لەئاسمانەوە ، وە بە ژێردەریایی‌و لەغەم لە ژێرپێوە جیهانێك وێران‌کرا ، یا بەهۆی مبادیء جوێ‌جوێ‌وە ، چوون بەگژیـەکا ، وە چەکی ئاگرینی خۆیان خستەکار ، تا یەکتری‌یان قڕرکرد •

ئەمانەو دە ئەوەندەی‌تر لـە قورئانا بەڵگەو نیشانەن لەسەر ئەوەی کـە قورئان سرووشێکی خوایی‌یە ، چونکە خوا نەبێ کەسی‌تر ئەمانەی نەزانیوە ، وە ئاگای لە پاشەرۆژ نەبووە •

نۆهەم : زۆر معجزەی علمی هەیە لە قورئانا کە لەکاتی خۆیا نەزانراوون ، وە کەس تێی‌نەگەیشتوون ، بەڵکو دوای هاتنە خوارەوەی قورئان بـە هەزارو دووسەد ، یا سێ‌سەد ، یا چوارسەد ساڵ دۆزراونەتەوە لەلایەن زانایانەوە وەك ئەمانەی کە لەمەولا بەکورتیی باسیان ئەکەین :

**پەیدابوونی بوونەوەر :**

زانای ئاسمانیی « سێر جیمس جینز » ئەڵێ : بوونـەوەر لەبنیاتا غازێکی بڵاوبووە لەم بۆشایی ئاسمانەدا ، وە ئەم ئەستێرانە لەو غازە دروست بوون ، قورئانیش ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش ئەفەرموێ « ثُمَّ اسْتَوَى إلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلأرْضِ إئْتِيَـا طَوْعاً أوْ كَرْهاً قَالَتا : أتَيْنَـا طَائِعِينَ » فصلت/١١ •

واتە لەپاشا خوا ویستی ئاسمان دروست‌بکات کە دووکەڵێك بووە ، ئنجا

بە ئاسمانو زەوی ووت : وەرنەروو ، بتانەوێ یا نەتانەوێ ، ئەوانیش وتیان : **وا هاتین بەخۆشیی خۆمان •**

ئنجا توخوا نەخوێندەوارێکی وەك پێغەمبەر ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش ئەمەی چۆن زانی ؟! لەکاتێکا کە بە ١٢٠٠ ساڵیش دوای ئەو کەس ئەمەی بەبیرا نەهاتووە •

**یەکێتی بوونەوەر :**

زانایانی بوونەوەر بەلایانەوە وایە کە هەزاران ملیۆن ساڵ لەمەپێش بۆشایی بوونەوەر پڕبووە لە غاز ، وە ئەو غازە لەیەك پچڕاوە ، وە ئەم ئەستێرەو کاکەشانانەی لێ پەیدابووە ، کە ئێستا تەماشای قورئان ئەکەین ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش ئەفەرموێ « أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا » أنبياء/٣٠ •

واتە ئایا نەیاندیی ئەوانەی بێبڕوا بوون ، کە ئاسمانەکانو زەویی پێکەوەبوونو لەیەکمان پچڕاندوون •

بۆ بەهێز کردنەوەی ئەمقسەیە زانایان ئەڵێن زەوی لە ٩٢ عنصر دروستبووە کە تائێستا ٦٧ی لەرۆژا دۆزراوەتەوە وەك « هایدرۆجین »و « ئۆکسجین »و « نیترۆجین »و « هیلیۆم »و « کاربۆن »و « ئازوت »و « ئاسن »و « فسفور » ••• هەتەد•

لە لایەکیترەوە ئەو ئەستێرانەی کە ئەکشێنو پارچەیان لێئەکەوێتە سەرزەویی ، عنصرەکانی هەر ئەو عنصرانەن کە لەزەوییدا هەن ، لەوانەوە دەرئەکەوێ کە جیاوازیی نییە لە ناوەندی عناصری زەوییو ئەستێرەکانا ، واتە بوونەوەر هەموو وەكیەکن ، وە لە یەكشت دروست کراوون • ئنجا توخوا محمدێکی نەخوێندەوار ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش ئەمەی لەکوێ زانی ئەگەر خوا پێینەووتبێ •

**درێژبوونی شەووڕۆژ لە چوار سەعاتەوە بۆ ٢٤ سەعات :**

زەویی لەدوای ئەوەی کە لەرۆژ پچڕاو تونکڵێکی پەیدا کرد لە هەموو

چوار سەعاتێکا جارێك بەدەوری خۆیا ئەسووڕرایەوە ، وە شەوڕۆژ چوار سەعات بوو ، دوای ئەوەی کە مانگ لە زەویی جیابۆوە ، وە زەویی کەوتە ناوەندی هێزی کێشندەی ڕۆژو مانگەوە ، بەرەبەرە سووڕرانەوەکەی کەمبۆوە تا لە چوار سەعاتەوە هاتە سەر ٢٤ سەعات ، وەك زانای ئاسمانیی « سێرجۆرج دارۆن » و « سێر جینز » ئەڵێن ، کەچی ، کە لە قورئان وورد ئەبینەوە ئەبینین ئەمیش ئیشارەت بۆ ئەم مەسەلەیە ئەکات ، بەمڕەنگە لەپێش پچڕرانی مانگ لە زەوییدا ئەفەرموێ « يُغْشِي اللَّيلَ النهارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً »[1] » .

واتە بەرووناکیی ڕۆژ شەو دائەپۆشێ ( شەو ) دوای ڕۆژ ئەکەوێ بەپەلەو دەستوبرد . وە لەدوای پچڕرانی مانگ لە زەویی ئەفەرموێ « يغشى الليل النهار[2] » بە بێ « « يطلبه حثيثا » کە لەمەوە دەرئەکەوێ کە لەپێش جیابوونەوەی

---

(١) تەواوی ئایەتەکە ، ئەفەرموێ « إِنَّ رَبَّكُمُ اللهُ الَّذي خَلَقَ السَّماواتِ والأرْضَ في سِتَّةِ أيَّامٍ ثُم اسْتَوَى عَلى العَرْشِ ، يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً ، وَالشَّمْسَ وَالقَمَرَ والنُّجُومَ مُسَخَّراتٍ بِأمْرِهِ » اعراف/٥٤ .

واتە پەروەردگاری ئێوە خوایەکیوایە کە ئاسمانانو زەویی دروستکردووە لە شەش ڕۆژا ، لەپاشا لەسەر تەختی حکمڕانی دانیشت ، بە تاریکیی شەو ڕۆژی داپۆشیی ، ( وە شەو ) دوای ڕۆژ کەوت بەپەلەو دەستوبرد ، وە ڕۆژو مانگو ئەستێرەکانی رامکرد بە فەرمانی خۆی .

(٢) تەواوی ئایەتەکە ئەفەرموێ « أللهُ الَّذِي رَفَعَ السَّماوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَها ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرشِ وسَخَّرَ الشَّمْسَ والقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لأجَلٍ مُسَمَّى ، يُدَبِّرُ الأمْرَ يُفَصِّلُ الآياتِ لَعَلَّكُمْ بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ . وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الأرْضَ وَجَعَلَ فِيها رَوَاسِيَ وَأنْهاراً وَمِنْ كُلِّ الثَّمَراتِ جَعَلَ فِيها زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ ، يُغْشِي اللَّيلَ النَّهارَ ، إنَّ فِي ذَلِكَ لآياتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ » رعد/٢ و ٣ .

مانگ لە زەویی شەووڕۆژ بەرودوای یەکتریی هاتوون زۆر بەخێراتر لەدوای پچڕرانی مانگ •

**پچڕرانی مانگ لە زەویی :**

زانایانی ئاسمانیی وەك «سێر جۆرج دارۆن» و «سێر جینز» ئەڵێن : هەروەك زەویی کاتی خۆی لــە رۆژ پچڕراوە ، مانگیش لە زەویی پچڕراوە ، چونکە زەویی پێش ئەوەی مانگی لێجیابێتەوە ـ سووڕراوەتەوە بە گردی خۆیا زۆر بەخێرایی ، وە بە چوار سەعات چەرخەیەکی تەواو کردووە ، ئنجا لەبەرئەوەو لەبەر هێزی کێشندەی رۆژ ، لەسەر رووی زەویی لەعاستی دەریای هادیی‌و هیندیی‌و ئەتلەسین زەویی هەڵتۆقیوەو پچڕراوە ، وە ئەو پارچە گەورەیە لــە زەویی جیا بۆتەوە ، وە بەدەوری خۆیا سووڕراوەتەوە ، هەروەك بەدەوری زەوییشا سووڕراوەتەوە ، وەك قورئان ئیشارەتی بۆ ئەکات ئەفەرموێ « أَوَ لَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنْقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا » رعد/٤١ •

واتەئایا نەیاندیی ( کــە فەرمانی ) ئێمــە دێتە سەرزەویی لــە قەراغ‌و بیجارڕییەوە لێی کەم ئەکەینەوە •

**فراوانبوونی بوونەوەر :**

زانای ئاسمانیی دکتور « هابل » ئەڵێ : قــەبارەی بوونەوەر دەم‌بــەدەم گەورەتر ئەبێ ، بەم‌رەنگە ئەم هەموو کاکەشانانەی کە بەئاسمانەوەن هەناسە بــە هەناسە لەیەك دوور ئەکەونەوە ، وە لە تاریکستانی نەبوون « عدم » بەرەبەرە رووناك ئەکەنەوە ، واتە قەبارەی رووناکیی ، رۆژبەرۆژ گەورەتر ئەبێ •

---

= واتە خوا خوایەکی وایە کە ئاسمانەکانی بەرز کردۆتەوە بە بێ‌کۆڵەکەیەك کە تۆ بیبینیت ، لەپاشا لەسەر تەختی حکمرانیی دانیشت ، وە رۆژو مانگی رامکرد ( بەم‌رەنگە ) هەریەکێکیان دێن‌و ئەچن تا ماوەیەکی ناوبراو ، تەدبیری هەمووکارێك ئەکات ، درێژە بە ئایەتانی قورئان ئەدات بەڵکو ئێوە بێ‌گومان بن لە گەیشتن بــە خزمەت خوای خۆتان ، وە هەر ئەوە کــە زەویی راخستووە ، وە کێوەهاو رووبارەهای تیا دروست کردووە ، وە لە هەموو میوەیەك نێرو مێی تیا دروستکردووە ، بە تاریکیی شەو رۆژ دائەپۆشێ ، بێ‌گومان لەم ئایەتانەدا نیشانەی رۆری تیایە بۆ گەلێك کە بیر بکاتەوە •

« سێر جینز » ئەڵێ قەبارەی بوونەوەر لە یەکەم رۆژی دروستبوونیا چەندە بووە ئەمرۆ دە ئەوەندەیە ، کە تەماشای قورئان ئەکەین ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش ئیشارە بۆ ئەم مەسەلەیە ئەکات ئەفەرموێ « وَالسَّماءَ بَنَيْناها بِأَيْدٍ وإنّا لَمُوسِعُونَ » ذاريات/٢٧ •

واتە ئاسمانمان دروست کردووە بە دەست(ی گەورەیی‌و دەسەڵات ) ، وە ئێمە دەم‌بەدەم فراوانتری ئەکەین ، ئنجا ئەگەر ئەمە سرووشی خوا نی‌یە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش ـ کە کەس ئەمەی نەزانیوە ـ ئەو چۆنی زانی ؟!•

**خرریی زەویی :**

١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش قورئان ئیشارە ئەکات بۆ خرریی‌و کوورەویی زەویی بە ئایەتی « يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهارِ ويُكَوِّرُ النَّهارَ عَلَى اللَّيْلِ » زمر ـ ٥ •

واتە ( خوا تاریکیی ) شەو بە کوورەویی ئەهێنێ بەسەر رووناکیی رۆژا ، وە ( رووناکیی ) رۆژ بە کوورەویی ئەهێنێ بەسەر شەوا ، واتە تیشکی رۆژ ئەکەوێتە سەرزەویی بەکورەویی هەروەك ئەکەوێتە سەر مانگ بە کورەویی •

**سووررانەوەی زەوی بەدەوری رۆژا :**

ئێستاش خوێندەوارە کۆنەکان هەروا ئەزانن کە زەویی وێستاوە ، وە رۆژ بەدەوریا ئەسووررێتەوە ، تا لە سەدەی ١٦هـەما زانای پۆلۆنی « کۆبرنیك » دۆزی‌یەوە کە زەویی بەدەوری رۆژا ئەسووررێتەوە ، کەچی کە تەماشای قورئان ئەکەین ١٢٠٠ ساڵ لەپێش‌ئەوا ئەفەرموێ « وَتَرَى الجِبالَ تَحْسَبُها جامِدَةً وهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحابِ ، صُنْعَ اللهِ الَّذي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ » نمل/٨٨ •

واتە تۆ شاخەکان ئەبینیت وائەزانیت کە ووشك وێستاوون ( و ناجووڵێن )

کەچی لەم‌حەوایــەدا وەك هەور ئەڕۆن ، ئــەمە دەستکردی ئەوخوایەیە کــە هەمووشتێکی بە ڕێكوپێك دروست کردووە •

**وورد کردنی ذرە :**

تا سەدەی ١٩هەم زانایان وایان‌ئەزانی کە ذرە نابێ بە دووکەرتەوە ، لە ساڵی ١٨٩٧ زانای انگلیزی « سێر تۆمسۆن » ذرەی لــەت‌کرد چونکــە تەماشــای‌کرد هەموو ذرەیــەك لــە سێ شت دروســت کراوە (١) پرۆتۆن (٢) نیوترۆن (٣) ئەلکترۆن • کە تەماشای قورئان ئەکەین ١٤٠٠ ساڵ لەمە پێش ئیشارە ئەکات بۆئەوەی کە لە ذرە بچوکتر هەیە ، وە هەموو ذرەیەك لە ئاسمان‌و زەویی‌دا لەو سێ شتە دروست‌کراوە ، ئەفەرموێ « وَمَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ ، وَلَا أَصْغَرَ مِنْ ذَلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ » یونس/١١ •

واتە ئەخوا وون‌نابێ لە ئاسمان‌و زەویی‌دا ، نــە هاوسەنگی هەرەوورد پیلەیەك ، وە نە بچووکتر لەو ، وە نە گەورەتر لەو مەگەر ( نوسراوە ) لــە نامەیەکی ڕۆشــنا ( کــە بریتی‌یە لە علمی خوا ) ، ئنجــا توخوا کێ ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش بە پێغەمبەری ووت کە ذرە ئەکرێ بە دووکەرتەوە تا بفەرموێ « ولا أصغر من ذلك » وە کێ پیی‌ووت کە ذرراتی ڕۆژو مانگ‌و ئەستێرەکان‌و زەویی هەموو وەك یەك دروست‌کراوون لە یەك‌شت ، تا لە قورئانا بفەرموێ « من مثقال ذرة في الأرض ولا في السماء » یونس/٦١ •

**نێرو مێ لە هەمووشتێکا :**

جاران هەر ئەوەندە ئەزانرا کە نێرو مێ لــەناو ئادەمیی‌و گیان‌لەبەرانا هەیە ، وە ئەمە نەزانراوە کە هەرچی دارو درەخت‌و گوڵ‌و گیا هەیە هەموو نێرومێ‌یان هەیە ، وە با ، متوربەی مێ لە تۆوی نێر ئەکات ، کەچی کە تەماشای قورئان ئەکەین ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش ئەفەرموێ « وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ » رعد/٣ •

واتە خوا لەناو هەمووجۆرە بەردارێکدا نێرو مێی تیا دروست کردووە ، لەپاشا زانایان بۆیاندەرکەوت کـە کارەبا نێرو مێی هەیە ، وە بەیەك گرتنی ئەمدوانە تەووژمو تەکانی کارەبا پەیدا ئەبێ ، کەچی کە تەماشای قورئان ئەکەین ئەبینین لەپێش ئەم زانایانەدا بە ١٣٠٠ ساڵ ئەفەرموێ « وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ » ذاریات /٤٩ .

واتە نێرومێمان لە هەمووشتێکا دروست کردووە .

بەڵکو ذرە ـ کە بچووکترین شتە ـ دەرکەوتووە کە دوو دڵی زۆر بچوکی هەیە ، یەکێکیان پێی‌ئەڵێن « پرۆتۆن » وە کارەبای گەرمی تیایە ، ئەویتریان پێی‌ئەڵێن « نیوترۆن » وە کارەبای ساردی تیایە ، وە بەدەوریا چەند شتێکی زۆر وورد ئەسووڕرێنەوە کە پێی‌ئەڵێن « ئەلکترۆن » وە لـە چاولێکانێکا سەدها میل ئەبڕێ ، کە ئەم ئەلکترۆنانە کارەبای ساردیان تیایە ، بەراستی هەر خوایە کە ئەم کارە جوانجوانانە ئەکات وەکو ئەفەرموێ « سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنْبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنْفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ » یس/٣٧ .

واتە پاکیی لـە هەمو کەموکووڕی‌یەك بۆ ئەوکەسەیە کـە نێرو مێی دروست کردووە لە هەرچی کە زەویی بی‌ڕروێنێ ، وە لە خودی مەردومانا ، وە لەوشتانەشدا کە نایزانن .

**متوربەکردنی هەوور :**

زانای بەناوبانگ « فەرەنگلین » لە ساڵی ١٧٥٢دا دۆزی‌یەوە کە هەور کارەبای تیایە ، یا سارد یا گەرم ، هەورێك کە هەر کارەبای سارد یا هـەر کارەبای گەرمی تیابێ جگە لەوە کە نابارێنێ ئەش‌ڕەوێتەوە ، بەڵام کە خوا ویستی بارێنێ ، بەهۆی بای ئەو پارچە هەورانەی کە کارەبای ساردو گەرمیان تیایە نزیکیان ئەخاتەوە لەیەك تا تێکەڵیان ئەکات ، وە کارەباکانیـان متوربە ئەبن ، ئەوجەلە ئنجا دەست‌ئەکات بـە بارین وەك قورئان ئەفەرموێ « وَأَرْسَلْنَا

الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ »
حجر /٢٢ •

واتە بامان لە هەموولایەکەوە نارد بە ستوربەکەر ئنجا ئاومان لە ئاسمانەوە
نارده خوارەوەو پێمان نۆشین •

**تا بەرەوژوورتر ببیتەوە ئۆکسجین کەمتر ئەبێتەوە :**

جاران کەس نەی‌ئەزانی کە تا لەزەویی بەرزتر ببیتەوە رووەو ئاسمان ئۆکسجینی هەوا کەمتر ئەبێتەوە ، وە هەناسەت بەگران بۆ ئەدرێ ، بەڵام لەپاش پەیدابوونی فڕۆکەو باڵۆن ئەمە زانرا ، کەچی قورئان ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش ئیشارە بۆ ئەمە ئەکات ئەفەرموێ « فَمَنْ يُرِدِ اللهُ أَنْ يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ ، وَمَنْ يُرِدْ أَنْ يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقاً حَرَجاً كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ » أنعام/١٢٥ •

واتە هەرکەسێك خوا بی‌یەوێ رێنمونیی بکات سنگ ( و دڵی ) گوشاد ئەکات بۆ ئیسلامی‌یەت ، وە هەرکەسێکیشی بوێ گومڕای بکات سنگی قورس ئەکات وەك بەتەکان سەرکەوێ بەئاسمانا ، ئنجا ئەگەر ئەمە سرووشی خوا نی‌یە محمدێکی نەخوێندەوار ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش ئەمەی لەکوێ زانی ؟!

**دەرچوون لە هێزی کێشندەی زەویی‌و ئەستێرەکان :**

لەمانە لە هەمووی سەیرتر ئەم ئایەتەیە کە ئیشارەت ئەکات بۆئەوەی کە ئەگونجی لەمەولا ئادەمیی لە هێزی کێشندەی زەویی یا ئەستێرەکان دەرچن ، ئەفەرموێ « يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ تَنْفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانْفُذُوا لَا تَنْفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ»
الرحمان /٣٢ •

واتە ئەی کۆمەڵی پەرییو ئادەمیی ئەگەر ئەتوانن دەرچن لــە کەناری

وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ

وە مژدە بدە ( ئەی محمد ) بەوانەی کە برروایان هێناوەو کردەوەباشەکانیان کردووە

ئاسمانانو زەویی فەرموو دەرچن ، ( واتــە ئێستا ناتوانن ، وە لەمەولاش ) دەرناچن مەگەر بەهێز (ی زانیاریی ) و دەسەلات (ی دارایی ) •

بەلێ مەعنای ئەم ئایەتە لە سالی ١٩٦١دا هاتەدیی ، وە دەولەتی رووس یەکەمجار « گاگارین »ی دەرکرد لە هێزی کێشندەی زەویی بۆ شوێنێك کە قورسایی شتی تیا نامێنی ، وە دووری خستەوە لێی بەجۆرێك کــە بە گردی زەویی‌دا بسوورێتەوە ، دوای ئەو ئنجا ئەمریکا ناردی •

توخوا ئەمە لەوانەیە ١٤٠٠ سال لەمەپێش بەبیری کەســا بێ چجای محمدێکی نەخوێندەوار ، ئەمە ئەگەر سرووشی خوا نەبی چی‌ترە •

ئەمانە هێندێکن لە معجزاتی قورئان کــە سەد ئەوەندەی‌تری هەوە ، وە هەریەکەی لە شوێنی خۆی باسی ئەکــەین خوا یار بێ ، کەوابوو ئیعجازی قورئان هــەر لەرووی وێژەکەیەوە نی‌یە ، کــە لەکاتی هاتنــە خوارەوەیا رەوانبێژانی عەرەب هەستیان پی‌کردووە ، بەلکو لە گەلێ لای‌ترەوەیە کــە تا جیهان پێش‌بکەوێو زانین سەربکەوێ ، بەرەبەرە ئەوانیش دەرئەکەوون ، کە ئەمە هەر لە تەوانای خوادایە بۆیە قورئان ئەفەرموێ «قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الْانْسُ والجِنُّ عَلَى أنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ ولَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرا » اسراء /٩٠ •

واتە بلێ ( ئەی محمد ) ئەگەر هەرچی ئادەمیی‌و پەری هــەیە کۆببنەوە بۆئەوەی کە بەوێنەی ئەم قورئانە بێنن ، وێنەی ناهێنن با هێندێکیشیان پشتیوانی هێندێکیان بن •

* * *

لەدوای باسی سزای بێ‌برروایانو ئەو ئاگری دۆزەخەی کە بۆیان ئامادە کراوە ، ئنجا باسی برروادارانو ئەو نازو بەهرانە ئەکات کە بۆیان دانراوە ، ئەفەرموێ ( وبشر الذين آمنوا وعملوا الصالحات ) مزگێنی بدە ئەی محمــد

أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ، كُلَّمَا رُزِقُوا مِنْهَا مِنْ ثَمَرَةٍ رِزْقًا قَالُوا : هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِنْ قَبْلُ ، وَأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهًا ، وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ ، وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٢٥)

---

کە بێگومان بۆ ئەوان هەیە بەهەشتانێك کە جۆگە ئاوی زۆر بەژێریانا ئەڕروات، هەرچەند لـەوێ خواردەمەنی‌یەکیان بدرێتێ لـە میوەهات ئەڵێن ئەمە ئەوەیە کەتۆزێ لەمەپێش دایانینێ ، وە ئەو خواردەمەنی‌یانەیان بۆ ئەهێنرێ لە وێنـەی یەکتری‌یدا ، وە بۆ ئەوان هەیە لەو بەهەشتانەدا ژنانی پاکیـزە ، وە ئەوان تی‌یانا هەتا هەتایین (٢٥)

---

بەوانەی کە برروایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردووە ( أنَّ لهم جنـات تجري من تحتها الأنهار ) کە بۆ ئەوان هەیە بەهەشتانێك کە بەژێریانا ئەڕروات جۆگـە ئاوی زۆر ( كلّما رزقوا منهـا من ثمرة رزقا ) هەرچـەند لـەوێ خواردەمەنی‌یەکیان بدرێتێ لە میوەهات ( قالوا : هـذا الذي رزقنا من قبل ) ئەڵێن : ئەمە ئەوەیە کە تۆزێك لەمەپێش دایانینێو خواردمان ( وأتوا به متشابها ) وە ئەو میوەهاتو خواردەمەنی‌یانەیان بۆ ئەهێنرێ لە وێنەی یەکتری‌یدا ، واتـە هەموو میوەیەکی بەهەشت ئەوەندە جۆری زۆرە بەوێنە ئەگۆڕرێن لە بەهەشتیی بەڵام بە تام جیائەبنەوە ( ولهم فيها ازواج مطهرة ) وە بۆئەوان هەیە لەوبەهەشتانەدا ژنانی پاكو تمییز ( وهم فيها خالدون )وە ئەوان لەو بەهەشتانەدا هەتاهەتایین •

لە زۆرشوێن لە قورئان ناوی بەهەشتو دۆزەخ دێ کە یەکەمیان جێی چاکانو دووهەمیان جێی خراپانو بێبرروایانە ، ئێمە کە مسڵمانین برروامان پێیانە ، بەوڕەنگەی کە قورئان باسیان ئەکات ، بەڵام ئەمە کە بەراستیی چینو چۆنن ، وە خۆشیی‌و ناخۆشی‌یان چۆنە ؟ ئەوە هەر خوا خۆی ئەیزانێ •

* * *

ئەوەبوو لە سەرەتای سوورەتەکەوە دەربارەی قورئان فەرمووی « ذلك الكتاب لا ريب فيه » واتە ئەم قورئانە هیچ گومانێکی تیانییە ، کە فەرموودەی خوایە ، لەپاشا بەئایەتی « وان كنتم في ريب مما نزلنا » بێ بڕوایانی دەستەوسان کرد لە دانانی سوورەتێکی وەك قورئان ، ئیتر ناپاکو بێبڕرواو جوولەکەکان هیچیان بۆ نەمایەوە رەخنەگیریی نەبێ لە قورئان .

ئەو ناپاکانەی کە خوا لە سەرەتای سوورەتەکەوە دەربارەیان فەرمووی « مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الذي اسْتَوْقَدَ ناراً »وە فەرمووی « أوكَصَيِّبٍ مِنَ السَّماءِ فيهِ ظُلُماتٌ وَرَعْدٌ وبَرْقٌ » ـ ئەیانوت : ئەمانە چین کە خوا ئەیانکات بە نموونە «مثال» ، وە جوولەکەو بێبڕرواکانیش ئەیانووت : خوا چۆن شەرمناکات نموونە ئەهێنێتەوە بە مێشو جاڵجاڵۆکە ، وە ئەمانە چین کەخوا بەم هەموو گەورەییەوە نموونەیان پێ بێنێتەوە لە ئایەتی «إنَّ الَّذينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُباباً وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ ، وإنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبابُ شَيْئاً لا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ، ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ»(١) حج /٧٣ .

وە لە ئایەتی « مَثَلُ الَّذينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللهِ أوْلِياءَ كَمَثَلِ الْعَنْكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتاً ، وَإنَّ أوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنْكَبُوتِ لَوْ كانُوا يَعْلَمُونَ »(٢) عنكبوت/٤١ .

وە بەمڕەنگە چاووڕاویان ئەکرد دەربارەی قورئان ، وە هەرایەکیان نابۆوە ،

---

١ ، واتە ئەوانەی کە ئەیانپەرستن لە غیری خوا هەرگیز ناتوانن مێشێك دروست بکەن ، با هەموولایەکیشیان بۆی کۆببنەوە ، وە ئەگەر مێشێك شتێکیان لێبفڕێنێ ناتوانن لێی بسێننەوە ، هاوارکەرو هاوار لێکراو ( هەردوولا ) زەبوونن .

(٢) واتە داستانی ئەوانەی کە دۆستو پشتیوانیان گرتووە بەبێ خوا وەك جاڵجاڵۆکە وان کە خانوویەکی دروستکردبێ ، کە بەراستی نابووتترینی خانووان خانووی جاڵجاڵۆکەیە ئەگەر تێبگەن .

إِنَّ اللهَ لا يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلاً مَا ، بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ، فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ ، وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَيَقُولُونَ : مَاذَا أَرَادَ اللهُ بِهَذَا مَثَلاً ،

---

بێ‌گومان خوا شەرم ناکات لەوەی کە ( بۆ تێگەیاندنی مەردوم ) نموونە بێنێتەوە بە مێشوولەو پچوکتر لەو ، ئنجا ئەوانەی کە برروادارن ئەزانن کە ئەو نموونە هێنانەوەیە راستو دروستە لە پەروەردگاریانەوە ، وە ئەوانەی کە بێبرروواشن ئەڵێن : خوا چیویستووە بەم نموونە هێنانەوەیە ،

---

وە خواش ویستی تێیان بگەیەنێ کە مەبەس لە نموونە هێنانەوە روون کردنەوەی ئەو باسانەیە کە نموونەکەیان بۆ ئەهێنرێتەوە ، وە نیشاندانی شتی نەبینراوە لە کاڵای بینراوا ، ئیتر نموونەکە بە مێشو مێشوولە بێ ، یا بە شتێکی پچووکتر بێ ، فەرمووی ( ان الله لا یستحي ) خوا شەرم ناکات لەوەی کە بۆ تێگەیاندنی مەردوم ( ان یضرب مثلا ما ، بعوضة فما فوقها ) نموونە بێنێتەوە بە مێشوولەو پچووکتر لەو ، واتە هیچ نەنگێك نابینێ لەمەدا ، چونکە خۆی دروستکەری هەمووشتێکە لە گەورەو پچووك ، وە ئەو معجزەیەی کە لە دروستکردنی فیلو حوشترا هەیە لە دروست کردنی مێشو مێشوولەشا هەیە ، لەگەڵ ئەمیشە کە مەبەس لە ئەمثال گەورەییو پچووکی نییە ، بەڵکو نزیکخستنەوەی مەعنایە لە ژیریو بیرەوە •

( فاما الذین آمنوا ) ئنجا ئەوانەی کەبرروادارن ( فیعلمون أنه الحق من ربهم ) ئەزانن کە ئەو نموونە هێنانەوەیە شتێکی راستو دروستە لە پەروەردگاریانەوە ، وە بۆ روونکردنەوەی باسو نیشاندانی شتی نادیارە لە پەردەی بینراوا •

( واما الذین کفروا )وە ئەوانەی کە بێبرروواشن ( فیقولون ماذا أراد الله بهذا مثلا ) ئەوا ئەڵێن : خوا چی مەبەسە بەمنموونە هێنانەوەیە کە شایستە نییە

يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً ، وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلاَّ الْفَاسِقِينَ (٢٦)

زۆرکەسی پێ گومرا ئەکات وە ڕێنموونیی زۆرکەسیشی پێ ئەکات ، وە گومرا ناکات بەو نموونە هێنانەوەیە مەگەر بەدکاران (٢٦)

بۆ ئەو باسکردنی •

ئنجا خوا وەرامی ئەم پرسیارەیان ئەداتەوە لە پەردەی هەررەشەدا ئەفەرموێ ( یضل به کثیرا ) زۆرکەس گومرا ئەکات بەو نموونە هێنانەوەیە ( ویهدي به کثیرا )(١) وە ڕێنموونیی زۆرکەسیشی پێ ئەکات •

خوا زۆرجار بەندەی خۆی تاقی ئەکاتەوە ، وە هەموو بەندەیەك ئەچێ بەپیر ئەو تاقی کردنەوەیەوە ، بەپێی ئامادەیی « استعداد » خۆی ، وە بەپێی ئەو ڕێگایەی کە لەژیانیا گرتوویەتی ، مەسەلا ، تەنگانەو چەڵەمە ئەدا بەسەر زۆرکەسا ، ئنجا ئەوەی خاوەن برروابێ ئەچێ بەپیر ئەو تەنگانەیەوە بەسنگێکی فراوانەوە ، وە زۆرتر نزیکی ئەخاتەوە لە خوا، بەڵام ئەوی ناپاكو بەدکار بێ بەو تەنگانەیە بیروباوەرری ئەکەوێتە لەقەلەق • یا دەوڵەمەندیی ئەررێژێ بەسەر زۆرکەسا ، ئنجا ئەوی برروادار بێ زۆرتر لە خوا نزیك ئەکەوێتەوە ، وە زۆرتر سوپاسو ستایشی ئەکات ، بەڵام بەدکار پێی یاخی ئەبێو لە ڕێ لائەدات ، هەر بەورەنگە ئەو مثالانەی کە خوا ئەیانهێنێتەوە لە قورئانا ئەبێ بە مایەی سەرگەردانیی ئەوانەی کە ناپاكو بەدکارن ، وە پەیوەندییان لەگەڵ خوادا نییە ، وە ئەبێ بە ڕێنموونیش بۆ ئەوانەی کە لە کاری خوا وورد ئەبنەوە ، وە فەلسەفەی فەرموودەکانی ئەدۆزنەوە •

لەبەرئەوەی کە تەعبیری « یضل » وا ئەگەیەنێ کە مثالەکانی خوا مایەی ئەو گومراییەیە ، هات بۆ لابردنی ئەو بیرە فەرمووی ( وما یضل به الا الفاسقین ) گومرا ناکات بەو نموونە هێنانەوەیە مەگەر ئەو بەدکارانەی کە

(١) لە تەفسیری « یضل الله من یشاء ویهدي من یشاء »دا شتێکی جوانم نووسییوە لە سوورەی « مدثر »دا بچۆ تەماشایکە •

الَّذِينَ يَنْقُضُونَ عَهْدَ اللهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ ، وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ

ئەوانەی کە پەیمانی خوا ئەشکێنن دوای بەستنی ، وە ئەوەی کە خوا فەرمانی داوە بە پەیوەستیی کردنی ئەیپچڕێنن ،

خۆیان لەوەپێش لایان‌دابێ لەرێی راست ، واتە مایەی گومرایی‌یەکەیان لادانی خۆیانە لە دەستوورو باوی خوا ، بەم‌رەنگە لەجیاتی ئەوەی لە فەلسەفەی مثالەکە وورد ببنەوە کەچی بەپچووکیی مێش‌و جاڵجاڵۆکەوە خەریك ئەبن ، وە خوردەگیریی ئەکەن لە قورئان ، وە لێکی نادەنەوە کە گەورەیی خوا هەروەك لە دروست‌کردنی شتی گەورەدا دەرئەکەوێ ، لە دروست‌کردنی شتی پچوکیشا هەروا دەرئەکەوێ ، بەڵکو لای مەردومی زانا جیاوازیی نی‌یە لە ناوەندی کۆمەڵەی رۆژیی « مجموعەی شمسی »و پچووکترین پارچە لە خاك •

ئنجا دێ بەباسی سیفەتی ناشرینی ئەو گومرایانەدا ئەفەرموێ ﴿ الذین ینقضون عهد الله ﴾ ئەوانەی کە پەیمانی خوا ئەشکێنن ﴿ من بعد میثاقه ﴾ دوای بەستنی ئەوپەیمانە •

پەیمانی خوا لەگەڵ بەندەگانیا ئێجگار زۆرە ، وە ئەوانە پەیمانی سروشتیین کە لە دڵو دەروونی هەموو مەردوومێکا هەن •• وەك ئەوەی کە ئەبێ خوای خۆی بناسێ ، وە بی‌پەرستێ ، وە برروای بە پێغەمبەری خوا بێ ، وە لە ئایین‌و شەرعی نەچێتە دەرەوە ، هەرکەسێك یەکێکی لەمانە شکاند ئەوا پەیمانی خوای شکاند ، وە هەرکەسێکیش پەیمانی خوا بشکێنێ ئیتر هەموو پەیمانێکی‌تر ئەشکێنێ •

﴿ ویقطعون ما أمر الله به أن یوصل ﴾ وە ئەوەی کە خوا فەرمانی داوە بە پەیوەندیی کردنی ئەوان ئەیپچڕێنن •

خوا فەرمانی‌داوە بە گەلێ پەیوەندیی وەك پەیوەندیی لەگەڵ خزمان‌و

وَيُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ (۲۷) كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللهِ وَكُنْتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ

وە خراپە ئەکەن لە وولاتا هەر ئەوانن زەرەرمەند (۲۷) چۆن بێبڕروا ئەبن بەخوا ؟ لەکاتێکا کە بێ گیان بوونو گیانی کردن بەبەرا ،

خوێشانو دۆستو برادەرانو برای ئایینیو هەموو هاوتەحرێك ، کە یەکێك لەمانە پچڕێنرا ، ناکۆکیی پەیدا ئەبێ ، وەکو ئەفەرموێ ( ویفسدون في الأرض) وە خراپە ئەکەن لە وولاتا بە بڵاوکردنـەوەی بێبڕروایی‌و دەستدرێژیی‌و پشت‌گوێ خستنی رێنموێیی ژیریی‌و بیروئایین‌و دوورکەوتنەوە لە شەرعی خوا ، هەرکەسێك وابێ ئەوە خراپە بۆ خۆشیی‌و بۆ کۆمەڵەشی ( اولئك هم الخاسرون ) هەرئەوانن زەرەرمەند لە هەردوجیهانا ، کەوابوو مایەی گومڕایی ئەمانە خراپیی خۆیانە ، وە گومڕاکردنیان تۆڵەی کردەوەی خۆیانە •

* * *

لەدوای ئەوەی کە یەك‌بەیەك گوناهی ئەو بێبڕروایانەی باس‌کرد کـە مایەی خەشـم‌و قینی خوایە ، ئنجا پێیان ئـەڵێ ( کیف تکفرون بالله ) چۆن بێبڕروا ئەبن بەخوا ؟ ( وکنتم أمواتا ) لەکاتێکا کە لەپێش ئەوەی بێنە جیهانەوە ئێوە مردوو بوون ، واتە عنصرەکانتان لەناو زەویی‌دا پەرش‌و بڵاو بوو ، بەم‌رەنگە هێندێکی لەناو خاك‌و هێندێکی لەناو ئاوو هێندێکی لەهەوادا بوو ، لەپاشا کـە دروستی کردن ( فأحیاکم ) گیانی کردن بەبەرا •

زەویی کە لە رۆژ پچڕاوە ، پشکۆ ئاگرێکی گەورەی هەڵگیرساو بووە ، لەپاش هەزاران هەزار ساڵ کووژاوەتەوەو خۆڵی لێ‌نیشتووە ، وە گیان ، لەبەر هیچ‌شتێکا نەبووە ، لەپڕ گیـان پەیدا بوو لە سەرزەویی ، ئـەم گیانە چی‌یە لەکوێوە هات ؟ وە کێ هێنای ؟ وە چۆن پـەیدابوو ؟ لێرەدا زۆر قسە کراوە ، بەڵام هیچیان ناچنەسەر ، تەنیـا ئەوە نەبێ کـە بڵێین لەخواوەیـە ، وە خوا ناردوویەتی ، وە لەم‌وەرامە باشترو راست‌تر نی‌یە •

ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ، ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ، ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ؟ (٢٨) هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً ، ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ ،

---

لەپاشا ئەتانمرێنێ ، دوای‌ئەوە زیندووتان ئەکاتەوە ، ئنجا ئەچنەوە بۆلای خۆی (٢٨) لەپاشا ویستی ئاسمان دروست بکات ئنجا رێکی‌خستن بە حەوت ئاسمان ،

---

( ثم يميتكم ) لەپاشا ئەتانمرێنێ ، وە جەستەتان لەیەك هەڵئەوەشێنێ ، وە هەرشتەی تێکەڵ ئەکاتەوە بە کانگای خۆی ، بەم‌رەنگە ئەوی لە خاکە ، ئەبێتەوە بە خاكو ئەوی لە ئاوە ، ئەبێتەوە بە ئاوو ئەوی لە هەوایە ، ئەبێتەوە بە هەوا ( ثم يحييكم ) لەپاشا زیندووتان ئەکاتەوە لە رۆژی دوایی‌دا •

زۆرکەس لەم زیندووبوونەوەیە سەرسامە ، وە ژیری‌ی‌و بیری نای‌بڕێ ، کەچی لە هاتنە جیهانی یەکەم‌جارا ، سەرسام نی‌یە ، ئەوەندە لێکی‌ناداتەوە بڵێ ئەو خوایەی کە یەکەمجار گیانی هێناوەتە سەرزەویی ، وە لە خاك ئەم ئادەمیی‌و گیان‌لەبەرانەی دروست کردووە ، هەر ئەوخوایە جاری دووهەم زیندووی ئەکاتەوە ، وەکو ئەفەرموێ ( ثم اليه ترجعون ) لەپاشا بۆلای خوا ئەگەڕرێنەوە بۆپرسینەوەو پاداش‌و تۆڵە •

( هو الذي خلق لكم مافي الارض جميعا ) خوا ئەوخوایەیە کە هەرچی لە زەویی دایە دروستی کردووە بۆ ئێوە ئەی ئادەمیی ! تا لێی بەهرەمەند بن ، کەوابوو مەبەس لـە دروست‌کردنی زەویی بەخۆی‌و مانگ‌و رۆژو ئەستێرەـ کانی‌یەوە ، وە بە شەوو رۆژو چوار فەسڵەیەوە ، وە بە دەریاو چەم‌و رووباروو کانی‌و خواردەمەنیی‌و دەستوورو باوێوە ـ هاتنـەدیی ئادەمی‌یە ، تا ببێ بـە جێ‌نشین لەسەر زەویی ، وە ببێ بە خاوەنی زەویی بەخۆی‌و هەموو ئەوشتانەی کە تیایەتی •

لەم ئایەتەو گەلێ ئایەتی‌ترەوە دەرئەکەوێ کە ئادەمیی چەند بەنرخە لەبەرچاوی قورئان‌و ئایینی ئیسلام ، وە چەند قورس‌و گرانە لە ترازووی خوادا •

( ثم استوى الى السماء ) لەپاشـا ویستی ئاسمان دروست بکات ( فسواهن سبع سماوات ) ئنجا رێکی‌خستن بە حەوت ئاسمان • مەبەس لەم حەوت ئاسمانە ،

حەوت ئەستێرەن لەو ئەستێرە گەڕۆکانەی کە بەدەوری ڕۆژا ئەسووڕێنەوە ، وە ئاسمان بن بۆ زەویی ، کە بەهەموویان لەگەڵ ڕۆژو مانگ‌و زەویی‌و زهرەو عطاردا کۆمەڵەی ڕۆژیی « مجموعەی شمسي » وە جیهانی سەرزەویی پێك‌دێنن، لەبەرئەوە هەر ئـەم ئەستێرانە ناوئەبات ، ئەگینا هەزاران هەزار کۆمەڵـەی ڕۆژیی‌تر هەن ، بەڵام لە جیهانی ئێمە نیین .

لەکاتی کلدانی‌یەکانەوە وا زانراوە کـە ئەستێرەی گەڕۆك حەوتن ، ئەویش : « ڕۆژ . مانگ . عطارد . زهرە . مریخ . مشتري . زحل » ن ، کە بەچاو بینراوون ، وە هەریەکەی لەسـەر چەمەرەیەك ئەسووڕێـەوە ، هەروەك لە نەخشە « خریطە »ی زانای بەناوبانگ « بطلیموس »دا کێشراوە ، ئەم زانیاری‌یە هەروا مایەوە لەناوگەلانا چین لەدوای چین تا ساڵی ١٧٨١ ، کە زانای ئاسمانیی « ولیم هرشل » ئەستێرەی « ئەورانووس »ی دۆزی‌یەوە ، وە لە ساڵی ١٨٤٦دا زانای ئاسمانیی « فریە » ئەستێرەی « نیبتۆن »ی دۆزی‌یەوە ، وە ئەستێرەی گەڕۆك بوون بە نۆ ، کەچی کە لە قورئان وورد ئەبینەوە لە گەڵێ لاوە ئەگەیەنێ کە مانگ‌و ڕۆژ لە حەوتەوانەی گەڕۆك نیین ، وە ئەم حەوتەی کە لە زۆرشوێن لە قورئانا ناوئەبرێن بە بێ مانگ‌و ڕۆژن ، کە ئەمەش وایە ، چونکە ڕۆژ دایکی هەموویانە ، وە ئەمان لەو جیابوونەتەوە ، وە بەدەوری ئەوا ئەسووڕێنەوە ، وە مانگیش کچی زەوی‌یە ، وە بەدەوری ئەما ئەخولێتەوە ، یەکێك لەو ئایەتانەی کە ئەمە ئەگەیەنێ ، ئایەتی سوورەی « عنکبوت »ە ، کە ئەفەرموێ « وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّماواتِ وَالأرضَ ، وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللهُ »[1] بەنیشانەی ئەوەی کـە

(١) واتە ئەگەر لێیان‌بپرسییت کە کێ ئاسمانەکان‌و زەویی دروست کردووە وە ڕۆژو مانگی ڕام‌کردووە ؟ ، بێ‌گومان ئەڵێن خوا .

بەجیا ناوی رۆژو مانگ ئەبات ، وە لە حەوتەوانە جیایان ئەکاتەوە ، کەواتە حەوتەوانەی گەرروك ئەبێ « عطارد • زهرە • مریخ • مشتری • زحل • ئەورانووس • نیبتۆن » بن •

لە ساڵی ١٩٣٠دا زانای ئاسمانیی « کلاید تۆمبۆ » ئەستێرەی « پلۆتۆ »ی دۆزی‌یەوە ، وە لە ساڵی ١٩٥٣دا ئەستێرەیەکی گەرروکی‌تر دۆزرایەوە ، وە ئەستێرەی گەرروك ، بەبێ‌زەویی ، بوونەوە بە نۆ ، کەچی کە لە قورئان وورد ئەبینەوە لە هەموولایەکەوە ، یا ئەفەرموێ « سَبْعَ سَمَاوات طِباقاً » وە یا ئەفەرموێ « وَبَنَيْنا فَوْقَكُمْ سَبْعاً شِداداً » واتە دروستمان کردووە لە ژوور سەرتانەوە حەوت ئاسمانی قایمی توندو تۆڵ ، کەواتە قورئان باس لە حەوت ئەستێرەی گەرروك ئەکات کە ئاسمان بن بۆ زەویی ، واتە بە ژوورسەری زەوی‌یەوە بن ، وە لە زەویی دوورتر بن بە رۆژ ، کەوابوو « عطارد » و « زهرە » بەرناکەوون چونکە ئەوان لە زەویی نزیکترن بە رۆژ ، وە لەژێر زوەی‌یەوەن[1] ، بۆیە هەمیشە یا ئێواران دەرئەکەون یا بەیانیان . هەروەك زەویی خۆی بەر حەوتەوانە ناکەوێ ، کەواتە حەوتەوانەیەك کە ئاسمان بن بۆ زەویی ، بەپێی فەرموودەی قورئان « مریخ • مشتری • زحل • ئەورانووس • نیبتۆن • پلۆتۆ • ئەستیرە تازەکە »یە •

رەنگە یەکێك بڵێ ئەگونجێ لەمەولا گەرروکی‌تر بدۆزرێتەوە ، بەلآم مامۆستای ئاسمانیی « محمدی فراتی » ئەڵێ بەپێی نظری‌یەی « مدیە » ـ کە ئەمرۆ لە هەموو نظریەکانی‌تر لەپێشترە ـ ناگونجێ لەم‌گەرروکانە زیاتر بین ، چونکە « مشتری » ـ کە لە هەموویان گەورەترە ـ لەناوەراستیانایە ، وە

---

(١) لە ساڵی ١٩٦٦دا پرسیارم کرد لە بەشی عەرەبی لە نیستگەی لەندن ، وە بۆم‌نووسیین : هەرچەند ئاشکرایە کە لە حەوادا سەرووژێر نامێنێ ، بەلآم ئایا بە مجاز وە بە إعتباری نزیکو دووریی لەرۆژەوە ئەتوانین بڵێین « عطارد »و « زهرە » ، لەژێر زەوی‌یەوەن ؟!!! لە وەراما نووسی‌یانەوە : کە بە مجاز وە بەو إعتبارە ئەتوانن وا بڵێن •

ئەستێرەکانی تر لەلای راستو چەپی یەوەن وەك یەك ، واتە ئەم‌لای پێنجو ئەولای پێنج ، لای راستی لە « عطارد »ەوە دەست پێ ئەکات وە بەرەبەرە گەورەتر ئەبن تا ئەگەنە « مشتری » ئنجا بەرەبەرە دەست ئەکەن بە بچووك‌بوونەوە تا ئەگاتە ئەستێرەتازەکە بەم رەنگەی کەواوێنەکانیان نیشانی ئەدات •




عطارد : ٣٦ ملیۆن میل لە رۆژەوە دوورە ، مانگی نی یە • ساڵی ئەو ٨٨ رۆژی ئێمەیە ، واتە بە ٨٨ رۆژی ئێمە دەورەیەکی رۆژ ئەکات کە ئەوە ساڵێکی ئەوە •

زهرة : ٦٧ ملیۆن میل دوورە ، مانگی نی یە • ساڵی ٧ مانگو نیوی ئێمەیە •

زەوی : ٩٣ ملیۆن میل دوورە ، یەك مانگی هەیە • ساڵی دوانزە مانگە •

مریخ : ١٤٢ ملیۆن میل دوورە ، وە یەکەم ئاسمانە بۆ زەوی ؟ وە دوو مانگی هەیە ، وە ساڵێکی ئەو ساڵێكو دە مانگو نیوی ئێمەیە •

کۆمەڵە ئەستێرە بچووکەکان : ١٩٣ ــ ٣٩٥ ملیۆن میل دوورە ، وە ٤٣٠ ئەستێرەن پێکەوە ، ئەمانە بەر ئەم حەوتەوانەی گەررۆکە ناکەون چونکە یەك ئەستێرەی قایمی بەهێزی توندو تۆڵ نین وەك لە سوورەی « نبأ »دا ئەفەرموێ « وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعاً شِدَاداً » واتە دروستمان کردووە لە ژوور سەرتانەوە حەوت ئەستێرەی قایمی بەهێز •

مشتری : ٤٨٣ ملیۆن میل دوورە ، دوانزە مانگی هەیە • ساڵی ١١ ساڵو ٨ مانگی ئێمەیە •

زحل : ٨٨٦ ملیۆن میل دوورە ، نۆ مانگی هەیە • ساڵی ٢٩ ساڵو چوار مانگی ئێمەیە •

وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٢٩)

وە ئەو ئاگادارە بە هەمووشتێك (٢٩)

ئەورانووس : ١٧٨٢ ملیۆن میل دوورە ، پێنج مانگی هەیە . ساڵی ٨٤ ساڵی ئێمەیە .

نیبتۆن : ٢٧٩٣ ملیۆن میل دوورە ، دوو مانگی هەیە . ساڵی ١٦٤ ساڵو ٨ مانگی ئێمەیە .

پلۆتۆ : ٣٦٧٠ ملیۆن میل دوورە ، وە مانگی بۆ نەدۆزراوەتەوە . ساڵی ٢٢٤ ساڵی ئێمەیە .

ئەستێرە تازەکەی کە لـە ساڵی ١٩٥٣دا دۆزراوەتەوە هێشتا نەزانراوە ناوی چی‌یە ، وە چەندە دوورە لە رۆژەوە ، وە ساڵی چەندەیە ، وە مانگی هەیە یا نی‌یە ؟!

لە ساڵی ١٩٦٦ ئەم پرسیارانەم کرد لە بەشی عەرەبی لە ئیستگەی لەندن بەڵام لە وەرامەکەدا گوێزنز ئەکات ، وە وەرامی ئەم پرسیارانە ناداتەوە .

بەراستی ئەمە معجزەیەکی زۆر گەورەیە بۆ قورئان کە ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش ئەم خەبەرە علمی‌یەی داوە ، وە لەم معجزەیە گەورەتر ئەوەیە کـە بەجۆرێکی‌وای فەرمووە کە هەڵنەتەقێ نە بە زانیاریی کۆنو نە بە زانیاریی تازەدا ، کە لەمەوە دەرئەکەوێ‌زانایی خوا بە هەمووشتێك ، وەکو ئەفەرموێ ( وهو بكل شيء عليم ) خوا ئاگادارە بە هەمووشتێك ، ئنجا کەسێك ئەوەندە زاناو ئاگادار بێ ، چۆن بەرودوا پێغەمبەران نانێرێ بۆسەر ئادەمیی ، تا رێی خواناسی‌یان نیشان بدەن ، وە شاررێی هەردو جیهانیان بۆ رووناك بکەنەوە .

★ ★ ★

لەدوای ئەوەی کە لە ئایەتی پێشوودا فەرمووی هەرچی لە زەویی‌دایە خوا دروستی کردووە بۆ ئادەمیی ، وە رامی ژێردەستی کردووە ، ئنجا باسی دروست‌کردنی ئادەمیی‌و جێ‌نشینیی ئەومان بۆ ئەکات لەسەرزەویی •

باسی دروست‌کردنی ئادەمیی‌و هاتەرووی باسێکی ئێجگار قووڵە ، خوا نەبێ کەسی‌تر بەتەواویی نایزانێ ، ئنجا لەبەرئەوەی کە قورئان بۆ ئادەمیی هاتۆتە خوارەوە بەتێکرایی ، وە قسە لەگەڵ هەموولایەکیان ئەکات کە بەشی زۆریان تا ئەمرۆ نەخوێندەوارە ، وە بەشی کەمیشیان ــ کە خوێندەوارە ــ هەمیشە تابعی بەشی زۆرە لەکاتی ئامۆژگاریی‌دا ، چونکە خوێندەوار لە زمانی نەخوێندەوار ئەگات ، بەڵام نەخوێندەوار نە لە زمانی خۆێندەوار ئەگات ، وە نە یارای ئەوەشی هەیە کە راستیی « حقیقت » ببینێ بەبێ‌پەردە ، چونکە تێی‌ناگات ، وە ناتوانێ بچێتە ژێری ، هەروەك دڵیشی پێی‌ناکرێتەوە ، تا لە کالآیەکی‌وادا نەبێ کە تان‌وپۆکەی بەپێی ژیریی‌و بیری خۆی بێ ، ئنجا لەبەر ئەمانە باسی پەیدابوونی ئادەمیی‌و ئەو گۆرران « تطور »ەی کە بە هەزاران ساڵ بەسەریا هاتووە بۆمان ئەکات لە پەردەی پرسیارو وەراما ، وە حکایەتی مەبەستی نەبینراومان بۆ ئەکات لە پەردەی شتی بینراوا،هەروەك دەستووری قورئان وایە لە هەموو لایەکەوە ، تەماشاکە لە باسی فراوانیی دۆزەخا ئەفەرموێ « یَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلأْتِ ، وَتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ » ق/٣٠ •

واتە لەرۆژێکا کە بە دۆزەخ ئەڵێین : ئایا پرر بوویتەوە ؟ وە ئەویش ئەڵێ :ئایا هی‌تر ماوە ؟

مەبەست لەم‌پرسیارو وەرامە نیشاندانی گەورەیی دۆزەخ‌و فراوانی‌یەتی بەم‌شێوەیە ، ئەگینا نە خوا ئەم پرسیارە ئەکات لە دۆزەخ‌و نە ئەویش ئەم وەرامە ئەداتەوە •

وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ : إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً ،

کاتێك کە پەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی ووت : من جێنشینێك دروست ئەکەم لەسەر زەویی ،

هەروا لە باسی دروستکردنی ئاسمانو زەویی‌دا ئەفەرموێ « ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ إِئْتِيَا طَوْعاً أَوْ كَرْهاً قَالَتَا : أَتَيْنَا طَائِعِينَ » فصلت /١١ ●

واتە لەپاشا خوا ویستی ئاسمان دروست بکات کە دووکەڵێك بوو ، ئنجا بەئاسمانو زەویی ووت : وەرنە روو بتانەوێ یا نەتانەوێ ، ووتیان : وا هاتین بە فەرمانبەریی ●

مەبەست لەمپرسیارو وەرامە ئەوەیە کە فەرمانی خوا رەوایە ، وە هەرچی ویست ئەبێ بێتەدیی ، ئەگینا نەخوا وەختی خۆی ئەم فەرمانەی داوە بە ووتن ، وە نە ئاسمانو زەویش ئەم وەرامەیان داوەتەوە بە ووتن ، ئنجا لەسەر ئەم شێوەیە ئەفەرموێ ( واذ قال ربك للملائكة ) کاتێك کە پەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی ووت ( انی جاعل في الأرض خليفة ) من جێنشینێك دروست ئەکەم لەسەرزەویی ، تا ئاوای بکەنەوە ، وە دەستوورو باوی جیهان بدۆزنەوە ، وە هەرچی لەئاویایەتی لە کانو کەرەسەی خاو دەری‌بێنن ، وە بەکاری بێنن لەو کارە گرنگانەی کە خوا پێی‌سپاردوون ●

لەمەوە دەرئەکەوێ کە ئادەمیی ژیریی‌و بیرو هێزو تەواناییەکی‌وای دراوەتێ کە بتوانێ ئەم جێنشینی‌یە بکات ، وە بچێتە ژێر ئەم بارە گرانەوە ، وە ئەوی خوا ویستوویەتی بی‌هێنێتەدیی ●

قالوا : اتجعل فيها من يفسد فيها و يسفك الدماء ؟ و نحن نسبح بحمدك و نقدس لك ؟ قال : إني أعلم ما لا تعلمون (٣٠) و علم ادم الأسماء كلها ،

---

ووتیان : ئایا کەسێکیوای تیا دروست ئەکەیت کە بەدیی تیا بکاتو خوێنی تیا بررێژێ ؟ لەکاتێکا کە ئێمە یادت ئەکەین بە ستایش کردنت وە بە پاك راتئەگرین ؟ ( خوا ) فەرمووی : ئەوی من ئەیزانم ئێوە نایزانن (٣٠) ( خوا ) ناوی هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد ،

---

( قالوا ) : فریشتەکان بە زبانی حاڵ ووتیان : ( أتجعل فيها من يفسد فيها ) ئایا کەسێکیوای تیا دروست ئەکەیت کە بەدکرداریی تیا بکات ( ويسفك الدماء ) وە خوێنی تیا بررێژێ ؟ وە بەمهۆیەوە بێئاگا بێ لە پەرستنو پاك راگرتنت ؟ ( ونحن نسبح بحمدك ) لەکاتێکا کە ئێمە هەمیشە یادت ئەکەین بە ستایش کردنت ( ونقدس لك ) وە بە پاکت رائەگرین ، ئنجا خوا بە دووجۆر وەرامیان ئەداتەوە ، یەکێکیان کورتو ئەویتریان درێژ •

یەکەمیان ئەڵێ ( قال انى أعلم ما لا تعلمون ) خوا فەرمووی : ئەوی من ئەیزانم ئێوە نایزانن ، واتە لە دروستکردنی ئادەمییدا هەزاران نهێنی ئەرزو ئاسمان ئەدۆزرێتەوە ، جگە لەوە کە بۆ دادو میهرەبانیی خواش شایستە نییە کە ئەم ئادەمییە بلیمەتە نەهێنێتەروو ، هەر لەبەرئەوەی کە هێندێجار بەدییو خوێنرێژیی تیا ئەکات ، چونکە ئەمانە هیچ دژایەتییەکیان نییە لەگەڵ ئەو جێنشینییەدا •

دووهەمیان ئەفەرمووێ ( وعلم آدم الأسماء كلها ) خوا ناوی هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد ، واتە بە سروشتئامادەیی « استعداد »یەکیوای دا بە ئادەمیی کە بتوانێ هەمووشتێك بدۆزێتەوە ، وە ناوی تایبەتیی بۆ دابنێ ، هەر گەلەی بە زبانی خۆی ، وە بە ناوبردنیان لە یەکیان جیابکاتەوە •

ئەوەندەی نووسین بۆ ئادەمیی گرنگو بەکەڵکە ، کە رۆژهەڵاتیی لە مەبەستی رۆژئاوایی ، وە مەردومی ئەمرۆ لە نووسینی هەزاران ساڵ لەمەپێش

ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ ، فَقَالَ : أَنْبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلَاءِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٣١) قَالُوا : سُبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا

لەپاشا ئەوشتانەی نیشانی فریشتەکان دا ، وە پێی‌ووتن : ناوی ئەمانەم پێ‌بڵێن ئەگەر راست ئەکەن ( کە ئێوە باشترن لە ئادەمیی ) (٣١ ) ( هەموو ) ووتیان : خوایە تۆ پاکیت لە هەڵە ، ئێمە هیچ نازانین

ئەگەیەنێ ، ناونان لە هەمووشتێك‌و ناوبردنیان لەکاتی خۆیا گەلێك گرنگترە بۆ ئادەمیی ، چونکە ئەگەر ئەمە نەبوایە ، بزانە ئدەمیی لەژیانیا تووشی چ گرێ کوێرەیەك ئەبوو لەکاتی یەکتریی تێ‌گەیاندنا ؟ واتە هەرکەسێك بی‌ویستایە یەکێك تێ‌بگەیەنێ لە شتێك ئەبوو ئەو شتەی بێنایەتە بەرچاو ، وە دەستی بنایەتەسەر ، تا بەرانبەرەکەی تێ‌بگەیشتایە ، بەم‌رەنگە ئەگەر بی‌ویستایە بڵێ فیل یا حوشتر یا شێر یا پلنگ ئەوحەلە ئەبوو فیلێك یا حوشترێك یا شێرێك یا پلنگێکیان بهێنایەو دەستیان بخستایەتە سەر ، یا ئەگەر بیویستایە بڵێ کێو ، ئەبوو بچوونایەتە بەردەمی کێوێك‌و پەنجەیان بۆ راکێشایە ، دیارە ئەمە هەر نابێ ، وە ژیان بەم‌رەنگە ناچێتەسەر ، لەبەرئەوە خوای گەورە زبان‌و قسەکردنی دا بەم جێ‌نشینی خۆیە ، وە دەسەڵات‌و تەوانایی‌دایە کە بۆ هەمووشتێك ناوێك دابنێ ، وە هەر وەخت ناوی شتێکی برد ، وەك ئەو شتە خۆی لەبەرچاو بێ وابێ ، بەڵام فریشتە چونکە بۆ ئاوا کردنەوەی زەویی دروست نەکراوون ، وە پێویست بە زانینی ئەم شتانە نین ، ئەم بەهرەیەیان نەدراوەتێ ، وە ناتوانن ناوی شتێك ببەن بە ناوی خۆی ، وەکو ئەفەرمووێ ( ثم عرضهم علی الملائکة ) لەپاشا ئەوشتانەی هەموو نیشانی فریشتەکان دا ( فقال انبئوني بأسماء هؤلاء ) ئنجا پێی‌ووتن : ناوی ئەمانەم پێ‌بڵێن ( ان کنتم صادقین ) ئەگەر راست ئەکەن کە ئێوە باشترن لە ئادەمیی ، لێرەدا فریشتەکان هەموو تێگەیشتن کە شایستەی ئەم جێ‌نشینی‌یەنین ، وە دانیان نا بە زەبوونیی‌و نادانی خۆیانا بەرانبەر بە ئادەمیی ، وەکو ئەفەرمووێ ( قالوا : سبحانك ) فریشتەکان ووتیان : خوایە تۆ پاکیت لە هەموو هەڵەیەك ، وە هەرگیز کاری بێ‌کەڵك ناکەیت ( لا علم لنا

إِلاَّ ما علَّمتَنا إِنَّكَ أَنتَ العليمُ الحكيمُ (٣٢) قال : يا آدمُ أَنبِئهُم بِأَسمائِهِم فلمّا أَنبأَهُم بِأَسمائِهِم ، قال : أَلم أَقُل لَكُم : إِنّي أَعلمُ غَيبَ السَّماواتِ والأَرضِ ، وأَعلمُ ما تُبدونَ وما كُنتُم تَكتُمونَ ؟ (٣٣)

---

ئەوە نەبێ کە خۆت فێرت کردبین ، بەڕاستیی هەر تۆیت زاناو دانا (٣٢) ( خوا ) فەرمووی : ئەی ئادەم ناوی ئەوشتانەیان پێبڵێ ، کاتێك کە ناوەکانی پێووتن ، ( خوا ) فەرمووی : مەگەر پێم نەووتن : کە من ئاگادارم بەنهێنی ئاسمان‌و زەویی، وە ئاگادارم بەوەی کە ئاشکرای ئەکەن ، وە ئەوەی کە ئەیشارنەوە ؟ (٣٣)

---

الا ما علمتنا ) ئێمە هیچ نازانین ئەوە نەبێ کە تۆ فێرت کردبین ( انك أنت العليم الحكيم ) بەڕاستی هەر تۆیت زانا بە بەندەکانی خۆت ، وە دانا لە کردەوەی خۆتا •

کاتێك کە نادانیی فریشتەکان بەئامادەیی « استعداد » ئادەمیی دەرکەوت ، ئنجا جێی ئەوەیە کە ئامادەیی‌و بلیمەتیی ئادەمیی نیشان بدات ، وەکو ئەفەرمووێ ( قال : يا آدم انبئهم بأسمائهم ) خوا فەرمووی : ئەی ئادەم ناوی ئەمشتانەیان پێبڵێ کە نیشان دران ( فلما أنبأهم بأسمائهم ) کاتێك کە ناوەکانی پێووتن ، وە ئامادەیی‌و بلیمەتیی ئادەمیی دەرکەوت ، ئیتر جێی ئەوەیە کە وەرامە کورتەکەی پێشوو بێنێتەوە پێش‌چاو ، وەکو ئەفەرمووێ ( قال ) خوا بە فریشتەکانی فەرموو ( ألم أقل لكم ) مەگەر پێم‌نەووتن ( اني أعلم غيب السماوات والارض ) کە من ئاگادارم بەنهێنی ئاسمانان‌و زەویی ( وأعلم ما تبدون وما كنتم تكتمون ) وە ئاگادارم بەوەی کە ئاشکرای ئەکەن ، وە بەوەی کە ئەیشارنەوە ، ئیتر فریشتەکان بەتەواویی تێگەیشتن ، کە ئادەمیی بە سروشت زۆر ئامادەن بۆ زانینی هەمووشتێك ، وەهە بۆ دۆزینەوەی نهێنی‌یانی جیهان‌و جێ‌نشینیی سەرزەویی •

شیخ محمد عبده ئەفەرمووێ باسی ئادەم لە قورئانا لە « متشابهات »ە ، کە ناگونجێ دیمەنەکەی مەبەس بێ ، چونکە بەپێی دەستوورو باوی قسەو

وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ :

کاتێك ووتمان بە فریشتەکان :

گوفتوگۆ ، خەبەردانی خوا بە فریشتەکان لەبابەت دروستکردنی ئادەمی‌یەوە، یا پرس پێکردنە ••• کە ئەمە بۆ خوا نابێ ، یا خەبەردانە لەخواوەو خراپە گرتنە لە فریشتەکانەوە لەسەر کاری خوا ، کە ئەمەش شایستەی خواو فریشتە نی‌یە ، وە رێك‌ناکەوێ لەگەڵ ئەو تەعریفەی کە خوا هی فریشتەی کردووە ، کە ئەفەرمووێ «لا يَعْصُونَ اللهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ»(١) تحريم /٦ •

کەواتە مەبەس لەمداستانە تمثیلە ، واتە بەمثال مەعنامان لە کالاّی ووتار ، وە شتی نادیارمان لە پەردەی شتی بینراوا بۆ باس ئەکات ، کەواتە بەمپێ‌یە ئەم پرسیارو وەرامە لـە ناوەندی خواو فریشتەدا تمثیلە بۆ نزیـك خستنەوەی چۆنێتی پەیدابوونی ئادەمی ، لە تێگەیشتنی مەردوم ، بەمرەنگە :

مەبەس لـە خەبەردانی خوا بـە فریشتە بۆ جێنشینیی ئادەمیی ، ئامادە بوونی جیهانی سەرزەوی‌یە بۆ دروستبوونی ئەم گیان‌لەبەرە ، کە گەورەترین‌و ئامادەترینی گیان‌لەبەرانە بۆ ئەم جێنشینی‌یە •

مەبەس‌لە خراپەگرتنی فریشتە نیشاندانی سروشتی ئادەمی‌یە ، کە ئەم دوو سیفەتە خراپەی تیایە •

مەبەس لە وەرامەکەی خوا ، ئەوەیە کە ئادەمیی لەگەڵ ئەوەشا ، هێشتا لە هەموو گیـان‌لەبەرێك ئامادەترو شایستەترە بۆ ئـەم جێنشینی‌یە ، وە بۆ دۆزینەوەی نهێنی‌یانی بوونەوەر •

لەدوای ئەوەی کە خوا فریشتەی تێگەیاند لـە نرخ‌و پایەی ئادەمیی ، ئنجا فەرمانیان پێ‌ئەدات بە کورنوش بردن بۆی ، ئەفەرمووێ ( واذ قلنا للملائكة

(١) واتە بی‌فەرمانیی خوا ناکەن لەو کارەی کە فەرمانیان پێ‌ئەدات ، وە هەرچێکیان پێ‌بووترێ ئەیکەن •

اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ ، وَكَانَ مِنَ الكافِرِينَ (٣٤)

كوررنووش بەرنە بەر ئادەم ، ( هەموو ) كوررنووشیان بۆ برد ، شەیتان نەبێ ، كە گوێی نەدایەو دەعیەی كرد ، وە لە بێبررروایان بوو (٣٤)

اسجدوا لآدم ) كاتێك كە بە فریشتەكانمان ووت كوررنووش بەرنەبەر ئادەم‌و مل‌كەچیی بۆ بكەن ( فسجدوا الا ابلیس ) هەموو كوررنووشیان بۆ برد شەیتان نەبێ ( أبی واستكبر ) گوێی نەدایێ‌و دەعیەی كرد ( وكان من الكافرین ) وە چووە ریزی بێبررروایانەوە •

**فریشتە :**

جۆرێكە لە دروست‌كراوانی خوا كـە بە چاو نابینرێن ، وە هەرچیش ئێمە نەی‌بینین مەعنای وانی‌یە كە نی‌یە ، چونكە ئەو گیانەی كە لەبەرمانایە ، وە لە هەمووشت نزیكترە لێمان ، نای‌بینین كەچی هەشە ، كەوابوو با فریشتەش شتێك بێ وا ، زانایانی ئەمررۆ هەرگیز نالێن كە ئادەمیی هەموو نهێنی‌یەكی دۆزیوەتەوە ، وە هـەموو شتێكی زانیوە ، نابێت زانین هـەر رۆژەی چەند زیندەوەرێكمان بۆ ئەدۆزێتەوە ، كە لەوەپێش نەزانراوون •

فریشتە : وەك ئادەمیی نین كە سەربەخۆیی « اختیار »یان ببێ ، بەڵكو هەرجۆرەی بۆ كارێك دروست‌كراوون‌و فرمانێكیان پێ‌سپێرراوە ، وە هەرگیز ناتوانن لەو فەرمانە لابدەن ، وەك قورئان ئەفەرمووێ « لَا يَعْصُونَ اللهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ » كـەوابوو فریشتەكان هـەر باشن ، خراپیان نی‌یە •

**شەیتان‌و ئیبلیس :**

جۆرێكن لە پەریی ، وەك لە سوورەی « كهف »دا ئەفەرمووێ « وَإِذْ

قُلْنَا لِلْمَلائِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ فَسَجَدُوا إِلا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ » •

واتە کاتێك ووتمان بە فریشتەکان کە کورڕنووش بەرنە بەر ئادەم هەموو کورڕنووشیان بۆ برد ، شەیتان نەبێ کە لە پەریی بوو ، وە لە فەرمانی خوای خۆی دەرچوو ، کە ئەم جۆرەیان هەر خراپن ، وە بەدکرداری‌یان لێ‌ئەوەشێتەوە وەك قورئان ئەفەرمووێ « الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُمْ بِالْفَحْشَاءِ » •

واتە شەیتان ئەتان‌ترسێنێ بەهەژاریی‌و فەرمانتان پێ‌ئەدات بە بەدیی •

**پەریی :**

جۆرێکە لە دروست‌کراوانی خوا کە هەرگیز بە چاو نابینرێن ، وە ئەمانە باشیان هەیەو خراپیان هەیە ، وەك لە سوورەی « جن » دا ئەفەرمووێ « وَأَنَّا مِنَّا الصَّالِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَلِكَ » •

واتە ئێمە هێندێکمان باشین‌و هێندێکمان لە خوار ئەوانەوەین • لەمەوە دەرئەکەوێ کە خراپەکانیان پێیان ئەڵێن شەیتان[1] •

شێخ محمد عبده ئەفەرمووێ : هێندێك خاوەن تەفسیر ئەڵێ : مەبەس لەو فەرموودانەی کە ئەفەرموون فریشتە تەرخان کراوون هەر دەستەی بۆ کارێك ، لە رواندنی گیاو دروست‌کردنی گیان‌لەبەرو چاودێریی ئادەمیی‌و •• مەبەس ئەوەیە کە رووان‌و بالاکردنی گژوگیا بەهۆی گیانێکی تایبەتی‌یەوەیە کە خوا کردوویەتی بەبەر دەنکی تۆوەکەدا ، وە ئەو ژیانەی بەهۆی ئەو گیانەوەیە ، هەر بەوڕەنگە لە گیان‌لەبەرو ئادەمیشا ، کەوابوو هەرچی شتێك کە دەستوورێکی تایبەتیی بێ ، وە بەهۆی ئەو دەستوورەوە پەیدا بێ‌و پایەدار بێ ، ئەوە گیانێکە

---

(١) لە سەرەتای سوورەی « جن »ەوە باسێکی جوانی بەکەلکمان نووسییوە دەربارەی پەریی بچۆ بیخوێنەرەوە •

لەلایەن خواوە کە بە زبانی شەرع پێی‌ئەڵێن فریشتە ، ئەوکەسەی کە دان بە فریشتەشا نانێ پێی‌ئەڵێ هێزی سروشتیی « قوەی طبیعی » •

خولاسە هەمووشتێك هێزێکی‌وای تیایە کە ئەوشتە بەهۆی ئەوهێزەوە بویستێو پایەدار بێ ، وە کەس ناتوانێ ئینکاری ئەمە بکات ، کە ئەمە برروادار پێی‌ئەڵێ فریشتە ، وە بێ‌برزواش پێی‌ئەڵێ هێزی سروشتیی ، یا دەستووری سروشتی « ناموسی طبیعی » ، کەوابوو دووبەرەکیی نی‌یە لە ناوەندی برروادارو بێ‌برروادا مەگەر لەناوبردنا نەبێ •

هەموولایەکمان ئەزانین هەرکەسێك بی‌یەوێ ئیشێکی چاك یا خراپ بکات ئەبینێ دووبەرەکی‌یەك پەیدا ئەبێ لەدڵیا لەسەر کردنی ئەوکارە ، وەك یەکێك پێی‌بڵێ ئەوئیشە بکەو یەکێك بڵێ مەیکە وایە ، تا لایەکیان بەسەر لایەکیانا زاڵ ئەبێ ، ئنجا ئەوشتەی کە لەدەروونمانا دانراوە بۆ ئەم‌جۆرە بانگ‌کردنانە ، وە پێی‌ئەڵێن هێز یا بیر ـ دوور نی‌یە کە خوا ناوی باشەکەیان بنات بە فریشتەو ناوی خراپەکەیان بنات بە شەیتان •

شیخ محمد عبده ئەفەرموێ بەپێی ئەم تەفسیرە ئەتوانین بڵێین : ئەم ئایەتە ئیشارەیە بۆئەوەی خوا کە زەویی دروست‌کردو رێکی‌خستو ئامادەی کرد بەهێزانی گیانیی « قوای روحانی » ، وە هەرجۆرێك لەوهێزانەی تەرخان کرد بۆجۆرێك لە دروست‌کراوانی خوا ، ئنجا ئادەمیی دروست کرد ، وە هێزێکی‌وای دایێ کە بتوانێ بەوهێزە ئیش بکات لە هەموو هێزەکانی جیهانا ، وە هەموویان رام بکات بۆ ئاواکردنەوەی زەویی ، وە ئەم رام‌کردنەی تەعبیردایەوە بە کوررنووش بردن ، وە بەهۆی ئەم هێزە بێ‌پایانەوە خواکردی بە جێ‌نشین لەسەر زەویی ، وە لەناو ئەم هەموو هێزانەدا تاقە یەکێکیانی لێ‌دەرکرد کە ئەویش هێزی هەوەس‌و ئارەزووە کە جڵەوگیریی مەردوم ئەکات لە کردەوەی چاك‌و دروست ، وە رای‌ئەکێشیێ بۆ کاری خراپ‌و نادروست ، لەپاشا شیخ محمد عبده ئەفەرموێ ئەگەر یەکێك ئارەزووی ئەم تأویلە بکات ، وە پێی دڵنیا بێ قەیناکات ، وە ئایین هیچ جڵەوگیری‌یەکی لێ‌ناکات ، چونکە مەبەس دڵنیایی مەردومە بە فەرموودەکەی خوا •

وَقُلْنَا : يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ

وە ووتمان : ئەی ئادەم خۆت‌و ژنەکەت دانیشن لەم بەهەشتەدا

( وقلنا : يا آدم اسكن أنت وزوجك الجنة ) ووتمان : ئەی ئادەم خۆت‌و حەووای ژنت دانیشن لەم بەهەشتەدا •

أبومنصوری ماتریدیی ئەفەرموێ : مەبەس لەم بەهەشتە باخێکی پرر لە دارو درەخت‌و میوەهاتە لەسەرزەویی کە ئادەم‌و حەوا لەوێ ، یا لەنزیکی‌یەوە هاتوونەتە جیهان ، نەك ئەو بەهەشتەیە کە جێی پاداشی چاکانە لەرۆژی دوایی‌دا چونکە :

١ ـ خوا یەکەم‌جار ئادەمیی لەسەر زەویی دروست‌کرد تا خۆی‌و نەوەی ببن بە جێ‌نشین تیی‌دا ، کەوابوو جێ‌نشینیی ئەوان لەسەرزەویی مەبەستێکی تایبەتی‌یە ، نابێ بڵێین لە تۆڵەی گوناها دەرکراونەتە سەرزەویی •

٢ ـ لەدوای دروست‌کردنی ئادەم‌و حەووا لەسەرزەویی ، خوا نافەرموێ بەرزمان کردنەوە بۆ ئاسمان ، ئەگەر ئەمە وابوایە ئەبوو ئەمەی بفەرموایە ، چونکە شتێکی زۆر گرنگە •

٣ ـ ئەگەر لە زەویی‌یەوە ببرانایە بۆ بەهەشت خوا پێی‌نەئەفەرموون « اُسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ » واتە خۆتو ژنەکەت دانیشن لە بەهەشتا ، بەڵکو پێی‌ئەفەرموون « اُدْخُلْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ » واتە خۆت‌و ژنەکەت بچنە ناو بەهەشت •

٤ ـ بەهەشتی راستەقینە چاکان نەبێ کەسی‌تر ناچێتە ناوێوە ، کەوابوو شەیتان چۆنی توانی بچێتە ناوێوە ، بۆ لەخشتە بردنی ئادەم •

٥ ـ بەهەشتی راستەقینە جێی خۆشیی‌و رابواردنە ، جێی تکلیف نی‌یە ، کەوابوو چۆن خوا تکلیفیان لێ‌ئەکات بە نەخواردن لە درەختێکی تایبەتیی ؟

٦ ـ بەهەشتی راستەقینە جڵەوی کەسی تیا ناگیرێ لە هیچ‌جۆرە خۆشیی‌یەك ، کەواتە ئادەم‌و حەووای چۆن تیا جڵەوگیریی کران لە خواردن لەو درەختە ؟•

وَكُلا مِنْها رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا ، وَلا تَقْرَبا هَذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونا مِنَ الظَّالِمِينَ (٣٥) فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطانُ عَنْها ، فَأَخْرَجَهُما مِمَّا كَانَا فِيهِ ، وَقُلْنَا : اهْبِطُوا

وە لە هەموو خواردەمەنی‌یەکی بخۆن بە تێرو تەسەلیی لە هەرشوێنێك کە حەز ئەکەن ، وە نزیکی ئەم درەختە مەکەوون تا لە ستەمکاران بژمێررێن (٣٥) ئنجا شەیتان هەڵی‌کەندن لە بەهەشت ، وە دەری‌هێنان لەو خۆشی‌یەی کە تێی‌دابوون ، وە ووتمان (بە ئادەمو حەواو شەیتان) : بچنە خوارەوە (بۆ سەرزەویی ئیشکردنو هەوڵدان )

٧ ـ ئەو بەهەشتە گوناهی تیا ناکرێ ، کەواتە ئادەمو حەووا ئەم گوناهەیان چۆن تیا کرد ؟

٨ ـ ئەو بەهەشتە جێی پاداشە ، واتە ئەوکەسەی کە لەجیهانا باش بێ لەپاداشا ئەخرێتە ناوی ، کەوابوو چۆن یەکەمجار ئادەمو حەووا خرانە ناوی •

٩ ـ ئەو بەهەشتە پێی‌ئەڵێن :ماڵی دوایی ، ئنجا ئەگەر مەبەس ئەوەبێ ئەبێ بەهەشت وەك جیهان ماڵی دوایی نەبێ بەڵکو ماڵی یەکەم بێ ، ئەوحەلە ئەبێ ناوی جیهان بە ماڵی یەکەمو ناوی بەهەشت بە ماڵی دوایی ، هەڵە بێ •

( وکلا منها رغدا حیث شئتما ) وە لە هەموو خواردەمەنی‌یەکی ئەو بەهەشتە بخۆن بە تێرو تەسەلیی لە هەمووشوێنێك کە خۆتان حەز ئەکەن ( ولا تقربا هذه الشجرة ) وە نزیکی ئەم درەختە مەکەوون کە خوا بۆی دەست‌نیشان کردوون ( فتکونا من الظالمین ) تا لە ستەمکاران بژمێررێن ( فأزلهما الشیطان عنها ) ئنجا شەیتان هەڵی‌کەندن لە بەهەشت بەهۆی ئەو درەختەوە کە لێیان‌خوارد ، وە فەرمانەکەی خوایان شکاند ( فأخرجهما مما کانا فیه ) وە دەری‌هێنان لەو خۆش‌گوزەرانی‌یەی کە تێی‌دابوون ، ئنجا خوا باسی چۆنێتی دەرکردنەکەیان ئەکات ، ئەفەرموێ ( وقلنا : اهبطوا ) ووتمان بەئادەمو حەواو شەیتان : بچنە خوارەوە بۆ سەرزەویی ئیشکردنو هەووڵدان ، وە بۆ دوژمنایەتیی لەگەڵ

بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ، وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ (٣٦) فَتَلَقَّىٰ آدَمُ مِنْ رَبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (٣٧)

---

هێندێکتان دوژمن ئەبن لەگەڵ هێندێکتانا ، وە بۆ ئێوە هەیە لە سەرزەویی ئارامگاو بەهرەمەندیی تا ماوەیەك (٣٦) ئنجا ئادەم چەند ووتەیەکی ( پاررانەوەی ) لـە خوای خۆیـەوە وەرگرتو لێی گیرا کرد ، بەراستیی هـەر ئەوە گیراکەری میهرەبان (٣٧)

---

شەیتانو نەوەیا ، وەکو ئەفەرموێ ( بعضكم لبعض عـدو ) هێندێکتان دوژمن ئەبن لەگـەڵ هێندێکتان ( ولكم في الأرض مستقر ومتـاع الى حين ) وە ئێوە لەسەرزەویی ئەمێننەوەو بەهرەمەند ئەبن تاماوەیەك کـە ماوەی ژیانی هەموو ئادەمی‌یەکـە •

لێرەوە جەنگ دەست پێ‌ئەکات لەناوەندی شەیتانو ئادەمی‌دا تا رۆژی دوایی ، وە ئادەم تێ‌گەیشت کـە گوناهێـکی زۆر زلی کردووە ، وە ویستی پەشیمان بێتەوەو لەخوا بپاڕێتەوە ، وەکو ئەفەرموی ( فتلقى آدم من ربـه كلمات ) ئنجا خوا چەند ووتەیەکی پاررانەوەی خستە دڵی ئادەمەوە ، وە بە دڵ رووی‌کردە بارەگای خواو ووتی « رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ »[1] اعراف/٢٣ • ئادەم بەم‌ووتارە پەشیمانیی خۆی دەربڕیی ( فتاب عليه ) خواش لێی گیرا کرد ( انه هو التواب الرحيم ) چونکە بێ‌گومان هەرئەوە گیراکەری پاررانەوە ، وە هەر ئەوە کە بەزەیی بێ بە بەندەگانا •

وەك لە سەرەتای ئەم‌باسەوە ووتمان : زورجار قورئان مەعنامان لەشێوەی پرسیارو وەرام ، یا لە ئاهەنگی چیرۆكو داستانا پێ‌ئەڵێ ، چونکە مەردوم باشتر

---

(١) واتە ئەی پەروەردگارمان ئێمە ستەممان کرد لەخۆمان ، ئەگـەر لێمان خۆش‌نەبییتو نەمان‌بەخشییت بەراستیی ئەبین بەیەکێك لە زەرەرمەندان•

تێی‌ئەگات ، وە ئەوی لەودیو ووتارەوە بێ جوانتر دەرئەکەوێ ، وە مەبەس لەو پرسیارو وەرامانە ، یا چیرۆك‌و داستانانە تمثیلە ، شیخ محمد عبده ئەفەرموێ تمثیلی ئەم داستانە بەم‌رەنگەیە :

مەبەست لە خەبەردانی خوا بە فریشتە کە ئادەمیی گێرراوە بە جێ‌نشین لەسەرزەویی ، ئامادەیی زەویی‌و هێزانی جیهانە بۆ پەیدابوونی گیاندارێکی وەك ئادەمیی ، کە بتوانێ بە هەمووجۆرێك دەست‌کاریی زەویی‌و ئەوشتانەی کــە لەناویایەتی بکات •

مەبەست لە خراپەگرتنی فریشتە لە دانانی جێ‌نشینێك لەسەرزەویی کە بەدیی‌و خوێن‌رێژیی تیا بکات ـ باسی ئەم دوو سروشتی ئادەمیی‌یەیە •

مەبەست لە وەرامی خراپە گرتنەکەی فریشتە ، ئەوەیە کە بەدیی‌و خوێن رێژیی ئادەمیی هیچ دژایەتی‌یەکی نی‌یە لەگەڵ ئەم جێ‌نشینی یەیا •

مەبەست لــە فێرکردنی ناوی هەمووشتێك بە ئادەم ـ ئامادەیی ئادەمی‌یە بۆ فێربوونی هەمووشتێك‌و هەڵسوورانێتی لە ئاواکرنەوەی زەوییدا •

مەبەست لە پرسیاری ئەو ناوانە لە فریشتەو وەرام نەدانەوەیان ـ ئەمەیە نیشان بدات کە هەستی هەموو گیانێك لەو گیانانەی کە تەدبیری ئیش‌وکاری جیهان ئەکــەن ئەندازەیەکی تایبەتی‌یە بەرەنگێکی‌وا کــە لەوپیشەیەی بۆی دانراوە تێناپەڕێ •

مەبەست لە کوڕنووش‌بردنی فریشتە بۆ ئادەم ـ رام‌کردنی ئەم هەموو هێزو گیانانەیــە بۆ ئادەمیی تا هــەڵیان سووڕێنێ‌و بەهرەیان لێ‌وەرگرێ بــە دۆزینەوەی دەستوورو باوی خوایی لەجیهانا •

مەبەست لە کوڕنووش نەبردنی شەیتان ـ ئەمەیە کە ئادەمیی هەرگیز ناتوانێ بەتەواویی گیانی خراپە رامی ژێردەستی خۆی بکات ، وە بیری خراپ‌و ئارەزووی بەدیی هەڵگرێ ، کە هەر بیری خراپەیە مایەی هــەموو جەنگ‌و ئاژاوەو دووبەرەکی‌یەك •

مەبەست لـە بەهەشت ـ خۆشیی‌و حەسانەوەو نازو بەهرەیە ، چونکە هەموو کەسێك لەناو باخێکی پڕ لە دارو درەخت‌و سیبەرو میوەو ئاوو گوڵ‌و لالەزارا کەیف‌خۆش‌و تێرو تەسەل‌و حەساوەیە •

مەبەست لە ئادەم جۆر « نۆع »ی ئادەمیی‌یە •

مەبەست لە ژنی ئادەم جۆری ژنە بەتێکڕایی •

مەبەست لـە فەرماندان بە ئادەم‌و حەووا بەخواردن لـە هەمووشتێك‌و هەمووشوێنێك ئەمەیە کە هەمووشتێکی پاکیان بۆ حەڵاڵە •

مەبەست لەودرەختەی کە قەدەغەکرا لە ئادەم شەڕرو خراپەیە بەنیشانەی ئەوەی کە قورئان تەشبیهی قسەی خراپ ئەکات بە درەختی خراپ لە ئایەتی « وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ »[1] دا • ابراهیم/ ٣٢ •

مەبەست لە قەدەغە کردنی درەختەکە ناسینی شەڕرو خراپەیە بە سروشت•

مەبەست لە وەسوەسەی شەیتان پیشەی پیسی ئەوگیانە پیسەیە کە لەگەڵ هەموو ئادەمیی‌یەکا هەیە •

مەبەست لە چوونە دەرەوە لە بەهەشت ئەو خەم‌و خەفەتەیە کە دووچاری ئادەمیی ئەبێ بە لادانی لە ڕێی ڕاست •

مەبەست لە ووتە خستنی خوا بۆ ناو دڵی ئادەم‌و پەشیمان بوونەوەی ، دەرس وەرگرتنی ئادەمیی‌یە لەو هەڵانەی کە ئەیانکات ، وە پەنابردنیانە بەخوا لەکاتی تەنگانەو چەڵەمەدا •

مەبەست لـە گیراکردنی پەشیمان بوونەوەی ئادەم لەلایـەن خواوە ، ڕێنموونیی‌یەتی بۆ ڕێگا دۆزینەوەو دەرچوون لە تەنگانە •

لێرەدا قورئان بە ئایەتی « فَتَلَقَّى آدَمُ مِنْ رَبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَابُ الرَّحِيمُ » نیشـان ئەدات زۆر بەسادەیی کـە لە

---

(١) واتە ووتەی پیس وەك درەختی پیس وایە •

قُلْنَا : اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعاً ، فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدىً

ووتمان : هەموو بچنە خوارەوە لە بەهەشت ، ئنجا ئەگەر لە منەوە رێنموونیی‌یەکتان بۆ هات :

ئیسلامی‌یەتا گوناهو پەشیمان بوونەوە خۆیی « شخصی »یە ، وە هیچ کەسێك بە گوناهی کەسێکی‌تر گیرۆدە نابێ ، وەك خوێندەوارانی کنیسە ئەڵێن : کە گوناهی ئادەم چۆتە ملی هەموو ئادەمی‌یەکەوە تا رۆژی دوایی ، واتە هەموو ئادەمی‌یەك لەپێش لەدایك‌بوونیا گوناهبارە بەو گوناهەی کە باوە گەورەی کردوویەتی ، تا عیسا پێغەمبەر ـ کە بەلایانەوە کوڕی خوایە ـ دێو خۆی ئەکات بە قوربانیی بۆ ئادەمیی ، وە بە هەڵواسینی خۆی ئەو گوناهە ئەسڕێتەوە لەسەر نامەی کردەوەی هەموو ئادەمی‌یەك ، وە هەموویان بەجارێك رزگار ئەکات .

ئەم بیروباوەڕە ئێجگار دوورە لەژیریی‌و بیرەوە ، وە هەرچی داد « عدالت » بێ تیا نی‌یە ، ئەوی کە ژیریی‌و بیر بیگرێ تەنیا ئەوەیە کە گوناهو پەشیمان بوونەوە ، خۆیی‌یە ، وەك قورئان ئەفەرموێ « وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى »[1] انعام /١٦٤ . هەرکەسێك گوناهێکی کرد هەرخۆی بەر پرسیار « مسئول »ە لەوگوناهە ، وە کەس بە گوناهی کەس گیرۆدە نابێ ، وە دەرگای پەشیمان بوونەوە بۆ هەمووکەسێك لەسەرپشتە ، تا رۆژی دوایی ، هەرکەسێك لە هەرکاتێکا بەراستی تۆبە بکات گیرایە ، وەك فەرمووی « إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ » .

جاری پێشوو بەئادەم‌و حەووای ووت : بچنە خوارەوە بۆسەرزەویی ئیشکردن‌و هەوڵدان ، ئەمجارە پێیان‌ئەڵێ : بچنە خوارەوە بۆئەوەی هەروەخت پێغەمبەریکتان بۆ هات بە ئاینێکی خوایی‌یەوە دوای کەوون ، ئەفەرموێ ( قلنا : اهبطوا منها جميعاً ) پێمان‌ووتن : هەموو داگەرێنە خوارەوە لە بەهەشت ( فاما يأتينكم مني هدى ) ئنجا ئەگەر رێنموونیی‌یەکتان بۆهات لەمنەوە بەهۆی

(١) واتە هیچ هەڵگرێك گوناهی یەکێکی‌تر هەڵناگرێ .

فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٣٨) وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٣٩)

---

ئەو کەسەی دوای رێنموونیی من کەوت نە ترسیان لەسەرەو نە خەم ئەخۆن(٣٨) وەئەوانەی کە بێبڕروا بوونو ئایەتانی ئێمەیان بەدرۆ خستەوە ، ئەوانە هاودەمی ئاگرن ، تیا ئەمێننەوە بەئێجکاریی (٣٩)

---

پێغەمبەرێکی خاوەن نامەوە ( فمن تبع هداي ) ئیتر هەرکەسێك دوای رێنموونیی من کەوتو رێی منی گرت ( فلا خوف علیهم ولا هم یحزنون ) نە ترسیان لەسەرەو نە خەمو خەفەت ، واتە ئەوانەی کە رێی شەرعو ئایینی خوا ئەگرن ، نە لە پاشەرۆژ ئەترسنو نە خەفەت بۆ رابوردوو ئەخۆن ، چونکە سەرچاوەی دڵیان بە میهرەبانیی خوا رووناکە •

( والذین کفروا وکذبوا بآیاتنا ) ئەوانەی کە بێبڕروابوونو ئایەتانی قورئانی ئێمەیان بەدرۆخستەوە ( اولئك أصحاب النار ) ئەوانە هاورێی ئاگرن ( هم فیها خالدون ) تیا ئەمێننەوە بەئێجگاریی •

★ ★ ★

کاتێك کە پێغەمبەر بە ناچاریی کۆچی کرد لە مکەوە بۆ مدینە بە خۆیو هاورێکانییەوە ، وە پەیمانی برایەتی پێبەستن لەگەڵ مسڵمانەکانی مدینەدا ، سێ دەستە کۆبوونەوە لە مدینــە ، « مسلمان »و « بێبڕروا »و « ناپاك » کــە قورئان یەك‌بەیەك باسی کردن لەسەرەتای ئەم سوورەتەوە ، بەڵام لەگەڵ ئــەم سێ دەستەیەدا ، دەستەیەکی چوارەمیشی تیابوو کە جوولەکە بوون ، کە لــە بێبڕرواو ناپاکەکان گــەلێك خراپتر بوون ، وە هەمیشە وەك ئاگری بن‌کا لەژێرەوە خــەریکی هــەڵگیرساندنی ئاگری ناکۆکییو دووبەرەکیی بوون ، بۆئەوەی کە خۆیان لەوناوەدا بژیین • کاتێك کە پێغەمبەر هات بۆ مدینە ، وە دووتیرەی زۆر گەورەی وەك « أوس » و « خزرج »ی ئاشت کردەوە ، وە لەگەڵ مسڵمانەکانیترا پەیمانی برایەتیی پێبەستن ، وە دەستەیەك مسڵمانی یەك‌بیری

یەك‌ئامانجی پێك‌هێنـــا ، نەخوازەلا كە نامەیـــەكی ئاسمانیی وەك قورئانیشی بۆ هێنان ، ئیتر جوولەكەكان ئاگریان تێ‌بەربوو ، نەخوازەلا كە خۆشیان بە كەلێكی هەلبژاردەی خوا « شعب الله المختـــار » ئەزانی ، وە خاوەنی پێغەمبەرو نامەی ئاسمانیی بوون ، وە بەم‌بۆنەیەوە پایەیەكی بەرزو شوێنێكی گرنگیان بوو لـــە مدینە ، كە پێغەمبەر هات‌و بانگی‌كردن بۆ برزواهێنان دەعیـــەو دەمار كرتنی ، لەپاشا حەسادەتیان برد بە پێغەمبەر ، كەوا خوا هەلی‌بژاردووە بۆ پێغەمبەریەتیی‌و قورئانی بۆ ناردووە ، نەخوازەلا كە لەماوەیەكی كەما لە مدینـــە سەركەوت‌و پێشكەوت ، وە بناغەی ئایینێك‌و دەوڵەتێكی دامەزراند ، ئیتر بە دڵ ئەترسان لەوەی : ئەگەر مسلمان بین بتوێنەوە لەناو مسلمانەكانا ، وە ئەگەر مسلمانیش نەبن كلیلی ئەو بازرگانیی‌و قازانج‌و سوودەیان لەدەست دەرچێ ، لەبەرئەمانە ، لە یەكەم رۆژەوە بەرانبەر بە پێغەمبەرو ئیسلامی‌یەت وێستان ، بەو وێستانەی كەوا قورئان لێرەوە بۆمان باس ئەكات تا ئایەتی ١٤٢ •

سەیر لەوەدایە ئەوسیفەتانەی كە قورئان بۆیان دائەنێ سیفەتێكی ئەوەند چەسپ‌و نووساوون پێ‌یانەوە ، وەك قیرو زفت گرتوونی لێ‌یان نابێتەوە ، وە هەمیشە لەگەڵیانا جووتە لەكاتی حەزرەتی مووساوە تا ئەمرۆ ، بەرەنگێك كە قورئان لەكاتی قسەكردن لەگەڵ جولەكەكانی زەمانی مووسادا ئاوورر ئەداتەوە بەلای جوولەكەكانی زەمانی پێغەمبەر ، یا جوولەكەی ئەوماوەیەی كە لەناوەندی مووساو پێغەمبەرا بوون ، وە هەر بەوشێوەو ئاهەنگە قسەیان لەگـــەڵ ئەكات ، هەروەك زۆرجار لەكاتی قسەكردن لەگەڵ جوولەكەی زەمانی پێغەمبەرا ، قسە لەگەڵ جوولەكەكانی زەمانی مووسادا ئەكات ، بۆچی ؟ چونكە جوولەكە هەر جوولەكەیە ، سیفەتەكانیان هەر ئەو سیفەتانەیە ، رەووشت‌و خوویان هەر ئـــەو رەووشت‌و خووەیە ، بیروباوەریان لەگەڵ ئەوانەی كە جوولەكە نین هـــەر ئەو بیروباوەررەیە •

لەپاشا ووتارەكانی قورئان بەدرێژایی ســـاڵ ، بەزیندوویی ئەمێنێتەوە ، بەجۆرێكی‌وا لە هەموو چەرخێكا ئەڵێیت بۆ ئەو چەرخە ووتراوە •

يا بَنِي إِسْرائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ ، وَأَوْفُوا بِعَهْدِي

ئەی نەوەی ئیسرائیل بیری ئەو چاکانە بکەنەوە کە رشتوومن بەسەرتانا ، وە پەیمانی من بەنەسەر

ئنجا لێرەوە دەست ئەکات بە باسی جوولەکە ، ناوبەناو بانگیان ئەکات بۆ مسڵمانبوونو برروا هێنان بەو قورئانەی کە پشتیوانیی تەوراتەکەی ئەوان ئەکات ، دەمێ بە نەرمییو دەمێ بە توندیی ، لەگەڵ باسی خوارو خێچیو پێچو پەناو فرروفێڵیان لەگەڵ پێغەمبەرەکەی خۆیانو پێغەمبەرەکانی دوای ئەو ، وە پەردەیان لەسەر لائەبات‌و نهێنیی دڵو دەروونو سروشتیان یەکبەیەك بەرچاو ئەخات ، دوای ئەوەی کە بە هەموو جۆرێك لەگەڵیانا خەریك ئەبێ بۆ مسڵمانبوونو برروا هێنانیان ، تا بە مسڵمانانیان بناسێ ، وە چاوو دڵیان بکاتەوە بە هەموو فرروفێڵێکیان •

ئەم باسە دائەمەزرێنێ بە بانگ کردنی نەوەی ئیسرائیل ، بە بانگ کردنێکی ئاسمانیی پرر لە رێز ، وە ئەو چاکەو میهرەبانی‌یەی کە کردوویەتی لەگەڵیانا یەکبەیەك باسیان ئەکات‌و بیریان ئەخاتەوە ، ئەفەرموێ ( يا بني إسرائيل ) ئەی نەوەی یعقوب پێغەمبەر ( اذكروا نعمتي التي أنعمت عليكم ) بیری ئەوچاکانە بکەنەوە کە رشتوومن بەسەرتانا •

ئیسرائیل نیشان ناو « لقب »ی یعقوبی کورری اسحاقی کورری إبراهیمە کە بەمەعنا هەڵبژاردەی خوایە ، مەبەس لە کوررانی یعقوب ئەو نەوەو وەچانەن کە لە دوانزە کوررەکەی ئەو کەوتوونەتەوە ، کە یەکێکیان یوسف پێغەمبەرە ، واتە ئەی نەوەی پێغەمبەران ، لە فەرمانی خواو پێغەمبەر مەچنە دەرەوە ( وأوفوا بعهدي ) وە ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ منا بەستووتانە لەکاتی باوەگەورەتان ، ئادەمەوە ــ کە برروا بێنن بە پێغەمبەرانی من‌و رێنموونیی من[1] ــ

(١) وەك لە ئایەتی پێش ئەم ئایەتەدا فەرمووی « فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ » •

أُوفِ بِعَهْدِكُمْ ، وَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ (٤٠) وَآمِنُوا بِمَا أَنْزَلْتُ مُصَدِّقاً لِمَا مَعَكُمْ ، وَلَا تَكُونُوا أَوَّلَ كَافِرٍ بِهِ ، وَلَا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً ،

---

تا منیش پەیمانی ئێوە بەمەسەر ، وە هەر لە من بترسن (٤٠) وە بڕروا بێنن بەو قورئانەی کە ناردوومەتە خوارەوە بۆ پشتیوانیی ئەوتەوراتەی کە لەلاتانە ، وە مەبن بە یەکەمین بێبڕروایێی ، وە ئایەتانی من مەگۆڕرنەوە بــە شتێکی کــەمنرخ •

---

بیبەنەسەر ( أوف بعهدکم ) تا منیش پەیمانی ئێوە بەمەسەر ، وە لە خاکی فەلەستین جێگیرتان بکەم ، وە پایەتان بەرز بکەمەوە ، وە گوزەرانتان خۆش بکەم ، وە زاڵتان بکەم بەسەر دوژمنە بێبڕرواکانتانا ( وإیای فارهبون ) وە هەر لە من بترسن •

( وآمنوا بما أنزلت مصدقا لما معکم ) وە بڕروا بێنن بەوقورئانەی کــە ناردوومەتە خوارەوە بۆ پشتیوانیی ئەو تەوراتەی کە وا بەدەستانەوە ، واتــە ئەگەر تەماشای قورئان بکەن ئەبینین ئەمیش وەك ئەو فەرمان ئەدات بە چاکەو تاکو تەنیایی خوا ، وە جڵەوگیریی ئەکا لە بەدییو خراپیی ، وە هەردوکیان وەك یەك وان لەبنیاتا ، لەگەڵ ئەمیشە کە قورئان سەرەرڕوای ئەمانە دەستی ئادەمییش ئەگرێ بۆ ڕێگای یەکێتییو برایەتییو یارمــەتیی ، وە جیاوازیی هەڵئەگرێ لەناویانا ، وە ئەیانکات بە برای یەك •

( ولا تکونوا أول کافر به ) وە پەلە مەکەن بۆئەوەی بێبڕروا بن پێی ؟ لەکاتێکا کە ئەبوو یەکەمین بڕروادار بن پێی ( ولا تشتروا بآیاتی ثمنا قلیلا ) وە بەئایەتانی من شتی کەمی بێنرخ مەکڕرن ، واتە بۆ قازانجێکی هیچوپووچ ؟ ئەو نیشانانەی کە خوا کردوونی بە بەڵگە لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەر ــ کــە گەورەترینیان قورئانە ــ چاویان لێمەقووچێنن ، هەروا ئەو ئایەتانەی کە لە

وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ (٤١) وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٤٢) وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ ،

وە هەر لە ( بێفەرمانیی ) من خۆتان بپارێزن (٤١) وە راست دامەپۆشن بە درۆ تا راستەکە بشارنەوە لەکاتێکا کـە خۆتان ئەمە ئەزانن (٤٢) وە نوێژ بکەنو زەکات بدەن ،

تەوراتا هاتوون لە باسی پێغەمبەری ئیسلاما ، مەیانشارنەوە ( وایای فاتقون ) وە هەر لە بێفەرمانیی من خۆتان بپارێزن •

تەورات دوو ئامۆژگاریی جوولەکە ئەکات :ــ

١ ــ ئەڵێ : خۆتان بپارێزن لـەو پێغەمبـەرە درۆزنانەی کـە لەناوتانا پەیدا ئەبن •

٢ ــ ئەفەرموێ خوا پێغەمبەرێك ئەنێرێ لە نەوەی إسماعیلو « هاجر » ، وە ناونیشانی ئەو پێغەمبەرەی باس‌کردووە بەرەنگێك کە لە کەس نەگۆڕرێ ، کاتێك کە پێغەمبەر هات ـ کە لە نەوەی إسماعیلو هاجرە ـ زانایانی جوولەکە ووتیان : ئەمە ئەو پێغەمبەرە درۆزنەیە کە خوا لە تەوراتا پێیووتووین برِروای پێمەهێنن ، وە ئەو ناونیشانانەی کە تەورات هەڵیئەدا لە باسی پێغەمبەری ئیسلاما ئەیان شاردەوە ، ئنجا بەمبۆنەیەوە قورئان پێیان ، ئەفەرموێ ( ولا تلبسوا الحق بالباطل ) راست دامەپۆشن بە درۆ ( وتكتموا الحق وأنتم تعلمون ) تا راستەکە بشارنەوە لەکاتێکا کە خۆتان ئەزانن کـە ئەم پێغەمبەرە ئەوەیە کـە تەورات ناونیشانی هەڵداوە •

ئنجا بانگیان ئەکات کە بێن تێکەڵی مسڵمانان بن ، وە بێنە ریزی ئەوانەوە، وە پێویستانی ئایینی بەجێبێنن ، ئەفەرموێ ( وأقيموا الصلاة وآتوا الزكاة ) نوێژی بەراستی بکەنو زەکات بدەن •

نوێژ بنیاتی دووهەمی ئایینە ، وە مایەی پەیوەندیە لە ناوەندی خواو بەندەگانا ، لەبەرئەوە قورئان لـە ٨٦ شوێن ناوی نوێژ ئەهات ، وە لە هـەر شوێنەی بەجۆرێك فەرمانی پێئەدات ، لێرەدا فەرمان ئەدات بە کردنی ، لەمەولا دەمێ فەرمان ئەدات بە نەفەوتاندنی بە ئایەتی « اَلَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ

وَ ارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ (٤٣)

وە لەگەڵ نوێژکەرانا نوێژ بکەن (٤٣)

دَائِمُونَ »[١] معارج /٢٣ دەمێ بە کردنی لەکاتی خۆیا بە ئایەتی « إِنَّ الصَّلاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَاباً مَوْقُوتاً »[٢] نساء/١٠٣ دەمێ بە کردنی بەهۆش‌و گۆش‌و ترس‌و بیمەوە بە ئایەتی « أَلَّذِينَ هُمْ فِي صَلاتِهِمْ خَاشِعُونَ »[٣] مؤمنون/٢ • دەمێ بە کردنی بە کۆمەڵ بە ئایەتی ( واركعوا مع الراكعين ) واتە لەگەڵ نوێژکەرانا نوێژ بکەن بە کۆمەڵیی •

زەکات بنیاتی سێهەمی ئاینە ، وە مایەی پەیوەندی‌یە لەلایەکەوە لەناوەندی خواو بەندەو ، لەلایەکی‌تریشەوە لە ناوەندی خۆی‌و بەندەگانا ، بۆئەوەی تێ‌بگات کە خۆی ئەندامێکە لە کۆمەڵە ، وە لەگەڵ ئەوانا وەك یەك جەستە وایە ، لەگەڵ لایەکی هاتە ژان خێرا ئەمیش دێتەژان •

زەکات خەرج « ضريبە »یکە خوا دایناوە لەسەر دەوڵەمەند کە بیدات بە هەژار ، لە سوپاسی ئەو میهرەبانی‌یەی کە خوا لەگەڵیا کردووە ، جگە لەوە کە دەوڵەمەند بەهۆی کۆمەڵەو گەلەوە دەوڵەمەند ئەبێ ، وە ئەو دارایی‌یەی کە کۆی کردۆتەوە ، قازانجێکە کە لەمولەوەوە دەستی کەوتووە ، کەوابوو پێویستە لەسەری ، ئەگەر یەکێك لەوان هەژارو دەستەپاچە کەوت ، یارمەتیی بداتو دەستی بگرێ ، وە چاودێریی ئەو کۆمەڵە بکات کە قازانجی ئەمانەی هەموو بەیەکەوە بەستۆتەوە ، جگە لەوە ئەوەندەی هەژار پێویستە بەیارمەتیی دەوڵەمەند ، دەوڵەمەندیش ئەوەندە پێویستە بە یارمەتی هەژار •

زاناو خوێندەوارەکانی جولەکە ، لەوانەی کە دەوری تەوراتیان

(١) واتە ئەوانەی کە بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان •

(٢) واتە بێ‌گومان نوێژ لەسەر بڕوادارانی پێویست کراوە لەکاتی تایبەتی خۆیدا •

(٣) واتە ئەوانەی کە [illegible] ترسن :

أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ وَأَنْتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ ؟! أَفَلَا تَعْقِلُونَ ؟ (٤٤)

ئایا فەرمان ئەدەن بە مەردوم بە چاکەو خۆتان فەرامۆش ئەکەن ، ( لەگەڵ ئەمیشە ) کە ئێوە دەوری تەورات ئەکەنەوە ؟ نابێ تێبگەن ؟! (٤٤)

ئەکردەوە ، وە ئاگایان لە ناونیشانەکانی پێغەمبەر بوو ، بەدزی‌یەوە ئەیانووت بە کەس‌وکاری خۆیان‌و ئەوانەی کە لێیان دڵنیا بوون ـ کە بڕوا بێنن بە محمد چونکە پێغەمبەری بەراستی‌یە ، وە تەورات مژدەی پێداوە ، بەڵام خۆیان لە ترسی نەخوێندەوارو بۆرە پیاوەکانیان نەیان‌ئەوێرا مسڵمان بین ، ئنجا بەم‌بۆنەیەوە خوا سەرکۆنەی ئەو سەرۆك‌و زانایانەیان ئەکات ، ئەفەرموێ ( أتأمرون الناس بالبر وتنسون أنفسكم ) ئایا فەرمان ئەدەن بە مەردوم بە چاکەو خۆتان فەرامۆش ئەکەن ( وأنتم تتلون الكتاب ) لەگەڵ ئەمیشە کە ئێوە دەوری تەورات ئەکەنەوە ، وە ئاگاتان لە ناونیشانەکانی پێغەمبەرە ، واتە ئەگەر ئێوە بڕواتان بە تەوراتەکەی خۆتان هەیە ، وە فەرموودەکانی بە راست ئەزانن ، وە ئامۆژگاریی مەردومی پێ‌ئەکەن بۆچی خۆتان کاری پێ‌ناکەن ؟ ( أفلا تعقلون ) ئایا هێشتا تێ‌ناگەن ؟ •

ئەم زاناو خوێندەوارانە وەك یەکێك وان کە ڕێگایەکی راست‌و دروست‌و رووناکی لەپێشەوە بێ ، کەچی ڕێگایەکی خوارو خێچ‌و تاریك بگرێ ، وە لەوڕێگایەدا تووشی هەرکەسێك بێ کە شارەزای ئەو ڕێگایە بێ پێی‌بڵێ : تۆ بەم ڕێگایەدا مەڕۆ ، وە بچورەوە سەر ڕێگا راستەکە •

ئەم ئامۆژگاری‌یە هەرچەند یەکەم‌جار بۆ جوولەکەیە ، بەڵام بەتێکرایی بۆ هەموو کەسێکە لە هەموو گەلێکا ، وە لە هەموو چەرخێکا ، نەخوازەلا پیاوانی ئایینی‌و زانایانی دینی ، بەڵای هەرە گەورە ئەوەیە کە زانایانی ئایین وایان‌لێ‌بێ ، وە ئایین بێ بە پیشەی نان پەیدا کردنیان ، ئەوجەلە ، گوفتاریان جوان‌و کرداریان ناشرین ئەبێ ، وە هەر ئامۆژگاری‌یەك بکەن بە گوفتار ، خۆیان هەڵی‌ئەوەشێننەوە بە کردار ، وە ئەبن بە سەرمەشقی خراپیی ، وەك

وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلاةِ ، وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إلا عَلَى الْخَاشِعِينَ (٤٥) الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُمْ مُلاقُوا رَبِّهِمْ

---

داوای یارمەتیی بکەن ( لە خوا ) بە خۆراگرتن‌و نوێژ کردن ، وە بێ‌گومان نوێژ(ی بەراستی بارێکی ) گەورەو گرانە مەگەر لای ئەوانە نەبێ کە لە خوا ئەترسن (٤٥) ئەوانەی کە پێیان‌وایە بەخزمەت خوای خۆیان ئەگەن ،

---

ئەوکەسانەی کە بە خەڵقی ئەڵێن خێر بکەن‌و زەکات بدەن ، کەچی خۆیان بەدرێژایی ساڵ نە خێر ئەکەن‌و نە زەکات ئەدەن با هەزاران دیناریشیان ببێ ، ئەو حەلە ، مەردوم سەرسام ئەبن لە کردەوەکانیان ، لەپاشا بەرەبەرە رووناکیی بیروباوەرر لەدڵیانا ئەکووژێتەوە ، وە تین‌و تەووژمی دەروونیان سارد ئەبێتەوە، وە برروایان نامێنێ نە بە زانایانی ئایین‌و نە بە ئایین •

دوای ئەوەی کە باسی خراپیی جوولەکەی کرد ، ئنجا **ئامۆژگاری‌یان ئەکات ، وە رێگایەکی کورت‌و بەکەڵکیان نیشان ئەدات ، ئەفەرموێ ( واستعینوا** بالصبر والصلاة ) **داوای یارمەتیی بکەن لەخوا لە هەمووکارێکی گرنگا ، بە خۆراگرتن‌و نوێژکردن •**

خۆراگرتن توێشەی هەموو تەنگانەیەکە لە ژیانا ، لەبەرئەوە قورئان لە ١٠٢ شوێن فەرمانی پێ‌ئەداو ئامۆژگاریی پێ‌ئەکات •

خۆراگرتن‌و دان بەخۆداگرتن لەسەر کردنی چاکەو نەکردنی خراپە بە دووشت دەست ئەکەوێ :

١ ـ بە بیرکردنەوەی لە پاداشی خوا لەسەر کردنی چاکەو نەکردنی خراپە •

٢ ـ بە نوێژ کردن ، چونکە بەراستی هەر نوێژی بەهۆش‌و گۆشە کە گەورەیی خوا ئەرروێنێ لە دڵو دەروونی مەردوما بەرەنگێك کە هەرگیز خوای لەبیر نەچێتەوە ، بەڵام بەراستی نوێژی‌وا ئێجگار گرانە ، دەست ناکەوێ مەگەر بەدەگمەن ، بۆیە ئەفەرموێ ( وانها لکبیرة الا علی الخاشعین ) نوێژی بەهۆش‌و گۆش ، بارێکی زۆر گەورەو قورس‌و گرانە ، مەگەر لای ئەوانە نەبێ کە لەخوا ئەترسن ( الذین یظنون انهم ملاقوا ربهم ) ئەوانەی کە پێیان‌وایە لە

وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَاجِعُونَ (٤٦) يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ
الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ ، وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ (٤٧)
وَاتَّقُوا يَوْماً لَا تَجْزِي نَفْسٌ عَنْ نَفْسٍ شَيْئاً ،

---

وە بۆلای ئەو ئەگەڕرێنەوە (٤٦) ئەی نەوەی ئیسرائیل یادی ئەو چاکانە بکەنەوە کە لەگەڵما کردوون ، وە من ( وەختی خۆی ) باوی ئێوەم دا بەسەر هەموانا (٤٧) وە خۆتان بپارێزن لەرۆژێك کە کەس لەجیاتی کەس پاداش نادرێتەوە ،

---

رۆژی دوایی‌دا بە خزمەت خوای خۆیان ئەگەن بۆ لێپرسینەوە ( وانهم اليه راجعون ) وە ئەوان بۆلای ئەو ئەگەڕرێنەوە ، واتە نوێژ لای ئەمجۆرە کەسانە گران نی‌یە ، بەڵکو زۆر ئاسانە ، وە لەشیان پێی سووك ئەبێ‌و گیانیان پێی پەرواز ئەکات •

دووبارە بانگی نەوەی ئیسرائیل ئەکاتەوە ، وە چاکەو میهرەبانیی خۆیان بیر ئەخاتەوە ، ئەفەرموێ ( يا بني اسرائيل ) ئەی نەوەی یعقوب پێغەمبەر ( اذكروا نعمتي التي أنعمت عليكم ) بیری ئەو چاکانە بکەنەوە کە وەختی خۆی رشتوومە بەسەرتانا ( واني فضلتكم على العالمين ) وە باوی باوو باپیرەکانی ئێوەمدا لەکاتی مووساو دوای ئەو ، تا ماوەیەکی زۆر ، بەسەر هەموانا ، بەهۆی رەوانەکردنی پێغەمبەرانی زۆر لەناوتاناو ناردنی نامەی ئاسمانیی بۆتان‌و هەڵخستنی پاشا ، تێ‌تانا ، بەڵام دوای ئەوەی کە لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکانیان دەرچوون ، وە سوپاسی چاکەی خوایان نەکرد ، وە پەیمانیان شکاند لەگەڵیا ، خواش خەشم‌و قینی خۆی رشت بەسەریانا ، وە پەرش‌و بڵاوی کردنەوە ، وە کردنی بە ئاردی‌ناودرر کان •

بەم‌رەنگە لەپێش ئامۆژگاری‌یەکەدا هەست بە گەورەیی‌و رێز ‹حورمەت›ی دانێ تا شەرم بیانگرێ‌و بێنەوە سەر رێی راست ، بەڵام لەگەڵ هەررەشە کردن بەسزای رۆژی دوایی‌دا ، ئەورۆژەی کە کەس ناتوانێ کەڵکی کەسی تیا بگرێ ، ئەفەرموێ ( واتقوا يوما لا تجزي نفس عن نفس شيئا ) خۆتان بپارێزن لە سزای

وَلا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَاعَةٌ ، وَلا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ ، وَلا هُمْ يُنْصَرُونَ (٤٨)

---

وە هیچ تکایەکی بۆ گیرا ناکرێ ، وە بارمتـەی لێ وەرناگیرێ ، وە ئەمانـە یارمەتیی نادرێن (٤٨)

---

رۆژی دوایی ، کە کەس لەجیاتی کەس تۆڵە یا پاداش نادرێتەوە ( ولا يقبل منها شفاعة ) وە تکای هیچ تکاکەرێکی بۆ گیرا ناکرێ ( ولا يؤخذ منها عدل ) وە بارمتەی لێ وەرناگیرێ ( ولا هم ينصرون ) وە یارمەتیی نادرێن ، بەم‌رەنگە کە سزایان لێ دوور بخرێتەوە ، واتە لەورۆژەدا هەر برروای چاكو کردەوەی پاك کەلك ئەگرێ .

لێرەدا باسێك هەیە لە تەفسیرەکانا زۆر درێژەی پێدراوە ، کە ئەویش باسی شەفاعەتی پێغەمبەرە بۆ گوناهکاران لە رۆژی دوایی‌دا ، هێندێك لە زانایان ئەڵێن هەیە ، هێندێکیش ئەڵێن : نی‌یە ، ئێمە لەم‌باسە قسە ناکەین ، نە بە بوون نە بە نەبوون ، بەڵام ئەوەندە ئەڵێم ، پێویستە لەسەر هەموو مسڵمانێك ، بـە هەموو هێزو تەوانایی خۆیەوە ، هەووڵ بدات بۆ بەجی‌هێنانی فەرمانانی ئایین‌و خۆپاراستن لەوشتانەی کە قەدەغەی ئەکات ، مەگەر گوناهێك نەبێ کە بە هەڵە لەدەست دەرچێ ، وە پەشیمان بوونەوەیەکی‌وای بـەدوادا بێ کـە هەرگیز ئەوکەسە نەگەررێتەوە سەری ، ئەوانەی کە لە گوناە سڵ ناکەن ، وە خۆیان لە هیچ ناگێررنەوە بەهیوای شەفاعەتی پێغەمبەر ، وەك کەسێك‌وان کە بەئاشکرا پیاو بکوژێ بەهیوای ئەوەی کە ئەگەر برریاری کوشتنەوەش درا ، سا بەڵکو لەپاشا بەبۆنەیەکەوە بەخشرێ ، یا شتێکی‌وا رووبدات ئەوی تیا بەرببێ ، دیارە ژیر شتی‌وا ناکات ، وە هەموکەسێك مەردومی‌وای بەلاوە شێتە .

* * *

ئنجا خوا یەك بەیەك ئەو چاكەو میهرەبانی‌یەکانی خۆی ئەبات ، کە لەگەڵ جوولەکەدا کردوونی ، وە [illegible] جۆرە [illegible] جوون بەبیر ئەو چاکانەوە ، کە یەکەمین [illegible] ، وە

وَإِذْ نَجَّيْنَاكُمْ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ : يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ، وَفِي ذَلِكُمْ بَلَاءٌ مِنْ رَبِّكُمْ عَظِيمٌ (٤٩)

---

( بیربکەنەوە ) کاتێك کە رزگارم کردن لە دەستو پێوەندی فیرعەون کە سزای سەختیان پێ‌ئەچەشتن ( بەم‌رەنگە ) کوررەکانیان سەرئەبررین‌و کچەکانیان ئەهێشتنەوە،وە لەمەتانا ، تاقی‌کردنەوەیەکی گەورە بوو لە پەروەردگارتانەوە(٤٩)

---

لە ئازارو سزایان ، وەکو ئەفەرموێ ( واذ نجيناكم من آل فرعون ) بیر بکەنەوە کاتێك کە رزگارم کردن لە دەستو پێوەندی فیرعەون ، کە ( يسومونكم سوء العذاب ) پێ‌یان‌ئەچەشتن سزای سەخت ، بەم‌رەنگە ( يذبحون أبناءكم ) کوررریان سەرئەبررین ( ويستحيون نساءكم ) و کچیان ئەهێشتنەوە تا دواتان ببررنەوە ( وفي ذلكم بلاء من ربكم عظيم ) وە لەم‌سزا سەختەی کە بەسەرتانا درا ، وە لە رزگار کردنتان لێی ، تاقی‌کردنەوەیەکی زۆر گەورەو گرانی تیایە بۆ ئێوە لەلایەن پەروەردگارتانەوە ، کە لەلایەکەوە فیرعەون‌و دەست‌وپێوەندەکەی بەسەرا زاڵ‌کردن ، لەپاشا مووسای بۆ ناردن تا رزگاری کردن .

هەموو سەختی‌و تەنگانەیەك کە بەسەر مەردوم ، یا بەسەر گەلا بێ ، تاقی‌کردنەوەیەکە ، لەلایەن خواوە ، بۆ ئەو بەندەیە ، یا بۆ ئەو گەلە ، ئنجا هەرکەسێك ، یا هەر گەلێك برروای بەمە بێ ، بەهرەمەند ئەبێ لەو سەختی‌و تەنگی‌یە ، وە دەرسی لێ‌وەرئەگرێ‌و توێشەی پاشەرۆژی لێ‌ئەخات ، وە لە بۆتەی ئەو سەختی‌یەدا قاڵ ئەبێ ، وە رۆژبەرۆژ لە خوا نزیك ئەکەوێتەوەو لێی ئەپاررێتەوە ، وە هەمیشە چاوەروانیی دەرووی لێ‌ئەکات .

مێژووشناسەکان ئەڵێن : یەکەم کەس لە نەوەی ئیسرائیل کە چووە مصر یوسف پێغەمبەر بوو ، لەپاشا یانزە براکەشی چوون بۆلای ، وە لە ماوەی

٤٣٠ ساڵ بوون بە ٦٠٠ هەزارکەس ، فیرعەون کە تەماشای کرد ، جوولەکە رۆژبەرۆژ زۆر ئەبن ، وە پشتی یەکتری ئەگرن ، وە پاڵ ئەنێن بە میسری یەکانەوە ، لەبەرئەوە فەرمانی دا بە بێگار پێ کردنیان ، وە لە هەرلایەك کارێکی قورس و گران ببوایە ، بەجوولەکەیان ئەکرد ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا رۆژبەرۆژ پەرەیان ئەسەند ، وە چاودێریی دەستوورو باوی کۆمەڵایەتیی خۆیانیان ئەکرد ، وە تێکەڵی میسری یەکان نەئەبوون ، چونکە بڕوایان وابوو کە خۆیان گەلێکی هەڵبژاردەی خوان ، وە نەوەی پێغەمبەرانن ، وە هاوتای هیچ گەلێك نیین ، لەمە ، میسری یەکان زۆر ترسان کە لە پاشەرۆژا زۆر بن ، وە وولاتەکەیان داگیر بکەن ، هاتن بڕیاریان دا کە نێرینەیان بکوژن و مێ ینەیان بهێڵنەوە ، وە فیرعەون فەرمانی دا بە مامانەکان کە هەر کوڕە جوولەکەیەك لەدایك بوو بیکوژن .

کاتێك کە مووسا بەفەرمانی خوا هاتە سەر فیرعەون بۆ بڕوا هێنان بەخواو دەست هەڵگرتن لە سزادانی جوولەکە ، وە بۆ ڕڕێدانیان بە چوونە دەرەوە ، لە خاکی میسر - فیرعەون رقی هەستاو فەرمانی دا بە سزادانی جوولەکە ، گەلێ لەجاران زیاتر ، وە خوا چەند معجزەیەکی دا بە مووسا ، وە فیرعەون ویستی بە جادووی جادووگەران بەرهەڵستی بوێستێ ، بەڵام کە جادووگەرەکان هەموو بڕوایان بە پێغەمبەریتی مووسا هێنا ، ئیتر فیرعەون بەناچاریی رێی جوولەکەکانی دا کە لەگەڵ مووسادا بڕۆن لە میسر ، لەپاشا فیرعەون پەشیمان بووەوە ، وە بەخۆی و لەشکرێکی زۆرەوە چوو بۆ گێڕانەوەیان ، کاتێك کە پێیان گەیشت ، بینی وائەوان خەریکن لە دەریای سوور ئەپەڕنەوە ، خێرا ئەمیش دوابەدوای ئەوان لە دەریاکەیان دا ، کاتێك کە جوولەکەکان لە دەریاکە دەرچوون ، وە ئەمان هەموو لەناو دەریاکەدا

وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ الْبَحْرَ فَأَنْجَيْنَاكُمْ، وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَوْنَ، وَأَنْتُمْ تَنْظُرُونَ (٥٠) وَإِذْ وَاعَدْنَا مُوسَىٰ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، ثُمَّ اتَّخَذْتُمُ الْعِجْلَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَنْتُمْ ظَالِمُونَ (٥١)

کاتێك کە دەریام بۆ لەت کردنو رزگارم کردن ، وە دەستو پێوەندی فیرعەونم خنکاند ، وە ئێوە تەماشاتان ئەکرد (٥٠) کاتێك کە بەڵێنی چل شەومان دا بە مووسا، لەپاشا گوێرەکەیەکتان بۆ پەرستن هەڵبژارد، وە ئێوە ستەمکار بوون (٥١)

بوون ، ئاو کشایەوە بەسەریانا ، وە هەموویانی خنکاند ، وەك ئەفەرموێ ( واذ فرقنا بكم البحر ) بیر بکەنەوە کاتێك کە دەریام بۆ لەتکردن ، لەوەختێکا کە لەدەست فیرعەون هەڵئەهاتن ، وە دەریا لەپێشتانەوەو لەشکری دوژمن لەدواتانەوە بوو ( فأنجيناكم ) ئنجا ئێوەم رزگارکرد ( وأغرقنا آل فرعون ) وە دەستو پێوەندی فیرعەونم لەدەریادا خنکاند ( وأنتم تنظرون ) وە ئێوە تەماشاتان ئەکردن .

باسی ئەم رزگار بوونەیان لە سوورەتە مکی‌یەکانی قورئانا ، بە دوورو درێژیی کراوە ، بەڵام لێرەدا بۆ بیر خستنەوەی جوولەکەکانە ، ئنجا با بزانین جوولەکەکان بەرانبەر بەمیهرەبانیی خوایە چی‌یان کرد ؟ بخوێنەرەوە تا تێ‌ئەگەیت .

* * *

لەدوای باسی رزگارکردنی جوولەکە لەدەست فیرعەون ، ئنجا باسی میهرەبانی‌یەکی‌تر ئەکات لەگەڵیانا ، ئەفەرموێ ( واذ واعدنا موسى أربعين ليلة ) بیر بکەنەوە کاتێك کە بەڵێنماندا بە مووسا ، کە لەدوای چل‌شەو خواپەرستیی لە کێوی توور ـ تەوراتی بە سرووش بۆ بنێرین ، کەچیی دوای چوونی مووسا بۆ کێوەکە ، گوێرەکەیەکیان لە زێرر دروست‌کردو دەستیان کرد بە پەرستنی ، وەکو ئەفەرموێ ( ثم اتخذتم العجل من بعده ) لەپاش چوونی مووسا بۆ کێوی توور ، گوێرەکەیەکتان کرد بەخوای خۆتانو دەستتان کرد بە پەرستنی ( وأنتم ظالمون ) وە ئێوە ستەمتان کرد لەخۆتان .

ثُمَّ عَفَوْنَا عَنْكُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٥٢) وَإِذْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَالْفُرْقَانَ ، لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ (٥٣) وإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ : يَا قَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنْفُسَكُمْ بِاتِّخَاذِكُمُ الْعِجْلَ ،

---

لەپاشا لێتان خۆش بووین بەڵکو سوپاس بکەن (٥٢) کاتێك کە تەوراتمان دا بە مووسا کە جیاکەرەوەیە ( لە ناوەندی دروستو نادروستا ) بەڵکو رێنموونیی بکەن (٥٣) کاتێك کە مووسا بە گەلەکەی ووت : ئەی گەلی خۆم بەراستی ئێوە ستەمتان کرد لەخۆتان کە گوێرەکەیەکتان هەڵبژارد ( بۆ پەرستن ) ،

---

باسی ئەم گوێرەکەیە بەدرێژیی لە سوورەی « أعراف »و « طه » دایە ، لێرەدا مەبەس هەر بیر خستنەوەیە ، وە بۆئەوەیە کە نیشان بدات جوولەکە هەر لە بنەڕەتەوە گەلێکی لاسار بوون لەگەڵ پێغەمبەرەکەی خۆیانا ، وە هەمیشە سەرپێچی‌یان کردووە لەگەڵیا ، چجای لەگەڵ پێغەمبەری ئیسلاما •

لەگەڵ ئەم کارە خراپەشیانا خوا هەر لێیان خۆش ئەبێ ، وە تەورات ئەنێری بۆ مووسا ، بەڵکو رێی راست بگرن ، وەکو ئەفەرموێ ( ثم عفونا عنكم من بعد ذلك ) لەپاشا لێتانخۆش بووین دوای پەشیمان بوونەوەتان ( لعلكم تشكرون ) بەڵکو سوپاسی خوا بکەن ، وە جارێکی‌تر لە فەرمانی دەرنەچن •

ئنجا باسی ناردنە خوارەوەی تەورات ئەکات کە بەڵێنی پێدابوو بە مووسا ، ئەفەرموێ ( واذ آتینا موسی آلكتاب والفرقان ) بیر بکەنەوە کاتێك کە تەوراتی جیاکەرەوە لەناوەندی دروستو نادروستا دامان بـە مووسا ( لعلكم تهتدون ) تا ئێوە رێنموونیی پێ بکەن ، وە رێی راستی پێبدۆزنەوە •

لە ئایەتی پێشوودا باسی خۆشبوونی خوای کرد لە پەرستنی گوێرەکەکە ، ئنجا باسی چۆنێتی ئەو پێخۆشبوونە ئەکات ، ئەفەرموێ ( واذ قال موسی لقومه : یا قوم ) بیر بکەنەوە کاتێك کە مووسا بە گەلەکەی خۆی ووت : ئەی گەلی خۆم ( انكم ظلمتم انفسكم باتخاذكم العجل ) ئێوە ستەمتان کرد لە خۆتان کـە

فَتُوبُوا إِلَى بَارِئِكُمْ ، فَاقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ ، ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ ، عِنْدَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ، إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (٥٤)

---

ئێستاش بگەڕێنـەوە بەپەشیمانیی بۆلای ئەوکەسەی کـە دروستی کردوون ( بەمڕەنگە ) خۆتان بکوژن ، ئەمە باشترە بۆ ئێوە لای ئەوکەسەی کە دروستی کردوون ، ( ئێوەش فەرمانەکەتان بەجێهێنا ) ئنجا خواش پەشیمانیی لێ گیرا کردن ، بەراستی هەر خوایە گیراکەری پەشیمانیی (و ) میهرەبان •

---

گوێرەکەکەتان کرد بە خوای خۆتان ( فتوبوا الی بارئکم ) ئێستاش بگەڕێنەوە بەپەشییمانیی بۆلای ئـەو خوایـەی کـە دروستی کردوون ، وە خۆتان پاك بکەنەوە لەم گوێرەکە پەرستانە ـ بەمڕەنگە ( فاقتلوا أنفسکم ) خۆتان بکوژن ، واتە ئەوانەی کە گوێرەکەیان نەپەرستووە ، با ئەوانە بکوژن کە گوێرەکەیان پەرستووە ، دیارە مەردوم کە برای خۆی کوشت ، وەك خۆی بکوژێ وایە ، بۆیە فەرمووی : خۆتان بکوژن ( ذلکم خیر لکم عنـد بارئکم ) ئەمە بۆخۆتان باشە لای ئەوکەسەی کە دروستی کردوون ، چونکە پاکتان ئەکاتەوە لە پیسی گوێرەکە پەرستیی ، کـە خۆتانتان پێ پیس کرد ، وە ئێوەش فەرمانەکـەی مووساتان بەجێهێنا ( فتاب علیکم ) ئنجا خواش تۆبەی لێ گیرا کردن ( انه هو التواب الرحیم ) بێگومان هەر خوایە گیراکەری پەشیمانیی‌و میهرەبان •

تەورات لەمباسەدا ئەفەرموێ : دوای چل رۆژەکە مووسا کە لەکێوی توور گەڕرایەوە ، دیی کەوا گەلەکەی گوێرەکەیەك ئەپەرستن ، لەبـە زۆر رقی هەستا ، وە گوێرەکەکەی سووتاند ، وە پێی‌ووتن : ئەوی پەشیمانە با بێتەوە لای من ، هەرچی نەوەی « لاویی » بوو ـ کە کوڕری سێهەمی یعقوبە ـ هاتنەوە لای مووسا ، وە پێی‌ووتن : خوا ئەفەرموێ هەموولایەکتان سەرو شیر هەڵگرن ، وە هەرکەسە خزم‌و خوێشی خۆی بکوژێ لەوانەی کە گوێرەکە ئەپەرستن ، ئەوانیش ئەوانەیان هەموو کوشت •

ئنجا با بزانیین ئەوانەی کە مانەوە لە جوولەکەکان‌و خوا تەوبەی لێ گیرا کردن ، چ بەهرەیەکیان وەرگرت لە تەورات ؟ بخوێنەرەوە ، تا تێئەگەیت •

* * *

وإِذْ قُلْتُمْ : يَا مُوسَى لَنْ نُؤْمِنَ لَكَ حَتَّى نَرَ اللهَ جَهْرَةً ، فَأَخَذَتْكُمُ الصَّاعِقَةُ وأَنْتُمْ تَنْظُرُونَ (٥٥) ثُمَّ بَعَثْنَاكُمْ مِنْ بَعْدِ مَوْتِكُمْ ، لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٥٦)

---

کاتێك کە بە مووساتان ووت : برروات پێناهێنین تا خوا نەبینین بەئاشکرا ، لەپرر هەورە تریشقەیەك لێیدان وە ئێوە تەماشاتان ئەکرد (٥٥) لەپاشا زینـدوومان کردنەوە دوای مردنتان ، بەڵکو سوپاس بکەن (٥٦)

---

دوای ئەوەی کە مووسا کەنەکـەی خۆی پاك کردەوە لـە. گوێرەکـە پەرست ، ئنجا حەفتا کەسی لێ هەڵبژاردن ، کە لەگەڵ خۆیا بییانبا بۆ کێوی توور ، کە لەوێ پەشیمان بوونەوەی خۆیان بەتەواویی دەربرن دەربارەی ئەو پەرستنی گوێرەکەیە ، کـە گەیشتنە ئەوێ بە مووسایان ووت : ئێمە پێت باوەرر ناکەین کـە تۆ گوێت لە دەنگی خوا بووە ، وە ئـەم تەوراتە ئەو بۆی ناردوویت ، تا خۆمـان بەئاشکرا خوا نـەبینین ، وەکو ئەفەرموێ ( **وإذ قلتم** یا موسی ) بیر بکەنەوە کاتێك کـە بە مووساتان ووت : ئەی مووسا ( **لن نؤمن** لك ) ئێمە برروات پێناهێنین ( حتی نری الله جهرة ) تا خوا نەبینین بەئاشکرا ، وە فەرمانمان پێنەدات کە برروات پێبێنین ( فأخذتکم الصاعقة وأنتم تنظرون ) لەپرر هەورە تریشقەیەك لێیدان ، واتە دای لەوانەی کە ئەم قسە زلەیان کرد ، وە ئەوانیکەیتر تەماشایان ئەکرد ، واتە هەمیشە ئەمە پیشەی جوولەکەکان بووە لەگەڵ مووسادا ، کەواتە هیچ جێی سەرسوورمان نییە ئەگەر لەگـەڵ پێغەمبەری ئیسلامیشا ئەمەندە لاسارو سەهندە بن •

( ثم بعثناکم من بعد موتکم ) لەپاشا بێدارمان کردنەوە دوای مردنتان ، واتە دوای ئەو بێهۆشییەی کە لەترسانا بەسەرتانا هات ( لعلکم تشکرون ) بەڵکو سوپاسی خوا بکەن •

مەبەس لەم مردنە بێهۆش کەوتنیانە لەترسانا وەك لە سوورەی «اعراف»دا ئەفەرموێ « واختار موسی قومه سبعین رجلاً لمیقاتنا ، فلما أخذتهم الرجفة قال : رب لو شئت أهلکتهم من قبل وإیای » •

وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ ، وَأَنْزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى ، كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ ،

بە هەور سێبەرمان لێ کردن ، وە گەزۆو شێلاقەمان بەسەردا رشتن ،( وە پێمان ووتن : ) بخۆن لەو خواردنە پاکانەی کە کردمان بەرۆزیتان ،

واتە مووسا حەفتا پیاوی هەڵبژارد لە گەلەکەی بۆ ئەو ماوەیەی کە بۆمان دانابوون ( لە چل رۆژەکە ) ئنجا کاتێك کـە لەترسانا لەرزە ـگرتنی مووسا ووتی : خوایە ئەگەربت‌ویستایە لەمەپێش منیش‌و ئەمانیشت لەناوئەبرد • بـەم ئایەتی سوورەی « اعراف » ، راڤە « تفسیر »ی ئایەتەکەی ئێرە ئەکات ، کـە مەبەس لە مردن بێ‌هۆش کەوتنە •

ئەوانەی کە بروسکەیان بەرکەوت‌و لەشیان سووتا زۆر پێویست بوون بە سێبەرو شوێنێکی فێنك ، وە بە خواردنێکی خۆش‌و بەهێز ، دیارە لەو چۆڵ‌و بیابانی سینایەدا ئەمانە دەست ناکەوون ســ مەگــەر خوا بەمیهرەبانیی خۆی بیان‌نێرێ ، وەکو ئەفەرموێ :

١ ـ ( وظللنا عليكم الغمام ) بە هەور سێبەرمان لێ کردن لە گەرمای دەشتی سینادا ، تا هەتاو نەتان‌سووتێنێ •

٢ ـ ( وأنزلنا عليكم المن والسلوى ) وە گەزۆو شێلاقەمان بەسەردا رشتن ، واتـە گەزۆیان بۆ ئەباریی بەسـەر دارو درەختـاو کۆیان ئەکردەوە ، وە شێلاقەش ـ کە جۆرە باڵندەیەکە لە کەو گەورەترە ـ هەموو رۆژێك بەزۆریی خوا بۆی ئەناردن ، وە ئەوانیش راویان ئەکرد ، هەروەك خۆشیان ئاژاڵیان بوو ، وە ماست‌و کەرەو دۆکەیان ئەخوارد ، بەڵام سەبزەو دانەوێڵەیان نەبوو ، هەروەك لەمەولا دەرئەکەوێ ، ئنجا پێمان‌ووتن ( كلوا من طيبات ما رزقناكم ) بخۆن لەو خواردنە پاکانەی کە کردمان بە رۆزیتان •

وَمَا ظَلَمُونَا ، وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ (٥٧) وَإِذْ قُلْنَا : ادْخُلُوا هَذِهِ الْقَرْيَةَ ، فَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَداً ، وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّداً ،

( ئەوان کە ناسوپاسی‌یان کرد ) ستەمیان لە ئێمە نەکرد ، بەڵکو ستەمیان لە خۆیان کرد (٥٧) کاتێك کە وو‌تمان : بچنە ئەم دێیە ( کە قدسە ) ، ئنجا لەوێ ( هەرچی ئارەزوو ئەکەن ) بخۆن بە تێرو تەسەلیی لە هەرلایەك کە حەزئەکەن ، وە لە دەرگاوە بچنە ژوورەوە بە ملکەچیی ،

ئنجا با بزانین سوپاسی ئەم میهرەبانی‌یەیان کرد یا نا ، لە ئایەتی دوایی‌یەوە وادەرئەکەوێ کە ناشکور بوون ، بۆیە ئەفەرموێ ( وما ظلمونا ) **ئەوان ستەمیان** لە ئێمە نەکرد ، چونکە ناتوانن زیان بە ئێمە بگەیەنن **( ولکن کانوا أنفسهم** یظلمون ) بەڵکو ستەمیان لە خۆیان کرد ، **چونکە زیانی گوناهەکەیان یەخەگیری** خۆیان بوو •

لەم فەرموودەیەوە دەرئەکەوێ کە هەرچی ئایین فەرمانی پێبدات بۆ قازانجی مەردومە ، وە هەرچی جڵەوگیریی لێ بکات بۆ دوورخستنەوەی زیانە لێی ، ئەگینا خوا خۆی نە لە چاکیی‌و خواپەرستیمان قازانج ئەکات ، وە نە لە خراپیمان زەرەرمەند ئەبێ •

* * *

هەروا باسی چاکەو میهرەبانیی خۆی‌و خراپیی‌و سەرپێچی جوولەکەکان ئەکات ، ئەفەرموێ ( واذ قلنا ادخلوا هذه القریة ) بیر بکەنەوە کاتێك کە پێمان‌وو‌تن : بچنە ناو ئەم دێیەوە کە بیت‌المقدسە ، وە خۆتان رزگار بکەن لە دەشتی چۆڵ‌و بیابانی سینە ، وە لەوێ هەمووجۆرە خواردەمەنی‌یەکتان دەست ئەکەوێ ، وەکو ئەفەرموێ ( فکلوا منها حیث شئتم رغدا ) ئنجا لە میوەی ئەوێ بخۆن بە تێرو تەسەلیی ، بە هەرچیی کە حەزی لێ‌ئەکەن ، وە لە هەرلایەك کە ئارەزوو ئەکەن ( وادخلوا الباب سجدا ) وە بچنە ناو شارەکەوە لەو دەرگایەی

وَقُولُوا حِطَّةٌ نَغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ ، وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ (٥٨)
فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا قَوْلاً غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ ، فَأَنْزَلْنَا
عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا رِجْزاً مِنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ (٥٩)

---

وە بڵێن : ( خوایە ! ) لە گوناهەکانمان خۆش ببە ، ئەوسا لە گوناهەکانتان خۆش ئەبین ، وە پاداشی چاکەکەرەکان زۆرتر ئەکەین (٥٨) کەچی ئەوانەی ستەمکار بوون ئەوی پێیانووترابوو گۆرری‌یان بە قسەیەك کە پێیان نەوترابوو ، ئێمەش رشتمان بەسەر ئەوانەی کە ستەمیان کرد سزا لە ئاسمانەوە

---

کە بۆتان دیاریی کراوە بە کوررنووش‌و ملکەچی بۆخوا ( وقولوا حطة ) وە بڵێن : خوایە داوات لێ‌ئەکەین کە گوناهەکانمان لێ‌داماڵیت ( نغفر لكم خطاياكم ) ئەوجەلە ئێمەش لەگوناهەکانتان خۆش ئەبین ( وسنزيد المحسنين ) وە پاداشی چاکەکەرەکان زۆرتر ئەکەین •

( فبدل الذين ظلموا قولا غير الذي قيل لهم ) کەچی ستەمکارەکان ئەوەی کە پێیانووترابوو گۆرری‌یان بە گوفتارێکی‌وا کە پێیان نەووترابوو ، واتە ئەوەی کە خوا فەرمانی پێ‌دان ــ لە چوونە ناو شاری « قدس » ــ نەیانکرد ( فأنزلنا على الذين ظلموا ) ئێمەش رشتمان بەسەر ئەوانەی کە ستەمیان کرد ( رجزاً من السماء ) سزا لـە ئاسمانەوە ( بما كانوا يفسقون ) بەهۆی ئـەو نافەرمانی‌یەی کە کردیان •

وەك لێرەدا یەکێك بڵێ : وا خواردەمەنی‌یان بۆ جێ‌بەجێ بوو ، ئەی ئاو کە مایەی ژیانیانە ؟ وەرام ئەداتەوە ئەفەرموێ « واذ استسقى موسى » •

* * *

هەروەها چاکەیەکی‌تریان بیر ئەخاتەوە کـە وەختێ خۆی کردوویەتی لەگەڵ باووباپیریانا ، ئەویش ئەوەبوو کاتێك کە جوولەکەکان لەگەڵ مووسادا هاتن بۆ دەشتی سینا ، بێ‌ئاوی‌یان بەخۆیانەوە دیی ، وە دەستیان کرد بە بۆڵەبۆڵ

وإذِ استسقى موسى لِقومِهِ ، فقلنا : اضرِب بِعصاكَ الحجرَ ، فانفجرت مِنهُ اثنتا عشرةَ عيناً ، قد علِمَ كلُّ اناسٍ مشربهم ، كلوا واشربوا مِن رِزقِ اللهِ ولا تعثوا فِي الأرضِ مفسِدِين (٦٠)

---

کاتێك کە مووسا داوای ئاوی کرد بۆ کەلەکەی ، ئێمەش پێمانووت : گۆچانەکەت بماڵە بەو تاشە بەردەدا ، ( کە پیاماڵیی ) دوانزە کانیی لێ هەلقولا ، بێ کومان هەموو بەرەیەك ئاوەخۆرەی خۆی ناسی ، ( وە پێمان ووتن ) : بخۆن‌و بخۆنەوە لە رۆزیی خوا ، وە بلاو مەبنەوە لە زەویی‌دا بە خراپە کردن (٦٠)

---

بەسەر مووسادا : کە تۆ ئێمەت لە میسر هێنایەدەرێ ، وە نا ئومێدت کردین لەو هەموو خۆش‌گوزەرانی‌یەی کە لەوێ بوومان ، ئێمە چی‌بکەین لەم دەشتە بێ‌ئاوە ، مووساش پاررایەوە لە خوا ، وە داوای ئاوی بۆ کردن ، وەکو ئەفەرموێ ( واذ استسقى موسى لقومه ) بیر بکەنەوە کاتێك کە مووسا داوای ئاوی کرد بۆ گەلەکەی ( فقلنا اضرب بعصاك الحجر ) ئێمەش پێمانووت : داردەستەکەت بماڵە بەو تاشەبەردەدا ، کە لەگەڵ پیاماڵیی ، بەردەکە شکاو ئاوی لێ‌دەرچوو ، وەکو ئەفەرموێ ( فانفجرت منه اثنتا عشرة عينا ) دوای ئەوەی کە دارەکەی پیاماڵی دوانزە کانیی لێ هەڵقولا بەقەد بەرەی دوانزە کوررەکانی یعقوب پێغەمبەر ( قد علم كل أناس مشربهم ) هەموو بەرەیەك ئاوەخۆرەی خۆی ناسی ، ئنجا پێمانووتن (كلوا واشربوا من رزق الله) بخۆن‌و بخۆنەوە لە رۆزیی خوا ،واتە لەو گەزۆ و شێلاقەیەی کە بەسەرتانا ئەرێژێ ، وە لەو ئاوەی کە بۆتان هەڵ‌ئەقوڵێ .

وادیارە هەر وەك ئاوی بۆ بەش‌بەش کردوون ، لەوەررو پاوانیشی بۆ دابەش کردوون ، تا کەس بەسەر کەسا نەچێ ، بۆیە ئەفەرموێ ( ولا تعثوا في الارض مفسدين ) وە بلاو مەبنەوە لە زەویی‌دا بە خراپە کردن ، واتە دەست‌درێژیی مەکەن نە بۆ پەوەندی یەکتریی ، وە نە بۆ ئازاڵی یەکتریی .

گەلی ئیسرائیل ٤٣٠ ساڵ مابوون لە میسر بەسووکیی‌و ریسوایی تا مووسا

وإذ قلتم : يا موسى لن نصبر على طعامٍ واحدٍ ، فادع لنا ربك يخرج لنا مما تنبت الأرض من بقلها وقثائها وفومها وعدسها وبصلها • قال : أتستبدلون الذي هو أدنى بالذي هو خير ؟ إهبطوا مصراً فإن لكم ما سألتم ،

---

کاتێك کە ووتتان : ئەی مووسا هەرگیز ناتوانین خۆمان رابگرین لەسەر یەك جۆرە خواردەمەنی ، کەواتە بۆمان داوا بکە لە پەروەردگارت کە بۆمان دەربێنێ لەوەی کە زەویی ئەیڕروێنێ : لە سەوزەواتی‌و ترۆزیی‌و سیریی‌و نیسکی‌و پیازی • ( مووسا ) ووتی : ئایا داوای ئەو شتە خراپانە ئەکەن لەجیاتی باشتر لەوان ؟ داکەرڕێنە خوارەوە بۆ شارێك ( لەم شارانی فەلەستینە ) ئەوحەلە چیتان‌داوا کردووەدەستان ئەکەوێ (بەلأم‌خوا نەکات‌ئەوەندەئازا بن ، لەبەرئەوە)

---

رزگاری کردن لە چنگی فیرعەون ، وە هێنانی بۆ دەشتی سینا ، تا فەلەستین‌یان پێ‌بگرێ ، هەرچەند لەکەلیانا خەریك‌بوو کەلکی نەبوو ، وە هەر لەو چۆڵ‌و بیابانەدا مانەوە ، بەبێ‌باران تا خوا گەزۆ و شێلاقەی بۆ ناردن ، وە بە معجزەی مووساکانی بۆ هەڵقولاندن ، بەلام هەر چاویان لە خزمەتکاری‌یەکەی میسرەوە بوو ، وە هەر رۆژەی بیانوویەکیان بە مووسا ئەگرت ، بۆئەوەی وەڕرسی بکەن ، تا بیانگێرێتەوە بۆ میسر ، وەکو ئەفەرموێ ( واذ قلتم : يا موسى ) بیر بکەنەوە کاتێك کە بە مووساتان ووت : ئەی مووسا ( لن نصبر على طعام واحد ) هەرگیز ناتوانین بەدرێژایی ساڵ خۆمان رابگرین لەسەر یەك‌جۆرە خواردەمەنیی کە گەزۆو شێلاقەیە ( فادع لنا ربك ) کەواتە بۆمان داوابکە لە پەروەردگارت ( يخرج لنا مما تنبت الارض ) کە بۆمان دەربێنێ لەوەی کە زەویی ئەیرروێنێ ( من بقلها ) لە سەوزەواتی ( وقثائها ) و ترۆزیی ( وفومها ) و سیریی (وعدسها)و نیسکی ( وبصلها )و پیازی • لەمە ، مووسا زۆر توورە بوو ، وە ( قال ) ووتی ( أتستبدلون الذي هو أدنى بالذي هو خير ) ئایا داوای ئەو شتە خراپانە ئەکەن لەجیاتی باشتر لەوان ؟ واتە گەزۆو گۆشتی شێلاقەکەی خۆتان ، کەلێ لەمانە باشترو خۆشترن کە داوای ئەکەن ، ئەگەر هەر حەزتان لەمانەشە ، ئازا بن لەم چۆڵی سینایە خۆتان رزگار بکەن ، وە ( اهبطوا مصرا فان لكم ما سألتم )

وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ وَالْمَسْكَنَةُ ، وَبَاءُوا بِغَضَبٍ مِنَ اللهِ ، ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللهِ ، وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ الْحَقِّ ، ذَلِكَ بِمَا عَصَوْا وَكَانُوا يَعْتَدُونَ (٦١)

درا بەسەریانا ریسوایی‌و بێ‌نەوایی ، وە خەشمی خوایان بۆ خۆیان هێنایەوە ، ئەمە لەبەرئەوە بوو کە بێ‌بڕوا بوون بە نیشانەو فەرمانە روونەکانی خوا ، وە پێغەمبەرانیان ئەکوشت بە نارەوا ، ئەم پڕکێشی‌یەشیان بەهۆی ئەوە بوو کە سەرپێچی‌و دەستدرێژی‌یان ئەکرد (٦١)

دا ئەڕژێنە خوارەوە بۆ شارێك لەم شارانی فەلەستینە کە هەرچیتان داوا کردووە تیایەتی‌و دەستان ئەکەوێ ، بەڵام خوا نەکات ئەوەندە ئازا بن شتی‌وا بکەن ، لەبەرئەوە ئەبێ هەروا بمێننەوە تا رۆژی خۆی ، وەکو ئەفەرموێ ( وضربت عليهم الذلة والمسكنة ) درا بەسەریانا ریسوایی‌و بێ‌نەوایی ( وباءوا بغضب من الله ) وە خەشمی خوایان بۆ خۆیان هێنایەوە ( ذلك ) ئەم ریسوایی‌و بێ‌نەوایی‌و خەشمی خوایەی کە بەبالایان بڕرا ( بأنهم كانوا يكفرون بآيات الله ) بەهۆی ئەوەوە بوو کە بێ‌بڕوا بوون بە معجزەکانی خوا ( ويقتلون النبيين بغير الحق ) وە پێغەمبەرانیان ئەکوشت بەداخەوە بەنارەوا بەهۆی سەرپێچی‌و نافەرمانی‌یانەوە[1] ( ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون ) ئەم پڕکێشی‌یەشیان لەسەر ئەم گوناهانە لەبەرئەوە بوو کە سەرپێچی‌و دەستدرێژی‌یان ئەکرد ، وە ئەمانە لەگەڵ سروشتیان تێکەڵ بوو بوو ، وە هەرچی سامی گوناه بێ بەسەریانەوە نەمابوو .

* * *

بەڕاستیی جوولەکە لە هەموو گەلێك دڵڕەقترو سەرسەختتر بوون ، لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان ، زۆریان لێ‌کوشتن ، یا سەریان‌بڕرین یا بە مشار دایان‌هێنان ، لەگەڵ ئەمیشە دان بە هیچ پێغەمبەرێکی‌ترا نانێن ، وە بڕروا بە هیچ ئایینێك ناکەن ، بەلایانەوە وایە کە خۆیان گەلی هەڵبژاردەی خوان ، وە

(١) مەبەس ئەم کوشتنە ئەمەیە نەك کوشتنی بەڕاستی‌یە ، چونکە هێشتا مووسا زیندووە وە پێغەمبەرێکیان نەکوشتووە .

إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا ، وَالَّذِينَ هَادُوا ، وَالنَّصَارَى ، وَالصَّابِئِينَ ..
مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحاً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ
عِنْدَ رَبِّهِمْ ، وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ ، وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢)

---

بەراستی ئەوانەی مسلمانن ، وە ئەوانەی جوولەکەن ، وە گاوورو ئەوانەی لەسەر ئایینی ابراهیمن ، هەرکامێك لەمانە برروای هێنا بـە خواو رۆژی دوایی ، وە کردەوەی باشی کرد ، پاداشیان بۆ هەیە لەلای پەروەردگاریانەوە ، نە ترسیان لەبەرەو نە خەنەت ئەخۆن (٦٢)

---

هەرخۆیان خاوەنی ئایینی بەراستین ، وە بەهەشت هەر بۆ ئەوانە ، وە میهرەبانیی خوا هەر لەگەڵ ئەوانە ، ئنجا قورئان لێرەدا بەدرۆیان ئەخاتەوە ، وە نیشان ئەدات کە هەموو ئایینێك هیخوایـە ، وە مەبەس لە هەموویان برروا هێنانە بەخواو سەردانەواندنە بۆ فەرمانانی ئەو ، بەجۆرێك کە ببێ بە سەرچاوەی کردەوەی باش لەگەڵ بەندەگانی خوادا ، وە چاکەو بەخشش‌و میهرەبانیی خوا وەنەبێ تەرخان بێ هەر بۆ گەلێك ، بەڵکو بۆ هەموو برروادارانە بەتێکرایی لە هەموو کاتێك ، وە لە هەموو شوێنێکا ، ئنجا مسلمان بن یا گاوور بن یا جوونەکە بن یا صابئی بن ، هەریەکە بەپێی کاتی خۆی ، وە بەپێی بیروباوەرو کردەوەی خۆی ، وەکو ئەفەرموێ ( ان الذین آمنوا ) ئەوانەی برروایان هێنا بە پێغەمبەری ئیسلام ، وە برروای پێ‌ئەهێنن تا رۆژی دوایی ( والذین هادوا ) وە ئەوانەی جوولەکەن ( والنصاری ) وە گاوران ( والصابئین ) وە ئەو عەرەبانەی کە لەپێش هاتنی پێغەمبەرا بت‌پەرست بوون‌و لەپاشا بەزێبیریی‌و بیری خۆیان تاك‌و تەنیایی خوایان دۆزیەوە ، وە چوونە سەر ئایینی ابراهیم پێغەمبەر ( من آمن بالله والیوم الآخر ) هەرکامێك لەمانە برروای هێنا بە خواو بە رۆژی دوایی ( وعمل صالحا ) وە کردەوەی باشی کرد ( فلهم أجرهم عنـد ربهم ) پاداشیان بۆ هەیە لەلای پەروەردگاریانەوە ( ولا خوف علیهم ) نە ترسیان لە سەرە ( ولا هم یحزنون )و نە خەفەت ئەخۆن ، واتـە ئەمانە هەرکامیکیان لـە دینی خۆیانا ــ پێش‌ئەوەی شۆرابێتەوە « نسخ » ــ برروایان بـە خواو رۆژی دوایی بووبێ ، وە بەپێی

وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ ، وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ :

کاتێك پەیمانمان لێوەرگرتن، وە (کێوی) توورمان بەرز کردەوە بەژوور سەرتانەوە،

ئاینەکەی خۆیان چاکەیان کردبێو دەستیان لە خراپە هەڵگرتبێ ، نە ترسیان هەیەو نە خەفەت ، واتە بایەخ بە بیرو باوەررو کردەوەیە ، نەك بەدەماری رەگەزیی‌و تیرەیی‌یە ، بەڵام ئاینێك کە شۆرایەوە بە ئاینێکی‌تر ئیتر ئەو ئاینە کۆنە بایەخی پێنامێنێ ، وە ئەبێ ئەو خاوەن ئاینە برروا بێنێ بە ئاینە تازەکە ، وە بە پێغەمبەرەکەی .

★ ★ ★

هەروا باسی خراپیی‌و سەرپێچی جوولەکە ئەکات لەکاتی مووسادا ، کە خوا چەند پەیمانێکی لەگەڵیا بەستن وەك باسی ئەکات لە ئایەتی ٨٣دا ، وە ئەوان بەڵێنیاندا بە بەجێ‌هێنانی ، وە چەند شتێکی نیشان‌دان لەوانەی کە مایەی برروا‌و دڵنیایی‌یان بێ ، ئەویش ئەوەبوو ـ وەك سید رشید رضا لە تەفسیری منارا ئەفەرموێ : ئەم جوولەکانە هەموو لە داوێنی کێوی توور بوون ، وە کێوەکە وەك بە زوورسەریانەوە بووبێ وابووە ، وا دەرئەکەوێ لە ئایەتی سوورەی « أعراف »ەوە کە ئەفەرموێ « وَإِذْ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ ، وَظَنُّوا أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ ، خُذُوا مَا آتَيْنَاكُمْ بِقُوَّةٍ ، وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ »[1] کە بوومەلەرزەیەکی بەهێز بووە ئەو کێوەی هێناوەتە جونبش‌و تەکان ، بەرەنگێکی‌وا کە جوولەکەکان ترساوون لەوەی کە کێوەکەیان بەسەرا برروخێ ، وە مووسا بەم‌بۆنەیەوە ئامۆژگاریی کردوون کە فەرموودەکانی خوا بەجێ‌بێنن ، نەوەك جارێکی‌تر ئەم‌کێوەتان بەسەرا برروخێنێ ، وەکو ئەفەرموێ ( واذ أخذنا میثاقکم ) بیر بکەنەوە کاتێك کە پەیمانمان لێوەرگرتن ( ورفعنا فوقکم الطور ) وە کێوی توورمان

(١) واتە کاتێك کە کێوەکەمان هێنایە شەق‌وشۆق لە ژوورسەریانەوە گۆیا کەپرێکە ، وە وایان گومان‌برد کە ئەرروخێ بەسەریانا ، ( وە پێمان‌ووتن: ) ئەوی پێمان‌داوون لە تەورات وەری‌بگرن بە ( هەموو ) هێز (ی خۆتان ) ، وە بیر بکەنەوە لەوانەی کە تیایەتی و کاری پێ‌بکەن ) تا خۆتان بپارێزن ( لە بێ‌فەرمانیی خوا ) .

خُذُوا مَا آتَيْنَاكُمْ بِقُوَّةٍ ، وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (٦٣) ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ ، فَلَوْلاَ فَضْلُ اللهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لَكُنْتُمْ مِنَ الْخَاسِرِينَ (٦٤)

---

( وە پێمان ووتن : ) ئەوی پێمان داوون ( لە تەورات ) باش کاری پێ بکەن ، وە بیر بکەنەوە لەوانەی کە تیایەتی ، بەڵکو خۆتان بپارێزن (٦٣) دیسان پشتتان هەڵکرد دوای پەیمان وەرگرتنەکە ، ئنجا ئەگەر بەخشش‌و میهرەبانیی خوا نەبوایە بەسەرتانەوە لە زەرەرمەنداں ئەبوون (٦٤)

---

بەرزکردەوە لە ژوورسەرتانەوە ، واتە لەپەنای ئەو کێوەدا ئێوەمان حەواندەوە ، بەم‌رەنگە خانووتان لێ‌هەڵکەند ، وە لە ئەشکەوتەکانیا ئارامتان گرت ، وە پێمان‌ووتن : ( خذوا ما آتیناکم بقوة ) تەورات بگرن بەراستی‌و کاری پێ‌بکەن ( واذکروا ما فیه ) وە بیربکەنەوە لەو فەرموودەو فەرمانانەی کە تیایەتی ، وە باسەکانی بەدەرس بڵێنەوە ، تاقورس ببەستێ لەدڵتانا ( لعلکم تتقون ) بەڵکو پارێزگاریی خۆتان بکەن لە نافەرمانیی خوا ، بەڵام خوا نەکات جوولەکە لەسەر ئەم رێگاراستە بمێنێتەوە ، وەکو ئەفەرموێ ( ثم تولیتم من بعد ذلك ) دیسان پشتتان هەڵکرد دوای ئەو پەیمانەی کە بەستتان ، بەڵام ئەمجارەش وەك هەمووجارێك میهرەبانیی خوا بەفریاتان گەیشت ، وەکو ئەفەرموێ ( فلولا فضل الله علیکم ورحمته ) ئەگەر بەخشش‌و میهرەبانیی خوا نەبوایە بەسەرتانەوە ( لکنتم من الخاسرین ) لە زەرەرمەندان ئەبوون •

خاوەنی تەفسیرەکان لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێن : خوا کێوی tووری هەڵکەند لە بن ، وە لەژوورسەری جوولەکەکانەوە رایگرت تا بترسن‌و کار بە تەورات بکەن ، بەڵام ـ وەك شیخ محمد عبده و سید رشید رضا و شیخ عبدالوهاب نجار ئەفەرموون ئەم‌مەعنایە دوورە •

★ ★ ★

وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ الَّذِينَ اعْتَدَوْا مِنْكُمْ فِي السَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ : كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ (٦٥)

---

بەراستیی ( دەنگ‌و باسی ) ئەوانە ئەزانن کە دەست درێژی‌یان کرد لە شەممەدا، ئنجا پێمانووتن : ببن بە مەیموونانی بێ‌نرخ (٦٥)

---

دیسان باسی نالەباریی‌و سەرپێچی جوولەکە ئەکات کە وەختی خۆی خوا لە حەفتەیەکا شەش رۆژی بۆ دانابوون کە کسب‌و کاری تیا بکەن ، وە تاقە رۆژێکی لێ قەدەغە کردبوون کە رۆژی شەموان بوو ، وە پێویستی کردبوو لەسەریان کە لەو رۆژەدا هەر خواپەرستیی بکەن ، وە نزیك کسب‌و کار نەکەونەوە ، بەڵام فەرمانەکەی خوایان شکاند ، بەم‌رەنگە شارێك بوو لەسەر دەریای سوور ، دانیشتۆکانی ئیش‌وکاریان هەر راوەماسیی بوو ، لەبەرئەوەی کە بەدرێژایی ساڵ هەموورۆژێك راوەماسیی‌یان ئەکرد شەموان نەبێ ، ماسی‌یەکان بە سروشت لەمە گەیشتبوون ، لەبەرئەوە شەموان دەرئەکەوتن بەسەر ئاوەکەوە، بەڵام لە رۆژەکانی‌ترا خۆیان ئەشاردەوە ، لەبەرئەوە راوچێ‌کان فێڵێکی جوولەکانەیان دۆزی‌یەوە ، بەم‌رەنگە قوولکەی زۆریان دروست کرد ، بەرەنگێك کە ماسی لە شەموانا هات تێی‌کەوێ ، وە نەتوانێ بگەرێتەوە ، تا لە رۆژی یەك‌شەموانا بیانگرن ، بەم‌جۆرە فەرمانەکەی خواو مووسایان شکاند ، وەکو ئەفەرموێ ( ولقد علمتم الذين اعتدوا منكم في السبت ) بەراستی خۆتان ئەزانن ئەی جوولەکە ، دەنگ‌و باسی ئەو جوولەکانەی کە ستەمیان کرد لە شەممەدا ، وە لەوسنوورەی کە خوا و تەوراتێ بۆی دانابوون ، دەرچوون ، وە شەممەیان شکاند ( [illegible]نا لهم كونوا قردة خاسئين ) ئێمەش پێمانووتن : ببن بە مەیموونە بێ‌نرخەکان ، واتە لە پایەی ئادەمێتی وەرنە خوارەوە بۆ پایەی جانەوەران ، ئەو جانەوەرانەی کە هەر خواردن‌و خواردنەوەو مڵوموش ئەزانن ، وە جڵەوی خۆیانیان بەدەست نی‌یە ، وە بەستیی بیروباوەرریان سێبەرێکی قورسی خستۆتەسەر دەم‌و چوو رەوخسارین ، کە ئەمە دەستوورێکی خوایی‌یە لەگەڵ

فَجَعَلْنَاهَا نَكَالاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِلْمُتَّقِينَ (٦٦)

ئەم سزایەمان کرد بە پەند بۆ مەردومانی ئەودەمەو ئەوانەی دوای ئەوان ، وە بە ئامۆژگاریی بۆ پارێزگاران (٦٦)

ئادەمیی‌دا هاتۆتە پێشەوە تا رۆژی دوایی ، بۆیە فەرمووی (فجعلناها نکالا لما بین یدیها وما خلفها ) ئەم سزایەسان گێرا بە پەندێکی زۆر قورس‌و گران بۆ مەردوومانی ئەو دەمەو ئەوانەی کە لەدوای ئەوان دێن تا رۆژی دوایی ( وموعظة للمتقین ) وە بە ئامۆژگاریی بۆ پارێزگاران .

* * *

دیسان گۆشەیەك لە لاساریی‌و ملنەدانی جوولەکە ئەگێرێتەوە بۆ پێغەمبەر ، بە باسی داستانی سەربرینی ئەو مانگایەی کە ئەم سوورەتەی بەناوەوە ناونراوە ، تا تێبگات کە چەندە سەرسەخت بوون لەگەڵ پێغەمبەرەکەی خۆیانا .

ئەگێرنەوە کە لەکاتی مووسادا یەکێك لەناو بێستانێکا ئەکوژرێ لەناوەندی چەند دێیەکا ، کەس نازانی کە کێ کوشتوویەتی ، لەپاشا داوا ئەکەن لە مووسا کە بکوژیان بۆ بدۆزێتەوە ، ئەویش ئەڵێ ـ وەك شیخ محمد عبدەو سید رشید رضا لە تەوراتەوە ئەگێرنەوە ـ : گوێرەکەیەکی مێچکە کە جووتی پێ نەکرابێ ، لە ملی بدەن لەسەر چەم‌و ئاوێکی پاك ، وە لەشوێنێك کە نەکێڵرابێ‌و دانەچێنرابێ ، ئنجا پیاوانی دینی لە نەوەی « لاویی » پێش‌بکەوون ، وە ناوی خوا بێنن ، وە هەرچی دانیشتووانی ئەو دیهاتانە هەیە بێن دەست‌بشۆن بە خوێنی ئەو گوێرەکەیە لە عاستی گوێرەکەکە ، وە هاوار بکەنە خوا بڵێن : خوایە بەدەستی ئێمە ئەم خوێنە نەرێژراوە ، وە چاومان پێ نەکەوتووە ، خوایە خۆش بە لە گەلی خۆت کە ئیسرائیلە ، ئنجا هەرچی ئەمەی کرد لەو کوشتنە بەدوور ئەبێ ، وە هەرچییش نەی‌کرد ، دەرئەکەوێ کە بکوژ ئەوە .

ئەم‌کردەوەیە کە باس‌کرا لە شریعەتی مووسادا وەك سوێند خواردن وایە لە ئایینی ئیسلاما ، چۆن یەکێك لە دادگە « محکمە »دا کە سوێند بدرێ ئەگەر

وَ إِذْ قَالَ مُوسى لِقَوْمِهِ إِنَّ اللهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا بَقَرَةً ، قَالُوا أَتَتَّخِذُنا هُزُواً قَالَ : أَعُوذُ بِاللهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ (٦٧)

کاتێك که مووسا بەگەلەکەی خۆی ووت : بێگومان خوا فەرمانتان پێ ئەدات که مانگایەك سەربررن ، ووتیان ئایا گاڵتەمان پێئەکەیت ؟ ووتی پەنائەگرم بەخوا که من له نادانانبم (٦٧)

سوێندەکەی خوارد شتەکەی ناچێتە مل ، وە ئەگەر نەیخوارد ئەچێتە ملی ، ئەم کردەوەیەش وابووە له شەریعەتی مووسادا ، وەکو ئەفەرموێ ( واذ قال موسى لقومه ) بیر بکەنەوە کاتێك که مووسا بە گەلەکەی خۆی ووت : ( ان الله يأمركم ان تذبحوا بقرة ) خوا فەرمانتان پێئەدات که مانگایەك سەربررن • جوولەکەکان ئەبوو خێرا فەرمانەکەی خوایان بەجێبێنایە ، **کەچی جگە لەوە** که بەجێیان نەهێنا پرسیارێکی ناشیرینیشیان لێکرد ، **که گۆیا مووسا بەزمانی** خواوە گاڵتەیان پێئەکات ، وەکو ئەفەرموێ **( قالوا )** ووتیان **( أتتخذنا هزوا )** ئایا **گاڵتەمان** پێئەکەیت ؟ **چونکه ئێمە پرسیارت لێئەکەین که کێ ئەو زەلامەی** کووشتووە ، **کەچی تۆ** داوای سەربررینی مانگایەکمان **لێئەکەیت ، ئەمە چی** بەسەرچییەوەیە ؟ **بەڵام ئەگەر جوولەکەکان برروایان به پێغەمبەرەکەی خۆیان** بوایە ، ئەم بیرە ناتۆڵایەیان دەربارە نەئەکرد ، لەبەرئەوە **( قال ) مووسا** ووتی گاڵتە بە سەردوم کردن کاری نادانە ( **أعوذ بالله ان أكون من الجاهلين** )وە من پەنا ئەگرم بەخوا که له نادانان بم ، واتە ئەوەی داتانە پاڵ من شایستەی پێغەمبەرێکی خاوەن ئایینو نامە نییە ، **کە خوا هەڵیبژاردبێ بۆ سرووشی** خۆی ، بەڵکو شایستەی کەسێکی نادانە •

لێرەدا جوولەکەکان ئەیانتوانی هەر مانگایەك بێنن سەریببررن ، ئەو حەڵە فەرمانەکەی خواشیان بەجێئەهێنا ، وە فەرمووده‌کەی مووساشیان ئەهێنایەدی بەڵام چونکە چۆن ئەبێ قۆرتو گرێ نەخەنە فەرمانی خواوە ؟

قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّنْ لَنَا مَا هِيَ ؟ قَالَ : إِنَّهُ يَقُولُ : إِنَّهَا بَقَرَةٌ لا فَارِضٌ وَلاَ بِكْرٌ ، عَوَانٌ بَيْنَ ذَلِكَ ، فَافْعَلُوا مَا تُؤْمَرُونَ (٦٨) قَالُوا : ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّنْ لَنَا مَا لَوْنُهَا ؟ قَالَ : إِنَّهُ يَقُولُ : إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَاءُ فَاقِعٌ لَوْنُهَا

ووتیان : پرسیارمان بۆ بکە لە پەروەردگارت پێمان بڵێ ئەو مانگایە چۆنە ؟ ووتی : خوا ئەفەرموێ : مانگایەك بێ نە زۆر پیرو نە زۆر جوان ، مامناوەندەیی بێ لە ناوەندی ئەمدوانەوا ، زوو بیکەن ئەوی فەرمانتان پێدراوە (٦٨) ووتیان : پرسیارنمان بۆ بکە لە پەروەردگارت پێمان بڵێ رەنگی مانگاکە چۆن بێ ؟ ووتی : خوا ئەفەرموێ : مانگایەکی زەردی تێر بێ

لەبەرئەوە ﴿ قالوا : ادع لنا ربك یبین لنا ما هي ؟ ﴾ ووتیان پرسیارمان بۆ بکە لە پەروەردگارت[١] تا پێمانبڵێ ئەو مانگایە چۆن بێ ؟ ﴿ قال : انه یقول : انها بقرة لا فارض ولا بكر ﴾ ووتی : خوا ئەفەرموێ : مانگایەك بێ نە زۆر پیرو نە زۆر جوان ﴿ عوان بین ذلك ﴾ مامناوەندیی بێ لەناوەندی ئەم دوانەدا ﴿ فافعلوا ما تؤمرون ﴾ زوو بەجێیبێنن ئەوەی فەرمانتان پێدراوە ، واتە ئەوەندە پرسیار مەکەن .

دووبارە ئەبوو لەمە زیاتر پرسیار نەکەن ، وە مانگایەکی مامناوەندیی سەرببرن ، وە خۆیان رزگار بکەن ، بەڵام چۆن ئەبێ جوولەکە ، زووبەزوو فەرمانی خوا بەجێبێنن ، ئەوەندە پرسیار نەکەن تا زۆر قورسی ئەکەن لەسەر خۆیان ، لەبەرئەوە ﴿ قالوا : ادع لنا ربك یبین لنا ما لونها ﴾ ووتیان پرسیارمان بۆبکە لە پەروەردگارت پێمانبڵێ رەنگی ئەو مانگایە چۆن بێ ؟ ﴿ قال : انه یقول : انها بقرة صفراء فاقع لونها ﴾ ووتی : خوا ئەفەرموێ : مانگایەکی زەردی

(١) ئەمەش یەکێکیترە لە بێشەرمیی جوولەکە ، کە بە پێغەمبەرەکەیان ئەڵێن : پرسیارمان بۆ بکە لە پەروەردگارت ، وەك خوا پەروەردگاری ئەوان نەبێ وایە .

تَسُرُّ النَّاظِرِينَ (٦٩) قَالُوا : ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّنْ لَنَا مَا هِيَ ؟ إِنَّ الْبَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ (٧٠) قَالَ : إِنَّهُ يَقُولُ : إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَا ذَلُولٌ تُثِيرُ الْأَرْضَ وَلَا تَسْقِي الْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَا شِيَةَ فِيهَا ، قَالُوا : الْآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ ، فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا يَفْعَلُونَ (٧١)

---

دڵی تەماشاکەران خۆش بکات (٦٩) ووتیان : پرسیارمان بۆ بکە لە پەروەردگارت پێمان بڵێ چۆن بێ ئەو مانگایە ؟ بەراستیی لێمان تێكچووە ، وە ئێمە ئەگەر خوا حەز بکات لە رێنموونیی کـەران ئەبین (٧٠) ووتی : خوا ئەفەرموێ : مانگایەك بێ نەشکابێتەوە نە بە کێلانی زەویی و نە بە ئاودانیسەوزایی ، بێنەنگو بێپەڵە بێ ، ووتیـان : ئائیستا نیشانەی راستت هێنـا ، ئنجا سەریانبڕریی ، وەلەوانەبوون کە نەیکەن (٧١)

---

تێر بێ ، بەجۆرێکیوا کەتەماشاکەران دڵخۆش بکات ، وەکو ئەفەرموێ ( تسر الناظرین ) دڵی تەماشاکەران روون بکاتەوە .

دیسان ئەبوو لێرەدا بوێستانایە ، وە پرسیاریتریان نەکردایە ، بـەڵام جوولەکە ئەبێ سەرپێچیی خۆی هەر نیشانبدات ، وە ئەوەندە پرسیار بکات تا وایلێئەکات بەدەگمەن دەستکەوێ ، لەبەرئەوە ( قالوا : ادع لنا ربك يبين لنا ما هي ) ووتیان : پرسیارمان بۆ بکە لە پەروەردگارت پێمانبڵێ چۆن بێ ئەو مانگایە ؟ ( ان البقر تشابه علينا ) چونکە بەراستیی لێمان تێكچووە ، واتە تازانیین ئیشکەر بێ یا بەرەڵلای ناوگاگەل بێ ؟ ( وانا إن شاء الله لمهتدون ) وە ئێمە ئەگەر خوا حەزبکات لەوانە ئەبین کە مانگایەکیوا بدۆزینەوە ( قال : انه يقول : انها بقرة لا ذلول ) ووتی خوا ئەفەرموێ : مانگایەك بێ نەچەوسابێتەوە ( تثير الأرض ولا تسقي الحرث ) نە بـە کێلانی زەویی و نە بە ئاودانی سەوزایی ( مسلمة لاشية فيها ) بێنەنگو بێپەڵە بێ ( قالوا : الآن جئت بالحق ) ووتیان : ئائێستا نیشانەی راستو دروستت هێنـا ( فذبحوها وما كادوا يفعلون ) ئنجـا

مانگاکەیان سەربرریی ، هەرچەند لەوانەبوون کـە سەریشی نەبررن ، واتـە لەپاش رەنجێکی زۆر دەستیان کەوت‌و سەریان‌برریی ••

ئنجا مووسا هەرچی پیاوانێك کـە نزیك بوون لە شوێن کوشتنەکـەوە سوێندی‌دان بەوجۆرەی کە لەپێشەوە باسکرا ، وە پاك‌و پیس لەیەك جیا بۆوە •

وەك شیخ عبدالوهاب نجار ئەڵێ لە کتێبی « قصص الأنبياء » کەیا : ئـەم چیرۆکە لێرەدا تەواو ئەبێ ، وە مەبەس لە گێررانەوەی ئەم نیوە چیرۆکە دووشـتە :ـ

یەکەم :ـ نیشاندانی نموونەیەك لە لاساریی‌و مل‌نەدانی جوولەکە بەرانبەر بە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیان کە ئەم رەووشت‌و خووە هەروا ماوەتەوە بۆ جوولەکـە ، لەکاتی مووسـاوە تا ئەمرۆ ، وە تا رۆژی دوایی ، واتـە ئەمە رەووشت‌و خووی جوولەکەیە بەپێی سروشت ، وە هەرگیز بەتەمای مسڵمان بوونیان مەبن ، وەك دەرئەکەوێ لە ئایەتی (٧٥) لەم‌سوورەتە کە ئەفەرموێ « أفتطمعون أن يؤمنوا لكم » •

واتە ئایا بەتەمان ئەی مسڵمانینە کە جوولەکە برروا بێنن بەئاینەکەتان ؟

دووهەم : ئامۆژگاریی مسڵمانانە بە وەرگرتنی هەموو فەرمانێکی ئاینی بە بێ‌پرسیارو قووڵ‌کردنەوە ، وەك لە سوورەی « مائده »دا ئەفەرموێ « يَا أَيُّها الَّذِينَ آمَنُوا لا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤكُمْ » •

واتە ئەی ئەوانەی برروواتان هێناوە ، پرسیار مەکەن لە شتانێك ئەگەر بۆتان دەرخرێ خەفەتبارتان بکات •

★ ★ ★

شیخ عبدالوهاب نجار لە کتێبی ناوبراویا ئەڵێ : « واذ قتلتم نفسا فادارأتم فيها » چیرۆکێکی دووهـەمە ، وە پەیوەندیی نی‌یە بـە چیرۆکی سەربررینی مانگاکەوە ، وە ئەفەرموێ : خوا ئەیەوێ بەم‌چیرۆکە چاکەیەکی خۆی باس بکات بەسـەر جوولەکـەوە ، وە باسی گرێ کوێرەیەکیان بکات کـە بۆی کردوونەتەوە بەرەنگێك کە بە بیری کەسا نەهاتووە تا ئەم چەند ساڵی دوایی‌یە ،

وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْساً فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا ، وَاللهُ مُخْرِجٌ مَا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ (٧٢) فَقُلْنَا : اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا

---

کاتێك کە یەکێکتان کوشت ، وە هەموو لە خۆتانتان دوور ئەخستەوە ، وە خوا ئاشکراکەری ئەوەیە کە ئەتانشاردەوە (٧٢) ئنجا ووتمان : بە ئەندامێکی ( کوژراوەکە ) لە گومانکە « متهم » کە بدەن

---

ئەویش بەهۆی کوشتنی یەکێکەوە بووە کە کوژراوە لە ماڵی خۆی یا لە گەڕەکەکەی ، یا لەناو جەنگێکی چەند کەسیدا ، بەرەنگێك کە نەزانراوە بەتەواویی کە بکوژ کێیە ، وە هەریەکە لەخۆی دوور خستۆتەوە ، وە سەپاندوویەتی بەسەر یەکێکیترا ، وە بکوژیش لەو چەندکەسە بەدەر نەبووە ئنجا خوا بۆئەوەی کە بکوژەکەیان بۆ بدۆزێتەوە ، یا بەلای کەمەوە چەمەرەی گومانەکە تەنگ بکاتەوە ، فەرمووی هەرچی گومانتان لێیەتی بییانهێنن ، وە کوژراوەکەش بێنن ، وە ئەندامی کوژراوەکە بماڵن بە کابرادا ، ئنجا ئەگەر ئەم کوشتنیی ئەوا شتێکیوای لێدەرئەکەوێ ، لە ترسانو رەنگ زەرد بوون ، یا لەرزینو هەڵبزرکان ، یا تێکچوونو سەرلێشێوان ، یا لاڵبوونو قسە بزرکان ، کە بزانرێ ئەم زەلامە کوشتوویەتی ، یا پەنجەی لە کوشتنەکەیا هەیە ، وەکو ئەفەرموێ ( واذ قتلتم نفسا فادارأتم فيها ) کاتێك یەکێکیان کوشت ، وە هەموو وونتان ئەکردو لەخۆتان دوور ئەخستەوە ، لەبەرئەوە خوا ئەفەرموێ ( والله مخرج ما كنتم تكتمون ) خوا ئاشکراکەری ئەوشتەیە کە ئەتان شاردەوە ، بەمرەنگەی کە ئەفەرموێ : ( فقلنا اضربوه ببعضها ) ئنجا پێمانووتن : بە ئەندامێکی کوژراوەکە لەوکەسە بدەن کە گومانتان لێیەتی ، واتە دەستی کوژراوەکە یا لاقی پێ بماڵن ، مووسا خۆی یا یەکێکیتریان بە فەرمانەکەی خوا ، یەكبەیەك پێ ئەماڵین ، وە مووسا لێیان وورد ئەبۆوە ، تا ئەوانەی

كَذَٰلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ (٧٣)

ئاوا خوا مردوو زیندوو ئەکاتەوە ، وە نیشانەهای ( گەورەیی ) خۆیتان پیشان ئەدات بەڵکو تێبگەن (٧٣)

بێ‌گوناح بوون لەدەست کوشتنەوە رزگاریان بوو ، وەکو ئەفەرموێ ( كذلك يحيي الله الموتى ) ئاوا وە بەمڕەنگە خوا مردوو زیندوو ئەکاتەوە ، واتە چۆن ئەوانەی کە لەژێر چنگی مردنا بوون رزگاری کردن‌و زیندووی کردنەوە ، مردووش ئاوا زیندوو ئەکاتەوە لە رۆژی دواییدا •

زیندووکردنەوە بەمەعنا پاسی ژیانی یەکێك لە قورئانا هاتووە وەك « وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا » مائدة /٣٢ •

واتە هەرکەسێك زینـدووی بکاتەوە ( بەمڕەنگە ببێ بـە مایەی ژیانی یەکێك ) وەك هەموو مەردومی زیندوو کردبێتەوە وایە •

( ويريكم آياته ) وە چەند نیشانەیەکتان لە دەسەڵات‌و گەورەیی خۆی نیشان ئەدات کە ئادەمیی‌وا دروست‌کردووە بە سروشت کە لەکاتی رق‌هەستانیا ئەگەر پەردە بەسەر چاوو دڵیا بێ‌و زەلامێك بکوژی ، لەپاشا کە رقەکەی خاو بۆوە پەشیمان بێتەوە ، وە دەست بـە دەستا بدات بۆئەوەی کـە لە دەستی دەرچووە ، نەخوازەلا کە کوژراوە کەش بێننە بەرچاوی ، وە بە بێ دەسەڵاتیی خۆی ترسی لێ‌بنیشێ‌و رەنگی زەرد ببێ ، وە دڵەکوتێی پێ‌بکەوێ‌و دەماری دەست‌بکات بە لێدان‌و هەڵبەررین •

( لعلكم تعقلون ) بەڵکو تێبگەن لە فەلسەفەی ئەحکام‌و شەرعی خوا ، وە بەمڕەنگە هەمووجارێك بکوژ بدۆزنەوە ، وە ئەم تەشریعە لە هەموو جارێکا بەکاربێنن نەك هەر لەمجارەدا •

ئەمرۆ ئاشکراو نمایانە ئەوکەسەی یەکێك بکوژێ لەشوێنێك ، هەرچەند چاوی بەوشوێنە بکەوێتـەوە تێك‌ئەچێ‌و ترسی لێ‌ئەنیشێ ، بەڵکو زۆر جـار دەست‌ئەکات بە گریان ، نەخوازەلا کە کوژراوەکە بێننە بەرچاوی ، وە دەستی کوژراوەکەی پیا بساڵێن •

ئەمرۆ زانین گەیشتووە بە ئەندازەیەك کە زۆر خووی ناخیی « غرائزی نفسی » دۆزیوەتەوە ، وە رامی ژێردەستی خۆی کردووە ، ئەوە ئەمریکا کە هۆکار « آلة »یکیوای دروست کردووە کە لێدانی دڵ ئەنووسێ ، وە نیشان ئەدات کە لە هەناسەیەکا چەند جار لێئەدات ؟ بەرز لێئەدات •• یا نزم ؟! توند لێئەدات یا سووك ؟! بەمرەنگە ئەو هۆکارە ئەبەسترێ بە دەمارێکەوە ، ئنجا راستیر « محقق » ناوی ئەو شوێنانەئەبات کە ئەگونجێ کوشتنەکەی تیابووبێ ، وە ناوی ئەوشتانە ئەبات کە ئەگونجێ پێیکوژرابێ ، وە ناوی ئەوکاتانە ئەبات کە ئەگونجێ تیا کوژرابێ ، وە ناوی ئەوکەسانە ئەبات کە ئەگونجێ پەیوەندییان بەو کوشتنەوە بێ ، بێگومان گومانگە « متهم » لەگەڵ ناوبردنی هەریەکێك لەوانەی کە دەخلی بێ لەگەڵ ئەو کوشتەدا ، دڵی خورپەیەك ئەکات ، وە دەماری لێئەدات بە لێدانێکی بەرزی بەپەلە ، ئەوسا نزم ئەبێتەوە ، وەك جارانی خۆی ، ئنجا راستیر ئەوشتانەی کە بە تاویردنی دڵی ئەکەوێتە پەلەپەل ، کۆیان ئەکاتەوە ، وە لەژێر رووناکیی ئەوشتانەدا تۆمارە « تقریر »یەکی دوورو درێژ ئەنووسێ لەوکوشتنەدا ، وە نیشان ئەدات کە لەکوێ ، وە لەکەیا ، وە بەچی ، وە لەگەڵ کیدا کوژراوە ، وە کوژراو هیچ پەلەقاژەی کردووە یا نا ؟

تەفسیری ئەم دوو چیرۆکە ، واتە چیرۆکی « واذ قال موسى لقومه إن الله يأمركم أن تذبحوا بقرة » وە چیرۆکی « واذ قتلتم نفساً فادارأتم فيها » مان کرد ، یەکەمیان لەسەر تەفسیری شیخ محمد عبده ، دووهەمیان لەسەر تفسیری شیخ عبدالوهاب نجار ، بەڵام تەفسیرەکانیتر هەموو لەسەرئەوەن کە ئەم دوو چیرۆکە یەکن ، و « واذ قتلتم نفسا » هەرچەند لە خوێندنەوەدا لەدواوەیە بەڵام لەمەعنادا لەپێشەوەیە ، چونکە کوشتنی زەلامەکە مایەی سەربرینی مانگاکەیە ، واتە کاتێك یەکێکتان کوشت ، وە بکوژ وونبوو لەناوا ، بە موساتان ووت کە بۆتان بدۆزێتەوە ، مووساش ووتی خوا ئەفەرموێ مانگایەك سەربرن ، وە پارچەیەك لە گۆشتی مانگاکە بماڵن بە کوژراوەکەدا زیندوو ئەبێتەوە ، وە پێتانئەڵێ کە کێ کوشتوویەتی •

عبدالوهاب نجار لەسەر ئەم تەفسیرە سێ خراپە ئەگرێ :

١ ـ ئەگەر تەماشای ئەم چیرۆکانە بکەین کە تائێستا باس کراوون ئەبینین هەموویان سەرەتاکانیان دامەزراوە بە ووتەی « واذ »وەك « واذ نجیناکم من ال فرعون ـ واذ فرقنا بکم البحر ـ واذ واعدنا موسی أربعین لیلة ـ واذ آتینا موسی الکتاب ـ واذ قال موسی لقومه یا قوم انکم ظلمتم انفسکم ـ واذ قلتم یا موسی لن نؤمن لك حتی نری الله جهرة ـ واذ قلنا ادخلوا هذه القریة ـ واذ استسقی موسی لقومه ـ واذ قلتم یا موسی لن نصبر علی طعام واحد ـ واذ أخذنا میثاقکم ـ واذ قال موسی لقومه إن الله یامرکم أن تذبحوا بقرة ـ واذ قتلتم نفسا فادارأتم فیها » •

ئەم دەستوورە کە دایمەزراندووە لەسەرەوە تاخوار بەمشێوەیە نیشان ئەدات کە « واذ قتلتم نفساً » چیرۆکێکی سەربەخۆیە ، دەخلی بەسەر پێشەوە نییە ، جگە لەوە کە ئەم پاش و پێشەش جوان نییە بۆ رەوان بێژیی قورئان •

٢ ـ قورئان ئەمەی تیا نییە کە پارچەیەك لە گوشتی مانگاکە درا بە کوژراوەکەداو زیندوو بووەوە ، وە ناوی بکوژەکەی خۆی ووت ، هەروەك لە فەرموودەی پێغەمبەریشا نییە ، وە ئەمە قسەی پرروپووچی جوولەکەکانە کە لەگەڵ گەلێ قسەیترا وەرگیراوون لەوانەی کە بەدیمەن مسڵمان بوون ، وەك « کعب الاحبار » •

٣ ـ ئەگەر بڵێین کوژراوەکە زیندوو بۆتەوە چ کەڵکێکی هەیە ، چونکە ئەو کوژراوە دوای زیندووبوونەوەی ، وەك مەردومیتر وایە کە گەواهی « شهادة »یەکەی بەتەنیا گیرا « قبول » نییە ، بەڵکو ئەبێ گەواهێك « شاهد »یتری لەگەڵا بێ ، تەنانەت ئەگەر گەواهیی بدات بۆ یەکێك لەسەر پەنجا فلس گیرا ناکرێ ، ئیتر چۆن بەقسەیەکی ئەو ، خوێنی ئادەمییەك ئەرژێنرێ ، ئەگەر ئەڵێت ئەم کوژراوە بە معجزەی پێغەمبەرێك زیندوو بۆتەوە ، کەوابوو ئەبێ قسەکەشی گیرابێ ، وانییە ، چونکە هەر زیندووبوونەوەکەی معجزەیە ، دوای ئەوە ئیتر قسەی وەك قسەی مەردومێکیتر وایە •

٤ ـ بەپێی دەستووری زمانی عەرەبی راناو « ضمیر »ێك ئەگەر دوولانە « مرجع »ی بوو ئەبێ بۆ نزیکەکەیان بچێتەوە ، وە ئەگەر بۆ دوورەکە چووەوە،

ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ ، فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ،

لەپاشا دڵتان رەق بوو دوای ئەم ( هەموو ) معجزانە ، وە دڵتان وەك بەرد بەڵكو گەلێك رەقترە ،

ئەبێ لانەكە بووترێتەوە ، تا نزیك بكەوێتەوە ، كەوابوو بردنەوەی راناوی « بعضها » بۆ « بقرة » كــە دوورە ، وە نەبردنەوەی بۆ « نفس » كە نزیكە پێچەوانەی دەستووری عەرەبی‌یە •

ئنجا بابزانین بۆچی لە شریعەتی مووسادا هەر مانگا هەڵبژێرراوە بۆ ئەم سەربڕرینە ؟ ئەگێرنەوە كە لەوحەلەدا گوێرەكە پەرستی باو بووە ، وە ئەمە كاری كردۆتە سەر بیرو باوەڕی جوولەكەكانیش بەجۆرێك كە خۆشەویستی گوێرەكە ، لە دڵو دەروونیانا سەوز بووبوو ، وەك لە ئایەتی « وَأُشْرِبُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ »[1] دەرئەكەوێ ، ئنجا بەمبۆنەیەوە خوا فەرمانی پێدان كە مانگایەك سەربڕن بەورەنگەی كە ووترا ، بۆئەوەی ئـەو بیرو باوەڕەیان بەرەبەرە كز ببێو نەمێنێ •

* * *

لەدوای باسی ئەم هەموو چاكانەی كە خوا كردیی لەگەڵ جوولەكەدا ، وە لەگەڵ ئەم هەموو معجزانەی كە خوا دای بە مووسا ، وەك پەڕرینەوەیان لە دەریای سوورو هەڵقوڵینی كانیی لــە تاشەبەردو باراندنی گەزۆو شێلاقە ، ئنجا دوایی‌یەكـەی ئەهێنێ بە شتێكیوا كــە هەرگیز چاوەڕوان نەئەكرا لــە جوولەكەوە ، بەڵكو پێچەوانەی ئەوە چاوەڕوان ئەكرا ، ئەفەرموێ ( ثم قست قلوبكم من بعد ذلك ) لەپاشا دڵتان رەق بوو دوای ئەم هەموو چاكەو میهرەبانی‌ـ یانەی كە لەگەڵتانا كرا ، وە دوای ئەم معجزانەی كە نیشانتاندرا ، واتە لــە جیاتی ئەوەی كە دڵتان نەرم بێ كەچی ( فهي كالحجارة أو أشد قسوة ) دڵتان وەك بەرد ، بەڵكو گەلێك رەقترە •

(١) واتە دلیان ئاودرابوو بە خۆشەویستی گوێرەكە •

وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الْأَنْهَارُ ، وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ ، وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللهِ ، وَمَا اللهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ (٧٤)

---

بەراستیی بەردیوا هەیە لە چەندلاوە جۆگەئاوی لێ هەڵئەقوڵێ ، وە هیوا هەیە کە لەتلەت ئەبێو ئاوی لێ دێتەدەرێ ، وە هیوا هەیە لەترسی خوا بەرئەبێتەوە ، وە خوا بێئاگا نیيە لەوەی کە ئەیکەن (٧٤)

---

( وان من الحجارة لما يتفجر منه الانهار ) وە بێگومان بەردیوا هەیە لە چەند لاوە جۆگە ئاوی لێ هەڵئەقوڵێ بەتەووزم وەك ئەم هەموو ئاوانەی کە لەم شاخە رەقو تەقانە دێنە دەرەوە •

( وان منها لما يشقق فيخرج منه الماء ) وە هیوای هەیە کە ئاو کاری تێئەکات ، وە بەرەبەرە شەقارشەقاری ئەکات •

( وان منها لما يهبط من خشية الله ) وە هیوای هەیە کە لەترسی خوا بەرئەبێتەوە لە تەوقەسەری شاخێکەوە بەهۆی بوومەلەرزە یا هەورە تریشقە یا بەفرو بارانەوە ، بەڵام دڵی ئەم جوولەکانە لەبەرد رەقترە ، چونکە بە هیچ رەنگێك داناچڵەکێ ، وە پەندو ئامۆژگاریی کاریان تێناکات ، وە معجزەو تاقی کردنەوەی خوا بێداریان ناکاتەوە ، ئنجا بە هەورەشەوە پێیان ئەڵێ ( وما الله بغافل عما تعملون ) خوا بێئاگا نیيە لەوەی کە ئەیکەن •

بەمئایەتە توندو تیژە دوایی ئەم مێژووچەی جوولەکەیەی هێنا کە پرر بوو لە بێبرروایی‌و سەرچەوتیی •

* * *

بە ئایەتی پێشوو رەق‌و تەقیی دڵ‌و دەروونی جوولەکەی نیشاندا کە هەرگیز هیوای چاکەو بڕواپان لێناکرێ ، ئنجا رووئەکاتە مسڵمانەکان ــ کە بەتەمای مسڵمان بوونی جوولەکەبوون ــ پرسیارێکی‌وایان لێئەکات کە نائومێدیی

أَفَتَطْمَعُونَ أَنْ يُؤْمِنُوا لَكُمْ ، وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللهِ ، ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِنْ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ ، وَهُمْ يَعْلَمُونَ ؟ (٧٥) وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا : آمَنَّا ، وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوا :

---

ئایا بەتەمان ( ئەی مسلمانینە ) کە ( جوولەکە ) برروابێنن بە ئاینەکەتان ؟ لەکاتێکا کە دەستەیەك لەوان فەرمووده‌ی خوایان ئەبیست ( لە تەورات ) ، کەچی لەپاش تێگەیشتنی دەستکاری‌یان ئەکرد ، وە ئەوان ئەشیانزانی ( کە ئەوە شتێکی نارەوایە ) !؟ (٧٥) کاتێك کە تووشی مسلمانەکان ببوونایە ئەیانووت: برروامان هێناوە ( بە پێغەمبەرەکەتان ) ، وە کاتێکیش کە لەپەنایەکەوە هێندێکیان بە هێندێکیان بگەیشتنایە ئەیانووت :

---

بکەیەنێ ، ئەفەرموێ ( افتطمعون أن یومنؤا لکم ) ئایا بەتەمان ئەی مسلمانینە کە جوولەکە برروابێنن بەئاینەکەتان ( وقد کان فریق منهم یسمعون کلام الله ) لەکاتێکا کە دەستەیەك لە زاناو پێشەواکانیان فەرمووده‌ی خوا ـ کە تەوراتە ـ ئەیانبیست ، کەچی ( ثم یحرفونه من بعد ما عقلوه ) لەپاش تێگەیشتنی ، دەستکاری‌یان ئەکرد بەپێی ئارەزووی خۆیان ( وهم یعلمون ) وە ئەشیانزانی کە ئەوە شتێکی نارەوایە ؟! ئنجا لەلایەك ئەوان وابن لەگەڵ پێغەمبەرو تەوراتەکەی خۆیانا ، ئەبێ لەگەڵ پێغەمبەری ئیسلامو قورئانا چۆن بن ؟ دیارە بە هەموو هێزو توانایی خۆیانەوە ، بەرانبەری ئەوێستن ، وە درۆو دەلەسەی بۆ هەڵئەبەستن •

ئنجا ئەیەوێ نیشانبدات کە جوولەکە لەگەڵ ئەو هەموو خرابی‌یەیانا ، ناپاكو ریاکاریشن ، ئەفەرموێ ( واذا لقوا الذین آمنوا قالوا : آمنا ) کاتێك کە جوولەکەکان تووشی مسلمانەکان ببوونایە ، ئەیانووت : ئێمە برروامان هێناوە کە ئێوە لەسەر ئاینێکی راستو دروستن ، وە محمد ئەو پێغەمبەرەیە کە تەورات موژدەی پێداوە ( واذا خلا بعضهم الی بعض ) وە کاتێکیش کە لەپەنایەکەوە هێندێکیان بەهێندێکیان بگەیشتنایە ( قالوا ) خوێندەوارەکان بە نەخوێندەوارەکانیان

أَتُحَدِّثُونَهُمْ بِمَا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَاجُّوكُمْ بِهِ عِنْدَ رَبِّكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ؟ (٧٦) أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ (٧٧)

---

ئەوە بە مسڵمانەکان ئەڵێن ئەوشتانەی کە خوا دەرگای زانینەکەی لە ئێوە کردۆتەوە ؟ تا بۆررتان بدەن بەو تەوراتەی کە لەلای پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتووە ؟ نابێ تێبگەن ؟ (٧٦) ئایانازانن کە خوا ئاگادارە بەوەی کە پەنهانی ئەکەنو ئەوەی کە ئاشکرای ئەکەن ؟ (٧٧)

---

ئەووت ( اتحدثونهم بما فتح الله عليكم ) ئەوە بە مسڵمانەکان ئەڵێن ئەوشتانەی کە خوا لە تەوراتا بەئێوەی وتووە ؟ وە دەرگای زانینەکەی لە ئێوە کردۆتەوە ، واتە ئەو ناونیشانانەی کە تەورات هەڵیان‌ئەدات بۆ دواترین پێغەمبەر بە مسڵمانەکانی مەڵێن ( ليحاجوكم به عنـدِ ربكم ) تا کێشەو دەمقاڵێتان لەگەڵ بکەن ، وە بۆررتان بدەن بەهۆی تەوراتەکەی خۆتانەوە کە بۆتان هاتووە لەلای پەروەردگارتانەوە ( أفلا تعقلون ) نابێ تێ‌بگەن •

ئنجا خوا سەرکونەیان ئەکات لەسەر ئەم دووروویی‌یە ئەفەرموێ ( أولا يعلمون أن الله يعلم ما يسرون وما يعلنون ) ئایا نازانن کە خوا ئاگادارە بەوەی کە پەنهانی ئەکەنو ئەوەی کە ئاشکرای ئەکەن ؟ واتە ئاگای لە ناپاکیی‌و دووروویی جوولەکەکانە کە رووبەرووی مسڵمانەکان چی‌ئەڵێن ، وە لەناوخۆشیانا چی‌ئەڵێن •

دوای ئەم روون‌کردنەوەیە ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە جوولەکە دوو دەستەن ، یەکێکیان نەخوێندەواری بۆرەپیاو کە هیچ نازانن لە تەورات ، مەگەر هیوای هیچ‌وپووچ ، وەك ئەوەی کە گۆیا خۆیان گەلی هەڵبژاردەی خوان ، وە خوا لە هەموو گوناهێکیان خۆش ئەبێ ، دووهەمیان خوێندەواری زۆرزان ، کە بەهرە وەرئەگرن لە نەخوێندەواریی بۆرەپیاوەکان ، بەم‌رەنگە کە درۆ ئەکەن بەدەم تەوراتەوە ، وە فەرموودەکانی هێندێکی هەڵ‌ئەگێرنەوەو هێندێکی وون ئەکەن ، وە هێندی شت لەخۆیانەوە ئەنووسنەوەو بڵاوی ئەکەنەوە ، بەناوی تەوراتەوە ، ئەمانە هەمووی بۆ قازانج‌و سوودی خۆیانە ، وەکو ئەفەرموێ

وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلَّا أَمَانِيَّ ، وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ **(٧٨)** فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ، ثُمَّ يَقُولُونَ : هَذَا مِنْ عِنْدِ اللهِ لِيَشْتَرُوا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ، فَوَيْلٌ لَهُمْ مِمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ ، وَوَيْلٌ لَهُمْ مِمَّا يَكْسِبُونَ **(٧٩)**

---

هێندێك لەوان نەخوێندەوارن تەورات نازانن هیوای هیچو پووچ نەبێ ، وە ئەوان هەر دوای گومان ئەکەوون **(٧٨)** ئنجا وای بۆ ئەوانەی کە تەوراتە ( تێکدراوە ) کە ئەنووسنەوە بە دەستی خۆیان ، لەپاشا ئەڵێن : ئەم ( نامەی)ـە لەخواوەیە تا شتێکی کەمی پێ بستێنن ، ئنجا وای بۆ ئەوان لەوەی کە دەستی ئەوان نووسیویتی‌یەوە ، وە وای بۆ ئەوان لەوەی کە پەیدای ئەکەن **(٧٩)**

---

( ومنهم أُميون ) **هێندێك لە جوولەکەکان نەخوێندەوارن ( لا یعلمون الکتاب الا امانی ) هیچ نازانن لە تەورات مەگەر هێندێك هیوای هیچوپووچ کە لە** خوێندەوارەکانیان بیستووە ، وەك ئەوەی کە ئەڵێن : جوولەکە نەبێ کەسی‌تر ناچێتە بەهەشت ، وە ئاگری دۆزەخ جوولەکە ناسووتێنێ چەند رۆژێکی کەم نەبێ ( وان هم إلا یظنون ) وە ئەو جوولەکە نەخوێندەوارانە هیچ جۆرە زانینێکی بەراستی‌یان نی‌یە کە لەسەر بناتێکی خوێندەواریی بێ‌مەگەر گومانێکی هیچوپووچ کەوا دوای‌کەوتوون ( فویل للذین یکتبون الکتاب بأیدیهم ) ئنجا وای بۆ ئەو زانایانەی کە تەوراتە تێکدراوەکەیان ئەنووسنەوە بەدەستی خۆیان ( ثم یقولون هذا من عند الله ) لەپاشا ئەڵێن : ئەم نامەیە لەخواوەیە ، وە فەرموودەی ئەوە ، وە بەمە دڵی نەخوێندەوارەکانی پێ‌رائەکێشن ، وە بە ناوی ئاینەوە ماڵیان ئەخۆن ، وەکو ئەفەرموێ ( لیشتروا به ثمناً قلیلاً ) تا بستێنن بەرانبەر بەوە شتێکی کەم ( فویل لهم مما کتبت أیدیهم ) وای بۆ ئەوان لەو تەوراتە تێکدراوەی کە دەستی ئەوان نووسیویتی‌یەوە ( وویل لهم مما یکسبون ) وە وای بۆ ئەوان لەوەی کە بەم‌فرروفێڵە پەیدای ئەکەن .

وَقَالُوا : لَنْ تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَعْدُودَةً ، قُلْ : أَتَّخَذْتُمْ
عِنْدَ اللهِ عَهْدًا فَلَنْ يُخْلِفَ اللهُ عَهْدَهُ ؟ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى اللهِ
مَا لَا تَعْلَمُونَ ؟ (٨٠) بَلَى مَنْ كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ
خَطِيئَتُهُ ،

---

( جوولەکەکان ) ووتیان ئاگری دۆزەخمان لێناکەوێ مەگەر چەندرۆژێکی ژمێرراو ، بلێ : ئایا پەیمانتان لەخوا وەرگرتووە تا خواش پێچەوانەی پەیمانی خۆی نەکات ؟ یا شتێکیوا هەڵئەبەستن بە دەم خواوە کە نایزانن (٨٠) نەخێر ! هەرکەسێك خراپە بکات ، وە تاوانەکەی خۆی دایگرێتەوە ،

---

واتە ئەی مسڵمانینە چۆن چاوەروانیی ئەوە ئەکەن کە ئەم جوولەکانە مسڵمان بن ؟ لەکاتێکا کە ئەوان لەگەڵ تەوراتەکەی خۆیانو پێغەمبەرەکەی خۆیان وا ناپاك بن •

* * *

لە ئایەتی پێشوودا فەرمووی زۆر لە جوولەکەکان دەستمایەی رزگار بوونیان لەرۆژیی دوایی‌دا هەر هیوای هیچوپووچە ، ئنجا وا باسی یەکێك لەو هیوایانە ئەکات کە هەرگیز لەگەڵ دادی خوادا یەك‌ناکەوێ ، ئەفەرموێ ( وقالوا ) جوولەکەکان ووتیان : ( لن تمسنا النار الا أیاما معدودة ) ئاگری دۆزەخ لە لەشمان ناکەوێ چەند رۆژێکی کەم نەبێ ، کە ئەویش ئەو چل رۆژەیە کە گوێرەکەکەیان تیا پەرست ، ئنجا خوا بە پێغەمبەر ئەفەرموێ ( قل اتخذتم عند الله عهداً ) پێیان بلێ : ئایا پەیمانتان لە خوا وەرگرتووە کە نەچنە دۆزەخەوە ؟ ( فلن یخلف الله عهده ) تا خواش پێچەوانەی پەیمانی خۆی نەکات، ( ام تقولون علی الله ما لا تعلمون ) یا شتێکیوا هەڵ ئەبەستن بەدەمخواوە کە نایزانن ، وە ئاگاتان لێی نییە ، واتە ئەم بیروباوەرە بێنرخانە هیچ مایەیەکیان نییە ، هیوای هیچوپووچی نادانانو درۆو دەلەسەی فێڵبازان نەبێ •

ئنجا خوا وەرامی بەراستییان ئەداتەوە لە وێنەی دەستوورێکی تێکرایی‌دا، ئەفەرموێ ( بلی ) نەخێر ! وانییە وەکو ئەڵێن ( من کسب سیئة وأحاطت بە خطیئتە ) بەڵکو هەرکەسێك خراپە بکات بەرەنگێك کە لە هەموولایەکەوە

فَأُولٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٨١) وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ، أُولٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٨٢) وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ : لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا اللهَ ، وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً

ئەوانە هاودەمی ئاگرن تیا ئەمێننەوە بەئێجگاریی (٨١) ئەوانەی کە برروایان هێناو کردەوەی باشیان کرد ، ئەوانە هاودەمی بەهەشتن تیا ئەمێننەوە هەتاهەتایە (٨٢) کاتێك کە پەیمانمان وەرگرت لە جوولەکە : کە کەس ناپەرستن خوا نەبێ ، وە چاکە بکەن لەگەڵ باوکو دایك

تاوان دایگرێتەوە، وە ببێ بە پێوەندی لە زیندانی گوناهانا ، وە لە هەموولایەکەوە دەرگای تەوبەو پەشیمان بوونەوەی لێداخات ، ئەوجەلە شایستەی ئەم سزایەیە کە ئەفەرموێ ( فاولئك أصحاب النار ) ئەوانە هاودەمی ئاگرن ( هم فیها خالدون ) تیا ئەمێننەوە هەتا هەتایە •

( والذین آمنوا وعملوا الصالحات ) ئەوانەی کە برروایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردووە ( اولئك أصحاب الجنة ) ئەوانە هاودەمی بەهەشتن ( هم فیها خالدون ) تیا ئەمێننەوە بەئێجگاریی ، واتـە پاداشی خوا بـەپێی کردەوەیە ، بەمرەنگە ئەگەر کردەوە باش بوو ئەوا پاداش باش ، وە ئەگـەر خراپ بوو ئەوا خراپ ئەبێ •

* * *

لەپێشەوە لە ئایەتی ٦٣دا بەکورتیی باسی ئەو پەیمانەی کرد کە خوا لـە جوولەکەی وەرگرت لـەژێر سێبەری کێوی توورا ، لێرەدا ئەیـەوێ تۆزێ بەدرێژتر باسی ئەو پەیمانە بکات کە چۆن شکاندیان ، ئەفەرموێ ( واذ أخذنا میثاق بنی اسرائیل : ) کاتێك کە پەیمانمان وەرگرت لە جوولەکە ( لا تعبدون الا الله ) کە کەس ناپەرستن خوا نەبێ ، واتە هەرپەرستشی ئـەو بکەن ، وە پەرستشی کەسیتر مەکەن لە فریشتەو ئادەمییو شتیتر •

( وبالوالدین احسانا ) وە لەگـەڵ باوکو دایکا چاکە بکەن ، ئەو باوکو

وَذِی الْقُرْبیٰ ،

و خزمان ،

دایکەی کە لەدوای هاتنە جیهانی ئێوە هەمیشە بە دڵو بە گیان شتیان فێرکردوونو ئاگاداریان کردوون ، ووتە بە ووتەیان ناوەتە سەر دەمتان تا فێری قسەکردنیان کردوون ، دەستیان گرتوونو هەنگاو بە هەنگاو بردوونیانن بەرێوە تا فێری ڕێڕۆینیان کردوون ، ساڵەهای ساڵ بە ڕەنجی شانو عەرەقی ناوچەوان گەورەیان کردوونو پێیان خوێندوون ، یا پیشەیەکیان فێر کردوون، چۆن سوپاسی باوكو دایك پێویست نییە لەدوای سوپاسی خوا ؟ ئەو باوكو دایکەی کە خۆشیو خۆشبەختی ئەویان باو « ترجیح » داوە بەسەر خۆشییو خۆشبەختی خۆیانا .

تەماشای پایەی باوكو دایك بکەن لای خوا چەند بەرزە کە لەدوای فەرماندان بەپەرستنی خۆی ، فەرمان ئەدات بە چاکە کردن لەگەڵ ئەوانا .

تائێستا ئامۆژگاریی ڕۆڵەو جگەرگۆشەی کرد بە چاکە کردن لەگەڵ باوكو دایکا ، ئنجا نۆرەی ئەوە بوو کە ئامۆژگاریی باوكو دایك بکات بە چاکە کردن لەگەڵ منداڵەکانیان ، کەچی نەیکرد ، چونکە خۆشەویستیی باوكو دایك بۆ منداڵی خۆیان لەگەڵ سروشتیانایە ، وە هەموو باوكو دایکێك بەسروشت منداڵی خۆی خۆش ئەوێ ، وە زیاد لەئەندازە خزمەتی ئەکات بۆیە خواش لێرەدا لێی بێدەنگ بوو ، وە چووە سەر باسی چاکەکردن لەگەڵ ئەو خزمانەی کە پایەیان لەخوار پایەی منداڵەوەیە ، فەرمووی ( وذی القربی ) چاکە بکەن لەگەڵ خوێشانو خزمان .

چاکەکردن لەگەڵ خزم ، خۆشەویستی زیاد ، وە پەیوەستیی بەهێز ئەکات ، بەرەنگێك کە هەموو خزمان وەك یەك کەسیان لێدێ ، وە هەموو خێزانەکانیان وەك یەك خێزانیان لێ دێ ، دیارە تا خێزانیش بەهێزتر

وَالْيَتَامىٰ ، وَالْمَسَاكِينَ ،

و هەتیوان و بێچارانا ،

بێ گەل بەهێزتر ئەبێ ، وە تا خێزان لە یەك هەڵوەشاوتر بێ ، گەلیش لە یەك هەڵوەشاوتر ئەبێ ، چونکە گەل لە خێزان دروست ئەبێ ، هەروەك خێزان لە چەندکەسێك پێكدێ ، هەزار رەحمەت لە شیخ محمد عبده کە ئەفەرموێ : « هەرکەسێك خێزانی نەبێ گـەلیشی نی‌یە » ، ئنجا هەرکەسێك چاکـەی بۆ کەس‌وکارو خزم‌و خوێشی خۆی نەبێ ، چۆن هیوای چاکـەی لێ‌ئەکرێ بۆ ئەم‌وئەو ، وە کەسێکیش کە چاکەی نەبێ بۆ مەردوم شایستەی ئەوە نی‌یە کە ئەندامێك بێ لە جەستەی کۆمەڵەو گەل •

ئنجا باسی مافی هەتیوان‌و هەژاران ئەکات ، ئەفەرموێ **( والیتامی ) چاکە** بکەن لەگەڵ هەتیوانا ، وە دەستیان بەسەرا بکێشن‌و چاودێری‌یان **بکەن‌و لـە** ئاموژاگاری‌یان دریغ مەکەن تا پێ‌یان ئەگەیەنن ، وە ئەیان‌کەن بـە ئەندامێکی بەهێز بۆ کۆمەڵ‌و گەل ، ئەمەش بە هیچ‌جۆرێك نابێ مەگـەر بە کردنەوەی هەتیوخانەو پەروەردەکردنیان ، بە پەروەردەکردنێکی بەرز ، ئەوانەی کە بەپێی ئەم فەرموودەیە ناکـەن ، وە هەتیو لـەناویانا بەرەڵلای کۆڵانانـە ، ئـەوانە گوناهبارن ، وە زووبەزوو تۆڵەی ئەوگوناهە ، یەخەگیریان ئەبێ ، بەم‌رەنگە ئەو هەتیوانە لەناویانا بێ رەووشت‌و خوو ئەبن ، وە ئەبن بە سەرمەشقی خراپیی‌و بێ‌شەرمیی لەناو منالانی‌ترا ، تا وای‌لێ‌دێ پیاو ناوێرێ بە کۆڵانانا برروا لـە ترسی یاریی‌و بێ‌شەرمیی ئەوان •

**( والمساکین )** وە چاکە بکەن لەگەڵ بێچارانا ، بەم‌رەنگە یا لـە ئیش‌و کارێکا دایان‌مەزرێنن ، وە یا دەست‌مایەیان بدەنێ‌و بیان‌خەنە گـەرر ، ئەوی ئەمەشی لەدەست نایـەت چی‌ئەتوانێ لـە دەست‌گیرۆیی بی‌کات ، بەلام ئـەو

وَقُولُوا : لِلنَّاسِ حُسْنًا ، وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ ، وَآتُوا الزَّكَاةَ ، ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا وَأَنْتُمْ مُعْرِضُونَ **(٨٣)**

وە قسەی جوان بکەن لەگەڵ مەردوما ، وە نوێژ بکەن‌و زەکات بدەن ، لەپاشا پشتتان هەڵکرد کەمێکتان نەبێ ، وە ئێوە پشت هەڵکەرن **(٨٣)**

مل‌هوورە زرتەبۆژانەی کە بەتەمەڵیی ئەسوورێنەوە ، وە داوای شت لە مەردوم ئەکەن ، ئەوانە نابێ هیچیان بدرێتێ •

ئنجا فەرمان ئەدات بە زبان‌شیرینی‌و ناوچەوان روونیی‌و قسەی باش لەگەڵ مەردووما ، ئەفەرموێ ( وقولوا : للناس حسنا ) وە قسەی جوان بکەن لەگەڵ مەردوما ، بەم‌رەنگە قسەتان خۆش‌و باش‌و بەکەڵك بێ ، وە ئەگەر ئامۆژگاریت کردن وای‌بکە کە لێت‌وەرگرن نەك تووڕە بن •

( وأقيموا الصلاة ) وە نوێژ بکەن ، واتە ئەو خواپەرستی‌یەی کە لەسەرتان پێویست‌کراوە بی‌کەن •

( وآتوا الزكاة ) وە زەکات بدەن ، واتە ئەو جۆرە دەست‌گیرۆیی‌یەی کە لەسەرتان دانراوە بیدەن •

لە ئایینی جوولەکەشا جۆرە زەکاتێك هەیە کە ئەبێ ئەندازەیەکی تایبەتیی بدەن بە نەوەی هارۆون ، وە ئەندازەیەك بدەن بە هەژاران چ لەپارەو چ لەبەری کشت‌وکاڵ‌و بەرزە درەخت ، وە هەموو زەمینێك لە هەموو حەوت ساڵێکا ئەبێ ساڵێك بە بەیاریی بمێنێتەوە ، وە لەوساڵەدا هەرچێکی لێ سەوزبوو ئەبێ بۆ هەژاران بێ ، ئەمانە هەروەك بنیاتی ئایینی ئیسلامن ، بنیاتی ئایینی جوولەکەشن ، لەمەوە دەرئەکەوێ کە ئایینی خوا هەموو چونیەکن ، وە جیاوازی‌یەکی چەندانیان نی‌یە ( ثم توليتم الا قليلا منكم ) دوای ئەم پەیمانە پشتتان هەڵکرد مەگەر کەمێکتان نەبێ ( وأنتم معرضون ) وە ئێوە هەر پشت هەڵکەرن •

وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَاءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنْفُسَكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ ، ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنْتُمْ تَشْهَدُونَ (٨٤) ثُمَّ أَنْتُمْ هٰؤُلَاءِ تَقْتُلُونَ أَنْفُسَكُمْ ،

---

کاتێك پەیمانمان لێوەرگرتن :کە خوێنی یەکتریی نەرێژن، وە خۆتان دەربەدەر نەکەن لە وولاّتتان ، لەپاشا برریارتان دا ( لەسەر ئەم پەیمانە ) وە ئێوە (خۆتان) گەواهیی لەسەر ئەدەن (٨٤) لەپاشا ئێوە هەر ئەوانەن کە یەکتریی ئەکوژن .

---

لە ئایەتی پێشوودا خوا هێندێ شتی بیرخستنەوە لەوانەی کــە فەرمانیان پێدراوەو نایکەن . لە دووئایەتی دواییەدا هێندێ شتیان بیر ئەخاتەوە لەوانەی کە جلّەوگیرییان لێکراوە کەچی ئەیکەن ، ئەفەرموێ **( واذ أخذنا میثاقکم )** بیر بکەنەوە کە لەکاتی مووسادا پەیمانمان لێوەرگرتن **( لا تسفکون دماءکم )** کە خوێنی یەکتریی نەرێژن **( ولا تخرجون أنفسکم من دیارکم )** وە خۆتان دەربەدەر نەکەن لە وولاّتتان ( ثم أقررتم ) لەپاشا برریارتاندا لەسەر ئەم پەیمانە ( وأنتم تشهدون ) وە ئێوە ـ ئەی جوولەکەی مدینة ـ گەواهیی ئەدەن لەسەر ئەم پەیمانە کە وەختی‌ خۆی باووباپیرانتان بەستوویانە لەگەڵ خوادا ( ثم أنتم هؤلاء ) دوای ئەم پەیمانە ئێوە هەر ئەوانەن کــە پەیمانەکەتان شکاند ، وەکو ئەفەرموێ ( تقتلون أنفسکم ) یەکتریی ئەکوژن .

لە مدینە لەپێش ئیسلاما دوو تیرەی عەرەبی بتپەرست بوون « أوس »و « خزرج » کــە ئەمانە دوژمنی یەك بوون ، وە هەمیشــە لەجــەنگا بوون ، هەروەك سێ تیرەی جوولــەکەشی تیــابوو « بنو نضــیر » و « بنو قریظة »و « بنو قَیْنُقاع » یەکەمو دووهەم لەگەڵ ئەوس‌و سیهەم لەگەڵ خزرج بووبوون

وَتُخْرِجُونَ فَرِيقاً مِنْكُمْ مِنْ دِيارِهِمْ ، تَظَاهَرُونَ عَلَيْهِمْ بِالْأَثْمِ وَالْعُدْوَانِ ،

وە هێندێك لە خۆتان دەربەدەر ئەکەن لە وولاتیان ، وە پشتیوانیی ( بێگانە ) ئەکەن بەسەریانا بە بەدییو دەستدرێژیی ،

بە سوێندخوار ، ئنجا هەرچەند أوس‌و خزرج بکەوتنایەتە جەنگەوە ، ئـەم سێ‌تیرەیەش لەگەڵیانا ئەکەوتنــە جەنگەوە ، وە ئەبوون بە پشتیوانی عەرەبە بت‌پەرستەکان بۆ کوشتنی برا جوولەکەکانیان ، ئنجا بەم‌بۆنەیەوە یەکتری‌یان ئەکوشت وە ماڵی یەکتری‌یان وێران ئەکرد ، کە ئەمە حەرام بوو بەپێی ئــەو پەیمانەی کە خوا لەگەڵیانا بەستبووی ، دیارە کــە کوشتار بوو ئەبێ دیلیش بێ ، کە دیلیش بوو ئەبێ دەربەدەریش بێ ، وەکو ئەفەرموێ ( وتخرجون فریقا منکم من دیارهم ) هێندێك لە خۆتان دەربەدەر ئەکەن لە جێگاو رێگای خۆیان ( تظاهرون علیهم ) پشتیوانیی بێگانەکان ئەکـەن بۆ زاڵبوون بەســەر جوولەکەکانا ( بالاثم والعدوان ) بەگوناەو دەستدرێژیی وەك کوشتن‌و تاڵان‌و بڕرۆو دەربەدەر کردنیان بێ •

سەیر لەوەدایە کە جەنگ ئەبڕرایەوە ، جوولەکــەکان لە هەردوولا ، دیلەکانی خۆیانیان ئەکڕری‌یەوە ، چونکە ئەیان‌ووت : تەورات وا فەرمان ئەدات کە جوولەکــە نابێ بەدیلیی بمێنێتەوە ، ئنجا ئەگــەر ئەوان بە تەورات ئیش ئەکەن بۆچی جەنگ لەگەڵ جوولەکــەدا ئەکەن‌و ئەیان‌کوژن‌و دەربەدەریان ئەکەن ، خۆ تەورات هەر وەك دیلیی جوولەکەی قەدەغە کردووە ، ئەمانەشی قەدەغە کردووە ، کەوابوو ئەمە یاریی‌کردنە بــە تەورات ، وەکو ئەفەرموێ

وَإِنْ يَأْتُوكُمْ أُسَارَى تُفَادُوهُمْ ، وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ ، أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ؟ فَمَا جَزَاءُ مَنْ يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنْكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا، وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ ،

---

وە ئەگەر دیلتان بۆ بێنن ( لە خۆتان ئەیانکررنەوەو ) بریتی‌یان بۆ ئەدەن ، لەگەڵ ئەمیشە کە دەربەدەر کردنیشیان قەدەغە کراوە لێتان ( بۆچی رەفتار-بەوەیان ئەکەن‌و بەمەیان ناکەن ؟ ) ئایا برروا ئەهێنن بە هێندێك لە تەورات‌و بێ‌برروایي ئەکەن بە هێندێکی‌تری ؟ تۆڵەی ئەوکەسانەی کە وا بکەن لە ئێوە هەر ریسوایي‌و بەدناوي‌یە لە جیهانا ، وە لە رۆژی دواییشا ئەیانگێررنەوە بۆ سزای هەرە سەخت ،

---

( وان يأتوكم أسارى تفادوهم ) ئەگەر دیلتان بۆ بێنن لە خۆتان ئەیانکردنەوەو بریتی‌یان بۆ ئەدەن ، چونکە تەورات پێویستی کردووە لەسەرتان کە جوولەکە بەدیلی نەمێنێتەوە ( وهو محرم عليكم اخراجهم ) لەگەڵ ئەمیشە کە تەورات یەکتری دەربەدەر کردنیشی قەدەغە کردووە ، کەواتە بۆچی کار بەوەیان ئەکەن‌و بەمەیان ناکەن ؟ ( أفتؤمنون ببعض الكتاب ) ئایا برروا ئەهێنن بە هێندێك لە تەورات وەك کررینەوەی دیلی جوولەکە بێ ( وتكفرون ببعض ) وە بێ‌برروایی ئەکەن بە هێندێکی‌تری ، وەك جڵەوگیری‌یی بێ لە کوشتنی جوولەکەو دەربەدەر کردنی ٠

ئنجا هەررەشەیان لێئەکات لەسەر ئەم هەڵوەشاندنەوەی پەیمانە لە هەردوو جیهانا ، ئەفەرموێ ( فما جزاء من يفعل ذلك منكم ) تۆڵەی ئەوکەسانەی کەوابن لە ئێوە ( إلا خزي في الحياة الدنيا ) هەر ریسوایی‌و بەدناوی‌یە لە جیهانا ( ويوم القيامة يردون الى أشد العذاب ) وە لە رۆژی دواییشا ئەیانگێررنەوە بۆ سزای

وَمَا اللهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ (٨٥) أُولئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالآخِرَةِ ، فَلا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلا هُمْ يُنْصَرُونَ (٧٦) وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ ، وَقَفَّيْنَا مِنْ بَعْدِهِ بِالرُّسُلِ ، وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ

---

وە خوا بێ‌ئاگا نی‌یە لەوەی کە ئەیکەن (٨٥) ئەمانە ئەوانەن کە ژیانی جیهانیان کرری بە دوارۆژ ، ئیتر نە سزایان بۆ سووك ئەکرێ‌و نە یارمەتیی ئەدرێن (٧٦) بەراستی ئێمە تەوراتمان دا بە مووسا ، وە دوابەدوای ئەو پێغەمبەرانمان نارد ، وە چەند نیشانەیەکی رۆشنمان دا بە عیسای کوڕری مریەم

---

هەرەسەخت ( وما الله بغافل عما تعملون ) وە خوا بێ‌ئاگانی‌یە لەوەی کە ئەیکەن •

ئنجا رووئەکاتە مسڵمانان‌و پێیان‌ئەڵێ ( اولئك الذين اشتروا الحياة الدنيا بالآخرة ) ئەم جوولەکانە ئەوانەن کە ژیانی جیهانیان کریی بە دوارۆژ ، واتە دەستیان لە دوارۆژ هەڵگرت بۆ جیهان ( فلا يخفف عنهم العذاب ) ئیترنە سزایان کەم ئەکرێتەوە ، وەکو خۆیان ئەڵێن : « لَنْ تَمَسَّنَا النَّارُ إلا أيَامَاً مَعْدُودَةً »(١) ( ولا هم ينصرون ) وە نە یارمەتیی ئەدرێن •

* * *

تا ئێستا باسی سەرچەوتیی‌و نالەباریی جوولەکەی کرد لەگەڵ یەکەمین پێغەمبەرەکەیان کە مووسا بوو ، ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە لەدوای مووسا گەلێ پێغەمبەری‌تری بۆ ناردوون کە دواهەمینەکەیان عیسا بوو ، بەڵام ئەمان لەگەڵ هەموویانا هەر سەرچەوت‌و خراپبوون ، وەکو ئەفەرموێ ( ولقد آتينا موسى الكتاب ) ئێمە تەوراتمان دا بە مووسا ( وقفينا من بعده بالرسل ) وە دوابەدوای ، ئەو پێغەمبەرانی‌ترمان بۆ ناردن ، تا نۆرەی عیساهات ( وآتينا عيسى ابن مريم البينات ) وە چەند نیشانەیەکی رۆشنمان دا بە عیسای کوڕری

---

(١) واتە ئاگری دۆزەخ لێمان‌ناکەوێ چەندرۆژێکی ژمێرراو نەبێ •

وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ ، أَفَكُلَّمَا جَاءَكُمْ رَسُولٌ بِمَا لَا تَهْوَى أَنْفُسُكُمُ اسْتَكْبَرْتُمْ ، فَفَرِيقاً كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقاً تَقْتُلُونَ ؟ (٨٧)

---

وه یارمەتیمان دا بە گیانێکی پاك ، ئایا هەرچەند پێغەمبەرێکتان بۆبهاتایە بە دەستوورێکیواوە کە رێکی ئارەزووتان نەبوایە سەرکێشیتان نەئەکرد ؟ ئنجا دەستەیەکتان ( لە پێغەمبەران ) بە درۆ ئەختەوەو دەستەیەکتان ئەکوشت (٨٧)

---

مەریەم ( وأیدناه بروح القدس ) وە یارمەتیماندا بە گیانێکی پاك کە فریشتەی سرووشە ، بەڵام خوا نەکات ئێوە برروایان پێبکەنو دوای فەرمودەکانیان بکەوون •

( أفکلما جاءکم رسول بما لا تهوی أنفسکم استکبرتم ؟ ) ئایا ئێوە هەر ئەوە نەبوون ، هەرچەند کە پێغەمبەرێکتان بۆ بهاتایە بە دەستوورێکیواوە ، کە رێکی ئارەزووتان نەبوایە ، سەرکێشیتان ئەکرد لە فەرموودەو فەرمانەکانیان ؟ ( ففریقا کذبتم )ئنجا دەستەیەکان لە پێغەمبەرەکان بەدرۆ ئەختەوە ، وەك عیساو محمد بێ ( وفریقا تقتلون ) وە دەستەیەکیشتان ئەکوشت وەك أَشْعِیاو زَکَرِیّاو یَحْیَی بێ ، کەواتە جێی سەرسوورمان نییە ئەگەر برروا بە محمد نەهێنن ، چونکە ئەم لاساریی‌و سەرپێچییە ، رەووشتو خووتانە لە زۆرکۆنەوە •

**خوای** گەورە ئەم هەموو سەرگوزەشتی جوولەکانەی گێرایەوە بۆ مسڵمانان ، تا خۆیان بپارێزن لەو هەڵانەی کە ئەوان کردویانە ، تا خاوەنداریی زەوییان لێ نەسەندرێتەوە ، وەك لەوان سەندرایەوە ، وە ئەو سپاردە « أمانة »یەی کە درابوویانی لە دەستیان وەرنەگیرێتەوە ، بەڵام داخەکەم ئەمانیش کەوتنە ناو ئەو هەڵانەی کە ئەوان تێی‌کەوتن ، وە شەرعی خواو دەستوورو باوی خوایان پشت‌گوێ خست ، وە بە هەوەس‌و ئارەزوو دەستیان‌کرد بە بریار « حکم » دان بەسەر چاکانا ، وە بە درۆ خستنەوەی گەلێك لە پێشەوایانو کوشتنی هێندێك لە زانایانو خاوەن قەڵەمانی ئایینی ، تا خوا ئەو

وَقَالُوا قُلُوبُنَا غُلْفٌ بَلْ لَعَنَهُمُ اللهُ بِكُفْرِهِمْ ،

( جوولەکەکان ) ووتیان (بە پێغەمبەر) : دڵمان لەپۆرگایە ( قسەی تۆی ناگاتێ ، نەء ٠٠ وا نی‌یە ) بەڵکو خوا نەفرینی لێکردن بەهۆی بێ‌برروایی‌یانەوە ،

بەڵایانەی کە دای بەسەر جوولەکەدا دای بەســەر ئەمانیشا ، لە جوێ‌یەتیی‌و زەبوونیی‌و خواردەستیی‌و بێ‌نرخیی ، بەڵکو جوولەکەی بەسەرا زاڵ کردن ، وە بە دەستی جوولەکە بێ‌نرخ‌و ریسوای کردن لــە جیهانا ، وە بەم‌رەنگە هــەر ئەمێننەوە ، سا مەگــەر جارێکی‌تر بچنەوە بە دەنگ خواو پێغەمبــەرەوە وەك جاران ، وە یا بدەنەوە بە لای قورئان‌و شەرعەوە ، وە ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ خواو پێغەمبەرا بەستبویان بەجێ‌بێنن ، ئەو حەلە ، خواش پەیمانی خۆی لەگەڵ ئەمانا بەجێ‌دینێ ، بەڵام داخەکەم تائێسنا هێشتا مسڵمانان بێدار نەبوونەتەوە بەم هەموو چەخماخەی بەسەرهاتانەو هــەورە بروسکەی رووداوانەی کــە وەك تەرزەی بەهار بەسەریانا دائەبارێ ، ئنجا بزانین کەی بێدار ئەبنەوە ، وە بیرێك لە ئێستاو جارانی خۆیان ئەکەنەوە ٠

★ ★ ★

ئەمە حاڵی جوولەکەکان بوو لەگەڵ پێغەمبەرەکانی خۆیان ، لە مووساوە تا عیسا ، ئنجا باسی حاڵیان ئەکات لەگەڵ پێغەمبەری ئیسلاما ، کە تەماشا ئەکەین ئەم جوولەکانە هەروەك ئەو جوولەکانەی پێشوو وان کە لاسارو سەهندە بوون ، هەرچەند پێغەمبەر بانگیی ئەکردن بۆ بڕرواهێنان ئەیانووت : قسەکانت ناچێتە دڵمانەوە ، وەکو ئەفەرموێ ( وقالوا قلوبنا غلف ) جوولەکەکان بە پێغەمبەریان ووت : دڵمان لــەناو پۆرگایە ، واتــە قسەکانت ناچێتە دڵمانەوە ، ئنجا خوا بەدرۆیان ئەخاتەوە ، ئەفەرموێ ( بل لعنهم الله بکفرهم ) بەڵکو خوا نەفرینی لێکردن بەهۆی بێ‌برروایی‌یانەوە بە پێغەمبەرەکانی خۆیان ، وە بەو نامانەی کە بۆیان هاتووە ، واتە درۆ ئەکەن ، دڵیان لــەناو پەردەدا نی‌یە ، بەڵکو وا دروست کراوە کە قسەی راست‌و دروست وەرگرێ ، بەڵام بەهۆی بێ‌برروایی‌و

فَقَلِيلاً مَّا يُؤْمِنُونَ (٨٨) وَلَمَّا جَاءَهُمْ كِتَابٌ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَهُمْ ، وَكَانُوا مِنْ قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا ، فَلَمَّا جَاءَهُمْ مَا عَرَفُوا

بۆیە کەمجار برروا ئەهێنن (٨٨) کاتێك کە نامەیەکیان بۆ هات ( کە قورئانە ) لەلای خواوە کە برروا ئەکات بەوتەوراتەی کە لەلایانە ، وە لەوەپێشیش داوای زاڵبوونیــان ئەکرد بەسەر ئــەوانەی کــەبێبرروا بوون ، کــەچی کــە ئەو ( پێغەمبەر )ەی ئەیانناسیی بۆیان هات ،

حەسەدو چەوتیی خۆیانەوە چرای دڵو دەروونی خۆیانیـان کوژاندۆتەوە ، وە خۆیان بێبەش کردووە لە رەحمەتی پێغەمبەری ئیسلام ( فقلیلا ما یؤمنون ) بۆیە کەمیان هەیە کە برروا بێنن •

بەراستی وابوو وەکو قورئان ئەفەرموێ ، لە جوولەکە ، زۆر کەم مسڵمان بوون ، لەگەڵ ئەمیشە کە لەپێش هاتنی پێغەمبەرا بە دڵو بەکیان چاوەروانیی هاتنی پێغەمبــەری ئیسلامیان ئەکرد ، ئەو پێغەمبــەرەی کــە تەوراتو ئینجیل بەناونیشانە مزگێنی پێدابوو ، تا بەهۆی ئەوەوە زاڵ ببن بەسەر بتپەرستەکانا ، وەکو ئەفەرموێ ( ولما جاءهم کتاب من عنــد الله مصدق لما معهم ) کاتێك کــە قورئانیان بۆ هات لەلای خواوە بەبررواکەر بەو تەوراتەی کەبەدەستیانەوەیە ، وە بە پشتیوانیی ئــەو ، لەبابەت تاکو تەنیــایی خواو پێغەمبــەریەتیی و رۆژی دوایی‌یەوە ( وکانوا من قبل یستفتحون علی الذین کفروا ) لەگــەڵ ئەمیشە لەوەپێش داوای زاڵبوونیــان ئەکرد لەخوا بەسەر بتپەرســتەکانا بــە ناردنی پێغەمبــەری ئیسلام ، واتە هەرچــەند جوولەکــەکان وەررس ببوونایە لــە بتپەرستەکان ، ئەیانوت : خوایە ! کەی سەرمان ئەخەیت بەسەر ئەوانەی کە بێبرروان بە ناردنی دواترین پێغەمبــەر ، تا لەگەڵ ئەوا ئــەم بتپەرستانە پاك بکەینەوە ( فلما جاءهم ما عرفوا ) کەچی کاتێك کە ئەو پێغەمبەرەیان بۆ هات کە لەوەپێش ئەیانناسیی بە ناونیشانەکانی تەورات ، ئەبوایە برروایان پێبێنایە ، وە کۆمەکیان بکردایە ، بۆ دەرهێنانی ریشەی بتپەرستیی ، کەچی لەجیاتیی

كَفَرُوا بِهِ ، فَلَعْنَةُ اللهِ عَلى الكافِرِينَ (٨٩) بِئْسَمَا اشْتَرَوْا بِهِ أَنْفُسَهُمْ : أَنْ يَكْفُرُوا بِمَا أَنزَلَ اللهُ ، بَغْياً أَنْ يُنَزِّلَ اللهُ مِنْ فَضْلِهِ عَلى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبادِهِ ،

---

بێبڕروا بوون پێی ، ئنجا نەفرینی خوا لە بێبڕروایان (٨٩) شتێکی زۆر خراپ بوو ئەوەی کە خۆیانیان پێ فرۆشت کە ( ئەوەش ) بێبڕروایی‌یان بوو بەو ( قورئان )ەی کە خوا ناردوویەتە خوارەوە ، ( ئەمەشیان ) لە رووی سەرکێشی ( حەسەد )ەوە بوو بەوەی کە خوا لە بەخششی خۆی بڕژێ بەسەر کەسێکا کە خۆی بی‌یەوێ لە بەندەگانی ( کە محمدە ) ،

---

ئەوەی کە برروای پێ‌بێنن ( کفروا به ) بێبڕروا بوون پێ ، واتە بڕروایان پێ نەهێنا نەوەك گەورەیی‌و سەرۆکایەتی‌یان لەدەست بچێ ( فلعنة الله علی الکافرین ) ئنجا نەفرینی خوا لە بێبڕروایان بێ .

ئنجا باسی هۆی ئەم بێبڕروایی‌یە ئەکات ئەفەرموێ ( بئسما اشتروا به أنفسهم ) شتیکی زۆر بەدی خراپ بوو ئەوەی کە خۆیانیان پێ‌فرۆشت ، کە ئەوەش : ( ان یکفروا بما انزل الله ) بێبڕروایی‌یان بوو بەو قورئانەی کە خوا ناردوویەتە خوارەوە ، واتە کارێکی زۆر خراپیان کرد ، کە بەهرەی گیانیی خۆیانیان فرۆشت بە بێبڕروایی ، ئەو بێبڕروایی‌یەی کە تووشیان بوو لەرووی حەسەد بردنەوە بە پێغەمبەر ، وەکو ئەفەرموێ : بێبڕروا بوون ( بغیا ان ینزل الله من فضله علی من یشاء من عباده ) لەبەر سەرکێشی کردن‌و حەسەد بردن بەوی کە خوا لەرووی بەخششی خۆیەوە نامەی ئاسمانیی بنێرێ بۆ کەسێك کە خۆی هەڵی‌بژێرێ لە بەندەگانی ، کە محمدە ، واتە جوولەکان لەپێش هاتنی پێغەمبەرا چاوەڕروانی پێغەمبەری ئیسلام بوون ، کە بەیدا بێ لە نەوەی إسحاق ، بەڵام کاتێك کە هات لە بەرەی اسماعیل ، لەداخانا پچرزان ، وە پشتێنێ دوژمنایەتی‌یان بەست لەگەڵ پێغەمبەرو قورئانا ، وە چەند جار ویستیان پێغەمبەر بکوژن ، بەڵام خوا پاراستی ، کەوابوو جوولەکە پێچەوانەی فەرمودەی

فَبَاءُوا بِغَضَبٍ عَلَى غَضَبٍ ، وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُهِينٌ (٩٠)
وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا بِمَا أَنْزَلَ اللهُ ، قَالُوا : نُؤْمِنُ بِمَا أُنْزِلَ
عَلَيْنَا ، وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَاءَهُ وَهُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقًا لِمَا
مَعَهُمْ ، قُلْ :

---

ئنجا گەررانەوە بە خەشمی خواوە یەك‌لەسەریەك ، وە هەیە بۆ بێبڕروایان سزای رسواکەر (٩٠) کاتێك پێیان بووترایە : بڕروابێنن بەو ( قورئان )ەی کە خوا ناردوویەتە خوارەوە ، ئەیانووت : ئێمە بڕروا بەوە ئەهێنین کە بۆ خۆمان نێرراوەتە خوارەوە ( کە تەوراتە ) وە بێبڕروا ئەبوون بە نامەی‌تر ( کە قورئانە) کە ئەو راستەو پشتیوانی تەوراتەکەی ئەوانە ، بڵێ :

---

خواو سێ پێغەمبەریان کرد ، وەکو ئەفەرموێ ( فباءوا بغضب علی غضب ) گەررانەوە بە خەشمی خواوە ، یەك لەسەریەك ، یەکەمیان بە بێفەرمانیی مووساو تەوراتو دووهەمیان بە بێفەرمانیی عیساو ئینجیلو سێهەمیان بە بێفەرمانیی محمدو قورئان ( وللکافرین عذاب مهین ) وە بۆ بێبڕروایان هەیە سزای‌وا کە ریسوایان بکات بەرانبەر بەو سەرکێشیو دەعیەو دەمارەی کە بەکاریانهێنا .

هێندێك لە جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر بیانوویان بۆ مسڵمان نەبوون ، ئەوەبوو کە ئەیانووت : پەردە بەسەر دڵمانا هاتووە ، بۆیە لە بانگ کردنەکەت ناگەین ، ئەوەبوو خوا وەرامی دانەوە ، وە هۆی بێبڕروایی‌یەکەی باس کردن، لێرەدا بیانوویەکی‌تریان ئەگێررێتەوە ئەفەرموێ ( واذا قیل لهم آمنوا بما أنزل الله ) کاتێك کە پێیان بووترایە : بڕروا بێنن بەو قورئانەی کە خوا ناردوویەتە خوارەوە ( قالوا : نؤمن بما أُنزل علینا ) ئەیانووت : ئێمە بڕروا بەو تەوراتە ئەهێنین کە بۆخۆمان هاتووە ( ویکفرون بما وراءه ) وە بێبڕروا ئەبوون بە نامەی‌تر کە ئینجیلو قورئانە ( وهو الحق مصدقا لما معهم ) کە ئەویشە راستو بڕرواداره بەونامەیەی کە بەدەستیانەوەیە ، وە پشتیوانی تەوراتەکەی ئەوانە ، ئنجا خوا بە پێغەمبەر ئەفەرموێ ( قل ) پێیان بڵێ : ئەگەر راست ئەکەن کە

فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنْبِيَاءَ اللهِ مِنْ قَبْلُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ؟ (٩١)
وَلَقَدْ جَاءَكُمْ مُوسَى بِالْبَيِّنَاتِ ، ثُمَّ اتَّخَذْتُمُ الْعِجْلَ مِنْ
بَعْدِهِ وَأَنْتُمْ ظَالِمُونَ (٩٢)

---

ئەگەر برروادار بوون بۆچی لەمەپێش پێغەمبەرانی خواتان ئەکوشت (٩١)
بەراستی مووساتان بۆ هات بە چەند نیشانەیەکی رۆشنەوە ، لەدوایی‌دا گوێرەکە
پەرستیتان بۆ خۆتان هەڵبژارد ، وە ئێوە ستەمکارن (٩٢)

---

برروواتان بە تەورات هەیە ( فلم تقتلون أنبياء الله من قبل ان كنتم مؤمنين ) ئەی بۆچی لەمەپێش ئەم هەموو پێغەمبەرانی خوایەتان کوشت ؟ خۆ تەورات فەرمان بە پێغەمبەر کوشتن نادات ، بەڵکو جڵەوگیریی لێئەکات ، کەوابوو ئێوە درۆ ئەکەن ، وە گوفتارو کردارتان لەیەك جیایە •

نەخێر ئێوە هەر بێبرروا بوون بە ئاینی مووسا کە یەکەمین پێغەمبەرو گەورەترین سەرۆکتان بووە ، وەکو ئەفەرموێ ( ولقد جاءكم موسى بالبينات ) بێگومان مووساتان بۆ هات بە چەند نیشانەیەکی رۆشنەوە ، پێشەکیی برروواتان پێهێنا ، بەڵام ( ثم اتخذتم العجل من بعده ) دوای ئەوەی کە چوو بۆ کێوی توور تەوراتتان بۆ بێنێ ، گوێرەکەکەتان کرد بە خوای خۆتانو پەرستتان ( وأنتم ظالمون ) وە ئێوە ستەمکارن •

ئایا ئەم گوێرەکە پەرستی‌یەتان بەسەرزێنیی مووسا بە فەرمانی ئەو بوو ؟ وە ئایا ئەمە ، رێئەکەوێ لەگەڵ ئەم قسەیەی کە ئەڵێن : ئێمە برروامان بەو تەوراتە هەیە کە بۆخۆمان هاتووە ، ئەگەر برروواتان پێبوایە گوێرەکەتان نەئەپەرست •

لەگەڵ ئەمیشە ئەمە یەکەمین هەڵەتان نی‌یە کە نیشانە بێ لەسەر بێبرروایی‌تان ، بەڵکو لەژێر کێوی تووریشا خوا پەیمانی لەگەڵ بەستن کەچی

وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ : خُذُوا مَا آتَيْنَاكُمْ بِقُوَّةٍ وَاسْمَعُوا • قَالُوا : سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا ، وَأُشْرِبُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ •

---

کاتێك کە پەیمانمان لێ وەرگرتن وە کێوی توورمان بەرزکردەوە بەسەرتانا ( وە ووتمان ) : ئەوی پێمانداوون ( لە نامەی ئاسمانیی ) باش کاری پێ بکەنو لەگوێی بگرن • ( بە زبان ) ووتیان بیستمانو ( بەکردەوە ) بێفەرمانیمان کرد ، وە بەهۆی بێبڕواییانەوە دڵیان ئاودرابوو بە خۆشەویستیی گوێرەکەکە •

---

ئامانجەکەی بێفەرمانییو سەرپێچیبوو ـ وەکو ئەفەرموێ ( واذ أخذنا میثاقکم ) بیربکەنەوە کاتێك کە پەیمانمان لێوەرگرتن ( ورفعنا فوقکم الطور ) وە کێوی توورمان بەرزکردەوە لە ژوور سەرتانەوە ، وە پێمانووتن : ( خذوا ما آتیناکم بقوة ) ئەوی پێمانداوون لە نامەی ئاسمانیی چاككاری پێ بکەن ( واسمعوا ) وە فەرموودەکانی بەدڵ ببیەنو لەگوێی بگرن ( قالوا : سمعنا وعصینا ) ووتیان : بیستمانو نافەرمانییمان دەربڕیی دەربارەی ، واتە بە زبان ووتیان : بیستمانو بە کردەوەش ووتیان : نافەرمانییمان کرد ( واشربوا في قلوبهم العجل بکفرهم ) وە بەهۆی بێبڕواییانەوە دڵیان ئاودرا بوو بە خۆشەویستی گوێرەکەکە ، واتە خۆشەویستیی ئەو گوێرەکەیە لەگەڵ خوێنو ڕەگو دەمارییانا تێکەڵ بووبوو •

لەمەپێش باسی ئەم گوێرەکەیەو ئەم پەیمانەی کرد لە ئایەتی (٥١و٦٣) دا • وا لێرەش فەرموونییەوە بەشێوەیەکیتر ، وە لە زەمینێك « سیاق »یترا ، زەمینی پێشوو لە باسی نعمتانی خوادا بوو بەسەر جوولەکەوەو ناسوپاسی ئەوان بەرانبەر بەو بەهرانە بەڵام زەمینی ئێرە لەباسی بەدرۆخستنەوەی جوولەکەدایە کە ووتیان : « نُؤْمِنُ بِمَا أُنْزِلَ عَلَيْنَا » واتە یەکێك بڕوای بە تەورات بێ چۆن گوێرەکە ئەپەرستێو پەیمانی خوا ئەشکێنێ ؟ جا هەر لەبەرئەوەیە کەوا دوایی ئایەتەکەی هێنا بەم فەرموودەیە کە بە پێغەمبەر

قُلْ : بِئْسَمَا يَأْمُرُكُمْ بِهِ إِيمَانُكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ! (٩٣)
قُلْ إِنْ كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الْآخِرَةُ عِنْدَ اللهِ خَالِصَةً مِنْ
دُونِ النَّاسِ

بڵێ : بڕرواکەتان فەرمانێکی بەدتان پێئەدات ، ئەگەر ئەمەتان داناوە بە بڕروا
(٩٣) بڵێ ئەگەر ماڵی دوایی ( کە بەهەشتە ) بەتایبەتی بۆ ئێوەیە لای خوا
ــ ( وەکو خۆتان ئەڵێن ) ــ بێئەوەی یەکێك ببێ بە هاوبەشتان ،

ئەفەرموێ ( قل ) پێیان بڵێ (بئسما يأمركم به ايمانكم ) بڕرواکەتان فەرمانێکی زۆر بەدتان پێئەدات ، واتە ئەگەر بەراستی بڕروادار بوونایە بە تەورات گوێرەکەتان نەئەپەرستو پێغەمبەرانتان نەئەکوشتو پەیمانی خواتان نەئەشکاند ... کەواتە ئەم بڕروایەتان شتێکی زۆر بەدو خراپە ، کەوا فەرمانی ئەمانەتان پێئەدات ( ان كنتم مؤمنين ) ئەگەر ئێوە خۆتان بە خاوەن بڕروا داناوە .

* * *

لەپاشا ئەم جوولەکانە قسەی زلزلیان ئەکرد : گۆیا هەر ئەوان گەلی هەڵبژاردەی خوان ، وەك لە سوورەی « مائده » دا ئەفەرموێ لە زمان جوولەکەوە « نَحْنُ أَبْنَاءُ اللهِ وَأَحِبَّاؤُهُ »[(١)] وە هەر ئەوان ئەچنە بەهەشت ، وەك لەمسوورەتەدا ئەفەرموێ لە زبان ئەوانەوە : « لَنْ يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَنْ كَانَ هُودًا »[(٢)] وە مەبەسیان لەمقسانە تێکدانی دڵی مسڵمانەکان بوو ، تا دوودڵ بن لە فەرموودەکانی پێغەمبەرو قورئانا ، ئنجا خوا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر کە پێیان بڵێ :ــ ئەگەر بەهەشت هەر بۆ ئێوەیە ، ئەی بۆچی داوای مردن ناکەن ، وە بۆ پاسی ناوونیشانتان سەری خۆتان دانانێن ، وەکو ئەفەرموێ ( قل ) پێیانبڵێ ئەی محمد ( إن كانت لكم الدار الآخرة عند الله ) ئەگەر ماڵی دوایی ــ کە بەهەشتە ــ بەتایبەتی هەر بۆ ئێوە دانراوە لەلای خواوە ــ وەکو خۆتان ئەڵێن ــ ( خالصة من دون الناس ) بێئەوەی کە یەکێکیتر ببێ بە

(١) واتە ئێمە کوررانی خواینو دۆستانی ئەوین .
(٢) واتە کەس ناچێتە بەهەشت جوولەکە نەبێ .

فَتَمَنَّوُا الْمَوتَ إِنْ كُنْتُمْ صادِقِينَ (٩٤) وَلَنْ يَتَمَنَّوْهُ أَبَداً بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ، وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ (٩٥) وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَى حَيَاةٍ ، وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا

---

کەواتە داوای مردن بکەن ئەگەر راستگۆن (٩٤) وە هەرگیز داواشی ناکەن بەهۆی ئەو (گوناهانـ)ـەی کـە بەدەستی خۆیان پێشیان خستووە ، وە خوا ئاگادارە بە ستەمکاران (٩٥) بەراستی تۆ جوولەکە ئەبینیت کە لە هەمووکەس زیاتر حەزی لە ژیانە ، وە لەوانەش کە هاوبەش بۆخوا پەیدا ئەکەن ،

---

هاوبەشتان ( فتمنوا الموت ) کەواتە داوای مردنو چوونە بەهەشت بکەن ( ان کنتم صادقین ) ئەگەر راست ئەکەن کە ئەڵێن : بەهەشت هەر بۆ ئێمەیە ، ئنجا ئەم داواکردنی مردنە بە گوفتار بێ یا بە کردار بێ وەك جەنگکردن لەرێی خواداو نەترسان لەکوشتن ؛ چونکە یەکێك بزانێ کـە مرد ئەچێتە بەهەشت ئەبێ وەك هاورێکانی پێغەمبەر حەز لە مردن بکات ، تا زووبەو بەهرەیە بگات ، ئنجا کە داوای مردنتان نەکرد ، وە زۆر بەپەرۆش بوون بۆ ژیانی جیهان ، ئەوە بزانن کە درۆ ئەکـەن ، وەکو ئەفەرموێ ( ولن یتمنوه أبدا ) وە هـەرگیز جوولەکە ئارەزووی مردن ناکات ( بما قدمت أیدیهم ) بەهۆی ئەوگوناهانەی کە بەدەستی خۆیان پێشیان خستووە ( واللّه علیم بالظالمین ) وە خوا ئاگادارە بە ستەمکاران •

ئنجا باسی ئەوە ئەکاتً کە جوولەکە لە هەمووکەسێك زیاتر حەزی لـە ژیانی جیهـانە ، ئەفەرموێ ( ولتجـدنهم أحرص النـاس علی حیـــاة ) تۆ جوولەکە ئەبینیت کە لە هەمووکەس زیاتر حەزی لـە ژیانو زیندەگانی‌یە ، واتە هەمیشە ئەیانبینیت کوشتەی ژیانن ، وە لـە هەمووکەس زیاتر هەوڵی بۆئەدەن ، تەنانەت لـە بێبڕرواکانیش زیاتر ، وەکو ئەفەرموێ ( ومن الذین أشرکوا ) واتە لەوانەش کە هاوبەش بۆ خوا پەیدا ئەکەن زۆرتر ئارەزووی

يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ ، وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَنْ يُعَمَّرَ ، وَاللهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ (٩٦) قُلْ : مَنْ كَانَ عَدُوّاً

---

( لەبەرئەوە ) هەریەکێکیان حەز ئەکات کە هەزار ساڵ بژیایە ، وە ئەو تەمەنە رزگاری ناکات لـە سزا ، وە خوا بینـایە بەوەی کـە ئەیکەن (٩٦) بڵێ : هەرکەسێك دوژمنی

---

ژیانی جیهانو زیندەگانی‌یان هەیە ، ئنجا مثالێك ئەهێنێتەوە بۆ ئەم حەزکردنەیان لە ژیان ، ئەفەرموێ ( يود أحدهم لو يعمر ألف سنة ) هەر یەکێکیان بە دڵ حەز ئەکات کە خۆزگە هەزار ساڵ بژیایە ( وما هو بمزحزحه من العذاب أن يعمر ) وە ئەگەر ئەم ئارەزووەشی بێتەدیی ، ئەم تەمەنە درێژە رزگاری ناکات لەسزای خوا ، چونکە هەرچەند تەمەنی درێژ بێ ئەبێ هەر بمرێ ، وە بـە سزای هــەر خۆی بگات ( والله بصير بما يعملون ) وە خوا بینایە بـە هەرچی کە ئەیکەن •

* * *

تا ئێستا چەند بیانوویەکی جوولەکەی هێنایەوە ، وە بیانووەکانی بڕرین ، وەك ئەمەی کە ئەیانووت : ئێمە هەر بڕروامان بەو نامەیە هەیە کە بۆ خۆمان هاتووە ، وە بەهەشت هەر بۆ ئێمەیە ، چونکە ئێمە کوڕری خواو خۆشەویستی ئەوین ، ئەوەبوو یەك‌بەیەك ئەم‌قسانەی بردە دواوە ، ئنجا باسی بیانوویەکی‌تریان ئەکات کە لە بیانۆکانی‌تر هیچ‌وپووچ‌ترە ، ئەویش ئەمەیە کـە ئەڵێن : ئــەو جبرەئیلەی کە سرووش بۆ محمد ئەهێنێ دوژمنی ئێمەیە ، چونکە هەرچی تهێنی ئێمە هەیە بەوی ئەڵێ ، وە ئەڵێن : جبرەئیل فریشتەی سزاو بوومەلەرزەو رۆچوونە ، بەڵام میکائیل فریشتەی خێرو خۆشیی‌و هەرزانی‌یە ، لەبەرئەمانە ئێمە بڕروا بەو قورئانە ناهێنین کە ئەو بیهێنێ ، بەڵێ ئەگەر میکائیل بیهێنایە بڕروامان پێ‌ئەهێنا ، ئنجا خوا ئەفەرموێ ( قل ) بڵێ ئەی محمد ( من كان عدواً

لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللهِ مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ، وَهُدىً وَبُشْرى لِلْمُؤْمِنِينَ (٩٧) مَنْ كَانَ عَدُوّاً لِلهِ وَمَلائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ

جبرەئیل بێ ( ئـەوە دوژمنی خوایە ) چونکە ئەو بـە فەرمانی خوا قورئانی هێناوەتە خوارەوە بۆسەر دڵی تۆ بـە پشتیوانیی نامەکانی پێش خۆی وە بـە ڕێنموونیی کەرو موژدەدەر بۆ بڕوادارانن (٩٧) هەرکەسێك دوژمنی خواو فریشتەی‌و پێغەمبەرانی‌و جبرەئیل‌و

لجبريل ) هەرکەسێك دوژمنی جبرەئیل بێ ئەوە دوژمنی سرووشی خوایە ، چونکە ( فانەنزله علی قلبـك باذن الله ) بێ‌گومان جبرەئیل بـە فەرمانی خوا قورئانی بە سرووش هێناوە بۆ سەر دڵی تۆ ( مصدقا لمـا بين يديه ) بە ڕێکی نامەکانی پێش خۆی ، وە بۆ پشتیوانیی ئەوان ( وهدی وبشری للمؤمنين ) وە بە ڕێنموونیی کـەرو موژدەدەر بۆ بڕوا داران ، هـەروەك لەپێش قورئانا تەوراتیشی بە سرووش بردووە بۆ سـەر دڵی مووسا ، کەوابوو ئەوکەسـەی دوژمنی جبرەئیل بێ ئەبێ دوژمنی ئەو سرووشەش بێ کە بۆ مووسای بردووە.

قورئان بەتێکرایی پشتیوانی هـەموو نامـە ئاسمانی‌یەکانە ، کـەوابوو ئاینەکان هەموو لەبنیاتا یەکن ، وە پێغەمبـەران‌و نامەکان هەموو چوونیەکن ، نابێ جیا بکرێنـەوە ، بەڵکو ئەبێ هەموو بـە یەك‌چاو تەماشا بکرێن ، بەڵام جوولەکە هەمیشە جیاوازیان خستۆتە ناو پێغەمبەران‌و ئاینەکانیانەوە ، بەڵکو جیاوازیشیان خستە ناو فریشتەکانیشـەوە کـە جبرەئیل‌و میکائیلە ، ئنجـا بۆئەوەی‌مەردوم ئاگادار بکاتەوە بەوەی کە هەرکەسێك دوژمنایەتیی‌یەکێك لەمانە بکات وەك دوژمنایەتیی خوا بکات وایە ، وە هەرکەسێکیش دوژمنایەتیی خوای کرد ئەوە بێ‌بڕوایە ، ئەفەرموێ ( من كان عدواً لله وملائكته ورسله وجبريل

وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ (٩٨) وَلَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلَّا الْفَاسِقُونَ (٩٩)

---

میکائیل بێ ( ئەوە بێبڕروایە ) وە خواش دوژمنی بێبڕروایانە (٩٨) بێگومان چەند ئایەتێکی راستو دروستمان بۆ ناردوویت ـ ( کە قورئانە ) ـ وە کەس بێبڕروا نابێ پێیان مەگەر بەدکاران (٩٩)

---

ومیکال ) هەرکەسێك دوژمنی خواو فریشتەی و پێغەمبەرانیو جبرەئیلو میکائیل بێ ، ئەوە بێبڕروایە ، وە هەرکەسیکیش بێبڕروا بێ ( فإن الله عدو للکافرین ) بێگومان خوا دوژمنی بێبڕروایانە •

ئەم بیانووەیان نیشان ئەدات کە تا چ ئەندازەیەك جوولەکە تەنگەتاو بوون بە رەوانەکردنی پێغەمبەری ئیسلام ، کەوا هەر دەمەی بیانوویەکیان ئەهێنایەوە بۆ بڕروا نەهێنان ، وە بەم بیانووانە دڵی مسڵمانەکانیان کرمێ ئەکرد ، ئەگەر هەموو جارێك قورئان زووبەزوو چارەی نەکردایەو ئایەتی تیا نەناردایەتە خوارەوە •

* * *

ئنجا رووئەکاتە پێغەمبەرو دڵنیای ئەکات لەسەر ئەو قورئانەی کە بۆی نێرراوە ، وە لەسەر ئەو ئایەتانەی کە بۆی هاتووە ، ئەفەرموێ ( ولقد أنزلنا الیك آیات بینات ) بێگومان چەند ئایەتێکی راستو دروستمان بۆ ناردیت کە قورئانە ( وما یکفر بها إلا الفاسقون ) کەس بێبڕروا نابێ پێیان مەگەر بەدکاران ، واتە ئایەتانی قورئان وەك رۆژ رووناكو نمایانە ، هەموو شتێك رووناك ئەکاتەوە ، بەڵام خۆی پێویست بەهیچ نییە کە رووناکی بکاتەوە ، کەواتە مایەی بێبڕروایی جوولەکە بەدکاریی خۆیانو چەوتیی سروشتیانە ، وە ئەگەر بڕروای پێنەهێنن ئەوە لەبەر کەموکووڕیی ئایەتەکانی قورئان نییە ، بەڵکو لەبەر بەدسروشتیی خۆیانە •

أَوَكُلَّمَا عَاهَدُوا عَهْدًا نَبَذَهُ فَرِيقٌ مِنْهُمْ ؟ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ (١٠٠)

---

ئایا ( بێبڕروا ئەبن بە ئایەتانی ئێمە ) وە هەرچەند پەیمانێك ببەستن ( لەگەڵ پێغەمبەرا ) دەستەیەك لەوان فڕێی ئەدەن : بەڵکو زۆرتریان هەر بڕروا ناهێنن (١٠٠)

---

سەیر لەوەدایە ئەم جوولەکانە لەسەر هیچ بارێك نامێننەوە ، وە ئاگاداریی هیچ پەیمانێك ناکەن ، وەکو ئەفەرموێ ( أو کلما عاهدوا عهداً ) ئایا بێبڕروا ئەبن بە ئایەتانی ئێمە ، وە هەرچەند پەیمانێك ببەستن لەگەڵ پێغەمبەرا ( نبذه فریق منهم ) دەستەیەك لەوان پەیمانەکەی فڕێئەدەن‌و پشتگوێی ئەخەن ؟ نابینیت ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ خوادا بەستیان لەژێر کێوی توورا هەڵیان‌وەشاندەوە ، وە ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ مووساو پێغەمبەرەکانی دوای ئەوا بەستیان ژێرپێیان خست ، تا دوایی ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ پێغەمبەری ئیسلاما بەستیان ــ کاتێك کە هات بۆ مدینە ــ شکاندیان ، وە بە هەموو هێزو توانایی خۆیانەوە هەمیشە خەریکی هەڵگیرساندنی ئاگری ئاژاوەو ناکۆکی بوون چ لەناو خودی مسڵمانەکانا ، وە چ لەناو مسڵمانەکان‌و بێبڕرواکانا ( بل أکثرهم لا یؤمنون ) بەڵکو بەشی زۆریان بڕروا ناهێنن بە پێغەمبەری ئیسلام .

بەراستیی ئەمە وابوو ، بەشی زۆری جوولەکە نە لەکاتێ پێغەمبەرا مسڵمان بوون ، وە نە لەدوای پێغەمبەر تا ئەمڕۆ ، کە ئەمە یەکێکیترە لە خەبەردانی قورئان لە غەیبەوە کە شتیوا لەخواوە نەبێ نابێ .

کاتێك کە پێغەمبەر لەلای خواوە نێررا ، وە سیفەتەکانی ڕێکی ئەو ناونیشانانە بوو کە تەورات دابووی کە لە نەوەی ئیسماعیل پەیدا ئەبێ ، هێندێك لە جوولەکەکان گوێیان نەدایە ئەو ناونیشانانە ، وە بڕروایان پێنەکرد کە

وَلَمَّا جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِنْ عِنْدِ اللهِ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَهُمْ ، نَبَذَ فَرِيقٌ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ كِتَابَ اللهِ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ ، كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ (١٠١) وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُو الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ ،

---

کاتێك کە پێغەمبەریان بۆ هات لەلای خواوە بەپشتیوانیی تەوراتەکەیان ، هێندێك لەوانەی کە خاوەن نامە بوون نامەکەی خۆیان فرێدا بەپشتا ، وەك نەزانن ( کە ئەوە نامەی خوایە ) (١٠١) ( جوولەکەکان ) دوای ئەو شتانە کەوتن کە زانا فێڵبازەکان ئەیانگێڕرایەوە دەربارەی پاشایی سولەیمان ،

---

ئەمەش یەکێکە لە پەیمان شکاندنی جوولەکە ، وەکو ئەفەرموێ ( ولما جاءهم رسول من عند الله مصدقا لما معهم ) کاتێك کە پێغەمبەری ئیسلامیان بۆهات لەلای خواوە بەرێکی ئەو ناونیشانانەی کە تەوراتەکەی خۆیان بۆی هەڵدابوون ، کەچی لەجیاتی ئەوەی کە برروای پێبێنن ، وە بەگوێی بکەن ( نبذ فريق من الذين أوتوا الكتاب كتاب الله وراء ظهورهم ) هێندێك لەوانەی کە تەوراتیان درابوویێ لە زاناو خوێندەوارەکانیان قورئانەکەی خوایان فرێدا بەپشتا ، واتە پشتگوێیان خستو بەگوێیان نەکرد ( كأنهم لا يعلمون ) گۆیا نازانن کە ئەوە نامەی خوا ، وە محمد پێغەمبەری خوایە •

* * *

ئنجا بابزانین ئەم جوولەکانە ئەم تەوراتو قورئانەیان بۆچی پشتگوێ خست ؟ ئایا لەوانیان باشتر دۆزیوەتەوە ؟ نەء لەبەر ئەوە نییە ، بەڵکو ئەوانیان فرێدا ، تا دوای قسەی پرروپووچیوا بکەوون ، کە هەرچی بناتبێ نییەتی ، وەکو ئەفەرموێ ( واتبعوا ما تتلوا الشياطين على ملك سليمان ) هاتن دوای ئەوشتانە کەوتن کە زانا فێڵبازەکانیان ئەیانگێڕرایەوە دەربارەی پادشایی سولەیمان ، کە گۆیا جادووگەر بووە ، وە پاشاییەکەی بەهۆی تەلیسمو جادووەوە وێستاوە ، ئنجا قورئان جادووگەریی سولەیمان بەدرۆ ئەخاتەوە ،

وَمَا كَفَرَ سُلَيْمانُ ، وَلَكِنَّ الشَّياطِينَ كَفَرُوا ، يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ ،

---

سولەیمان بێبڕوا نەبوو ، بەڵام زۆرزانەکان بێبڕوا بوون ، مەردومیان فێری جادوو ئەکرد ،

---

تەفەرموێ ( وما كفر سليمان ) سولەیمان بێبڕوا نەبوو ، وە جادووی نەکردووە ، بەڵکو پاشایەکی دووهەمی بەهێزی چاکی ئیسرائیل بووە ، ( ولكن الشياطين كفروا ) بەڵام زانا ناڵەبارەکانی جوولەکە ــ کە جادووگەریی پاڵئەدەنە پاڵ سولەیمان ــ ئەوان بێبڕوا بوون ( يعلمون الناس السحر ) مەردومیان فێری جادوو ئەکرد .

جوولەکە ویستیان بە تەورات پێغەمبەر بەدرۆ بخەنەوە ، کە زانییان تەوراتو قورئان یەکن لە زۆرشتا کە یەکێکیان پێغەمبەریەتی پێغەمبەرە ، هاتن لەلاوە بەدرۆی بخەنەوە ، بەمڕەنگە ئەو سولەیمانەی کە قورئان ناوی ئەبات بە پێغەمبەر ، ئەمان بیکەن بە جادووگەرێکی بێدین ، وە لەمڕووەوە داستانی « هاروت » و « ماروت » یان هەڵبەست کە گۆیا دوو فریشتە بوونو هاتوونەتە سەرزەویی لە شاری « بابل » ــ کە شارێك بووە لە عیراق ــ تا مەردوم فێری جادوو بکەن ، وە تاقییان بکەنەوە بزانن کێ بەهۆی فێربوونی جادووەوە بێبڕوا ئەبێ ، وە ئەم فریشتانە لەپێشەوە ئامۆژگاریی ئەوکەسانەیان ئەکرد کە فێری جادوو ئەبوون ، وە پێیان ئەووتن ، ئێمە خواناردوویی بۆ تاقیکردنەوەی مەردوم ، بێبڕوا مەبن بەهۆی فێربوونی ئەم جادووەوە ، تا وەك ئێمەتان لێنەیەت ، ئنجا مەردوم لێیانەوە فێری جادوو ئەبوون بەجۆرێك کە ژنو مێردیان لەیەك ئەکرد .

وَمَا أُنْزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ ، وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولَا : إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ، فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ وَمَا هُمْ بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ،

وە هیچ ( جۆرە جادوویەك ) نەنێرراوەتە خوارەوە لە بابل بۆسەر هارووتو مارووت ، وە ( ئەمانە ) کەسیان فێر نەکردووە تا پێیان بڵێن : ئێمە هەر تاقی لەرەوەی ( ئادەمیی )ن کەواتە بێبڕروا مەبە ، ئنجا فێری جادووی‌وا بىن لێیانەوە لە ژنو مێردی پێ لەیەك بکەن ، ئەوان بەم‌جادووە نەتوانن زیان بە کەس بکەیەنن مەگەر بە خواستی خوا ،

ئنجا قورئان ئەم داستانە پڕوپووچە بەدرۆ دەرئەکات ، ئەفەرموێ ( وما أنزل على الملكين ببابل هاروت وماروت ) هیچ جۆرە جادوویەك نەنێرراوەتە خوارەوە بۆ هارووتو مارووت کە گۆیا دوو فریشتە بوون لە بابل ، وەك جوولەکە ئەڵێن ( وما يعلمان من أحد ) وە ئەمانە کەسیان فێری جادوو نەکردووە ( حتى يقولا إنما نحن فتنة ) تا ئامۆژگاری‌یان بکەنو پێیان بڵێن : ئێمە هەر بۆ تاقی‌کردنەوەی ئادەمیی هاتووین ( فلا تكفر ) کەواتە بێبڕروا مەبە ، واتە هەرکەسێك فێری جادوو بێو کاری پێبکات بێبڕروا ئەبێ ، وە هەرکەسێك فێری بێو کاری پێنەکات ، لەسەر بڕروای خۆی ئەمێنێتەوە ( فيتعلمون منهما ) تا لێیانەوە فێر بن ( ما يفرقون به بين المرء وزوجه ) جادووی‌وا کە ژنو مێردی پێ لەیەك بکەن ، واتە ئەم‌باسە هەر نەبووە ، وە ئەفسانەیە .

لەدوای گێڕرانەوەی باسی ئەم جادووەو بە درۆ خستنەوەی ، ئنجا ئەفەرموێ ( وما هم بضارين به من أحد إلا باذن الله ) جوولەکەکان بەم‌جادووە ناتوانن زیان بە کەس بگەیەنن مەگەر خواستی خوای لەسەر بێ ، واتە ئەم جادووگەرانە هێزێکی نادیار « غیبی » یان نی‌یە لەودیو ئەسبابەوە ، ئنجا ئەگەر یەکێك بە ڕێکەوت لەوجادووەوە تووشی زیانێك بوو ، ئەوە بە خواستی خوایە، واتە بەهۆی سەبەبێکەوەیە کە بەپێی دەستووری باوی خوا ئەو زیانەی لێ

وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنْفَعُهُمْ ، وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ ، مَالَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ ، وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُوا

وە فێری شتێك ئەبن کە زیانیان پێبکەیەنێ نەك قازانج ، بێ‌گومان زانی‌یان کە هەرکەسێك جادوو بکرێ ( بە فەرموودەی تەورات ) لە رۆژی دوایی‌دا بێبەش ئەبێ ، بەراستی زۆر بەدە ئەوشتەی کە ( برروای ) خۆیانیان پێفرۆشت ئەکەر

پەیدا ئەبێ •

إذنی خوا بە دوو مەعنا هاتووە :

١ ـ بەمەعنا رێدان ، وەك بڵێیت : خوا إذنی داوە بە راوکردن ، واتە رێی‌داوەو دروستە •

٢ ـ بەمەعنا گێررانی شتێك بەهۆی شتێکی‌تر ، وەك بڵێیت : هەرکەسێك زەهر بخوات ئەبێ بمرێ ، وە إذنی خوا لەسەر ئەوەیە ، واتە دەستوورو باوی خوا وایە کە زەهر خواردن مایەی مردنە ، کەوابوو کارکردنی جادوو لە هێندێ کەس بە إذنی خوا ، واتە هۆیەك هەیە بۆ ئەو کارکردنە ، کە مەبەس لە « قضا »ش هەر ئەوەیە ، کەواتە دروستە بڵێین : هەمووشتێك بە إذنی خواو قضای ئەوە ، بەلاْم دروست نی‌یە بڵێین : هەمووشتێك بە فەرمانی خواو رەزای ئەوە •

( ویتعلمون ما یضرهم ولا ینفعهم ) وە ئەمانە فێری شتێك ئەبن کە زیانیان پێبگەیەنی نەك قازانج ( ولقد علموا لمن اشتراه ) بێ‌گومان جوولەکەکان زانی‌یان هەرکەسێك جادوو بکرێ بە فەرموودەکانی تەورات ، واتە بە جادووەوە خەریك بێو دەست لە تەورات هەڵگرێ ( ما له في الآخرة من خلاق ) لە رۆژی دوایی‌دا بێبەش ئەبێ لە میهرەبانیی خوا ، چونکە تەورات جادووی بەچەشنی بتپەرستیی قەدەغە کردووە ( ولبئس ما شروا به أنفسهم ) وە زۆر بەدە ئەوشتەی کە برروای خۆیانیان پێفرۆشت ( لو کانوا

يَعْلَمُونَ (١٠٢) وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَمَثُوبَةٌ مِنْ عِنْدِ اللهِ خَيْرٌ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ (١٠٣)

---

تێگەیشتنایە (١٠٢) ئەگەر ئەوان برروایان بێنایەو پارێزگاری‌یان بکردایە بێ‌گومان پاداشتێك لەلایەن خواوە بۆ ئەوان باشتر ئەبوو ، ئەگەر بی‌یان‌زانی‌یایە (١٠٣)

---

یعلمون ) ئەگەر تێبگەیشتنایە ، واتە ئەگەر ئەوان برروادار بوونایە ، دەستیان لە تەورات هەڵنەئەگرت ، وە بەجادووەوە خەریك نەئەبوون ، بەڵام چونکە برروا‌کەیان تەواو نی‌یە ، گوێ بۆ تەوراتەکەی خۆیان ناگرن‌و کاری پێ‌ناکەن، وەك بەشیی زۆری مسڵمانەکانی ئەمرۆ ، کە گوێ بۆ قورئان ناگرن‌و کاری پێ‌ناکەن ، وە بە شتی هیچ‌وپووچەوە خەریك ئەبن •

ئنجا ئەفەرموێ ( ولو أنهم آمنوا ) ئەگەر ئەوان لەجیاتی فێربوونی جادوو برروایان بە تەوراتەکەیان ببوایە ( واتقوا ) وە لە خوا بترسانایە ، وە لە ترسی خوا خۆیان بپارێزایە لەو جادووەی کە قەدەغەی کردووە ( لمثوبة من عند الله خیر ) بێ‌گومان پاداشتێك لەلای خواوە بۆ ئەوان باشتر ئەبوو لەوەی کە پێوەی خەریك بوون ( لو کانوا یعلمون ) ئەگەر تێبگەیشتنایە •

★ ★ ★

تائێستا قسە لەوشتانە بوو کە هەر سەر بە جوولەکە بێ ، ئێستا قسە لە شتێك ئەکات کە بەشدارە لەناوەندی مسڵمانەکان‌و جوولەکەکانا ، ئەویش ئەمەیە کاتێك کە پێغەمبەر دەرسی قورئانی بە مسڵمانەکان ئەووت ، بە پێغەمبەریان ئەووت : « راعنا » واتە پەلەمان لێ‌مەکەو موراعاتمان بکە ، لەمەوە جوولەکەکان ووتەی « راعینو » یان بیرکەوتەوە کە لە « رعونة »ە ، وە بە زبانی « عبری » جنێوە ، ئنجا جوولەکەکانیش وەك مسڵمانەکان لەکاتی قسەو گوفتوگۆدا ، بە

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقُولُوا : رَاعِنَا ، وَقُولُوا : انْظُرْنَا وَاسْمَعُوا وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ (١٠٤)

ئەی ئەوانەی کە برِرواتان هێناوە مەڵێن « راعنا » وە بڵێن « أنظرنا » ( واتە : چاوەڕوانیمان لەسەر بکە ) وە (فەرموودەی پێغەمبەر) ببیەن ، وە بۆ بێ بڕوایان هەیە سزای سەخت (١٠٤)

---

پێغەمبەریان ئەووت « راعنا » بەڵام زبانی خۆیان خوار ئەکردەوە بەجۆرێکیوا کە لە ووتە « عبری »یەکە بچێ ، ئنجا بۆئەوەی کە جوولەکەکان جارێکیتر ئەم ووتەیە لەرووی پێغەمبەرا نەڵێن ، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ، فەرمووی ( یا أیها الذین آمنوا ) ئەی ئەوکەسانەی کە بڕرواتان هێناوە ( لا تقولوا راعنا ) بە پێغەمبەر مەڵێن « راعنا » با لەپەنای ئێوەدا جوولەکەکانیش وایپێنەڵێن بەمەعنایەکی ناشیرین ( وقولوا انظرنا ) وە لەجیاتی ووتەی « راعنا » پێیبڵێن : « أنظرنا » واتە پەلەمان لێمەکەو چاوەڕوانیمان لەسەر بکە ( واسمعوا ) وە باش گوێ بگرن بۆ دەرس و ئامۆژگاریی‌یەکانی ( وللکافرین ) وە هەیە بۆ ئەو بێبڕروایانەی کە ئەو قسە سووکە بە پێغەمبەر ئەڵێن : ( عذاب ألیم ) سزای سەخت •

هەر لەو ووتانەیە کە جوولەکەکان زبانی خۆیانیان تیا خوار ئەکردەوە هەرچەند سلاویان لە پێغەمبەر بکردایە ، لەجیاتی «سلام علیك » پێیان‌ئەووت « سام علیك » واتە مردنت لەسەر بێ ، چونکە «سام» بەمەعنا مردنە ، پێغەمبەریش ئەیفەرموو « وعلیك » واتە لەسەرتۆیش بێ •

ئنجا باسی ناپاکیی دڵو دەروونی جوولەکەکان ئەکات لەگەڵ مسڵمانەکانا کە تا چەندە حەسەدیان پێئەبردن لەسەر ئەوەی کە خوا ئەم ئاینو قورئانەی بۆ ناردوون ، تا ئاگاداریان بکاتەوە ، وە خۆیان بپارێزن لە فڕروفێڵو چاووڕراویان ، وە سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەو ئاینەی کە پێی‌داون ،

مَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَلَا الْمُشْرِكِينَ أَنْ يُنَزَّلَ عَلَيْكُمْ مِنْ خَيْرٍ مِنْ رَبِّكُمْ ، وَاللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَنْ يَشَاءُ ، وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾

---

ئەوانەی کە بێبڕروان لە خاوەن نامەو هاوبەش پەیداکەرەکان حەز ناکەن کە هیچ شتێکی باشتان لەخواوە بۆ بنێررێتە خوارەوە ، بەڵام خوا تەرخان ئەکات بۆ بەخشش خۆی ئەوکەسەی کە بی‌یەوێ ، وە خوا خاوەنی چاکەی گەورەیە ﴿١٠٥﴾

---

ئەفەرموێ ( ما یود الذین کفروا من أهل الکتاب ولا المشرکین ) ئەوانەی کە بێبڕروان بە پێغەمبەر ، لە گاوورو جوولەکەو هاوبەش پەیداکەرەکان ، حەز ناکەن ( أن ینزل علیکم من خیر من ربکم ) کە هیچ‌شتێکی باشتان لەخواوە بۆ بێتە خوارەوە بە سرووش ( واللە یختص برحمتە من یشاء ) بەڵام خوا تەرخان ئەکات بۆ بەخششی خۆی ، ئەوکەسەی خۆی بی‌یەوێ ، ئنجا ئەگەر خوا پێغەمبەرو مسڵمانان تەرخان بکات بەو بەخشایشە ، ئەوە لەبەرئەوەیە کە خوا خۆی ئەزانێ کە ئەوان شایستەن بۆ ئەوە ( واللە ذو الفضل العظیم ) وە خوا خاوەنی چاکەی گەورەیە •

وەك لە چەند شوێنێکی‌ترا باسمان‌کرد جوولەکەکانی مدینە لەکاتی پێغەمبەرا پێ‌یان‌وابوو کە ئەبێ پێغەمبەریەتی هەر لەناو ئەوانا بێ ، وە لەوان بەدەر نەبێ ، لەبەرئەوە بە هەموو هێزو تەوانایی خۆیانەوە خەریکی فرروفێڵو درۆو دەلەسەو ساردکردنەوەی دڵی مسڵمانەکان بوون هەر رۆژەی بەجۆرێك ، وە هەردەمەی بەرەنگێك ، لەبەرئەوە هەرچەند قسەیەکی‌وایان دابخستایە کە دڵی مسڵمانەکان تێك بدات خێرا ئایەت ئەهاتە خوارەوە لەوەراما ، وەك لەمەپێش لە سوورەی « قصص »دا ـ کە مکی‌یە ـ ووتیان : « لَوْلَا أُوتِيَ مِثْلَ مَا أُوتِيَ مُوسَىٰ ؟ » واتە بۆچی بە پێغەمبەر نەدراوە مانەندی ئەو معجزانەی کە بە مووسا دراوون ؟ ئنجا خوا وەرامێکی دانەوە لەوێدا فەرمووی:

﴿مَا نَنْسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنْسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِنْهَا أَوْ مِثْلِهَا • أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١٠٦) أَلَمْ تَعْلَمْ﴾

معجزەی هەر پێغەمبەرێك لابەرین ، یا لەبیری بەرینەوە ، معجزەیەكی لەو باشتر ، یا وەك ئەو ئەهێنین ، ئایا نازانیت كە خوا بەسەر هەموو شتێكا بەدەسەڵاتە (١٠٦) ئایا نازانیت

« أَوَلَمْ يَكْفُرُوا بِمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ مِنْ قَبْلُ ؟ » واتە ئایا بێ‌برروا نەبوون بەو معجزانەی كە لەوەپێش بە مووسا درابوون ؟• وا لێرەشا وەرامێكی‌تر ئەداتەوە ، ئەفەرموێ ( ما ننسخ من آیة ) هیچ معجزەیەك لەو معجزانەی كە بیدەین بە پێغەمبەرێك نایشۆرینەوە بەمردنگە نەیدەین بە پێغەمبەرێكی‌تر ( أو ننسها ) یا لە بیری بەرینەوە بەهۆی دووركەوتنەوەو كۆن‌بوونی‌یەوە ، وەك ئەو پێغەمبەرانەی كە ناوونیشانیان نەماوە ( نأت بخیر منها أو مثلها ) معجزەیەكی‌تری باشتر لەو ، یا وەك ئەوی ئەدەینێ ، واتە هەموو پێغەمبەرێك بەپێی كاتو دەمیی خۆی معجزەی دراوەتێ ، وەك لەمەپێش لە تەفسیری ئایەتی « وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا » دا باسمان كرد ، ئنجا بەڵگەی لەسەر ئەهێنێتەوە ، ئەفەرموێ ( ألم تعلم ) ئایا نازانیت ( أن الله علی كل شیء قدیر ) كە خوا بەسەر هەمووشتێكا بەدەسەڵاتە ؟ وە ئەتوانێ بە هەموو پێغەمبەرێك معجزەیەكی تایبەتیی‌وای بداتێ كە بۆ كاتو دەمی خۆی دەست‌بدات ، دواترینی پێغەمبەران حەزرەتی محمد چی‌بكات لە داردەستێكی وەك داردەستەكەی مووسا ، كە فرریی‌دا ببێ بە هەژدیها لەبەرچاوی سەد كەس یا هەزار كەس ؟ دوای سەد ساڵ كە ئەو زەلامانە نەمان ، كێ برروای بەو معجزەیەیە ؟ مەگەر یەكێكی خاوەن برروا ، ئایا ئەو معجزەیە بەنرخترە یا قورئان كە نامەیەكی زانیاری‌یە ، تا ئادەمیی خوێندەوارترو داناتر بێ باشتر تێی‌ئەگاتو سەری بۆ دائەنەوێنێ ، وە برروای پێ‌ئەهێنێ ( ألم تعلم ) ئایا

أَنَّ اللهَ لَهُ مُلْكُ السَّمٰاوات وَالْأَرْضِ ؟ وَمَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلا نَصيرٍ (١٠٧) أَمْ تُرِيدُونَ أَنْ تَسأَلُوا رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِنْ قَبْلُ ؟ وَمَنْ يَتَبَدَّلِ الْكُفْرَ بِالْأِيمَانِ فَقَدْ

---

که پادشایی ئاسمانان و زەویی بۆخوایە ؟ وە ئێوە هیچ گەورەو یاریدەدەرێکتان نی‌یە خوا نەبێ (١٠٧) ئایا ئێوەش ئەتانەوێ داوا (ی شتی ناقۆلا ) بکەن لە پێغەمبەرەکەتان وەك لەمەپێش داواکرا لە مووسا ، وە هەرکەسێك بێ‌بڕروایی بسێنێ بە بڕروا ، بێ‌گومان

---

نازانیت ( أن الله له ملك السماوات والارض ) کە پاشایی ئاسمانان و زەویی بۆ خوایە ؟ وە لە هەرکاتێکا بی‌یەوێ معجزەیەکی تازەی نوێ ئەدات بە پێغەمبەری خۆی ؟ ( وما لـكم من دون الله من ولي ولا نصـير ) وە ئێوە هیچ گـەورەو یاریدە دەرێکتان نی‌یە خوا نەبێ ، کەواتە گوێ بۆ قسەی ئەم ناپاکە بێ‌بڕروایانە مەگرن کە ئەیانەوێ لاتان‌بدەن ، چونکە ئەمانە هێچیان بەدەست نی‌یە ، نـە ئەتوانن قازانجتان پێ‌بگەیەنن و نە زیان ، بەڵکو ئەوی کە قازانج و زیانی ئێوەی بەدەست بێ هەر خوایە •

ئنجا ئەفەرموێ ( أم تریدون أن تسألوا رسولكم ) ئایا ئێوەش ئەتانەوێ داوای معجزەی ناقۆڵا بکەن لە پێغەمبەرەکەتان ( کما سئل موسى من قبل ) وەك لەمەپێش داوا کرا لە مووسا ، وە پێیان‌ووت : « أَرِنَا اللهَ جَهْرَةً » واتە بەئاشکرا خوامان نیشان‌بدە •

بەمـە ئامۆژگاریی مسڵمانەکان ئەکات کـە لە قسەی پێغەمبەرەکـەیان دەرنەچن ، وە پەڵپی شتی‌وای لێ‌نەگرن ، وە هەڕەشەیان لێ‌ئەکات ، ئەفەرموێ ( ومن یتبدل الکفر بالایمان ) هەرکەسێك بێ‌بڕروایی بسێنێ بە بڕروا ( فقد

ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ (١٠٨) وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّاراً حَسَداً مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ ، فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا

ڕێی ڕاستی وونکردووە (١٠٨) زۆر لە خاوەن نامەکان حەزئەکەن کە بتانکەنەوە بە بێبڕوا دوای بڕوا هێنانتان ، لەبەر حەسەدێك کە لە سروشتیانەوەیە ، ( ئەمەش ) دوای ئەوەی کە ڕاستییەکەیان بۆ دەرکەوت ، ئنجا لێیان خۆش بنو ڕوویان لێوەرگێڕن ،

ضل سواء السبیل ) بێگومان ڕێی ڕاستی وونکردووە (١) •

لەدوای ئەوەی کە فەرمانی بە مسڵمانەکان دا کە گوێ لە چاووڕاوی جوولەکە نەگرن ، ئنجا هۆی ئەمە باس ئەکات ئەفەرموێ ( ودّ کثیر من أهل الکتاب ) زۆر لە خاوەن نامەکان چ گاوورو چ جوولەکە حەزئەکەن ( لو یردونکم من بعد إیمانکم کفارا ) کە بتانکەوە بە بێبڕوا دوای مسڵمان بوونتان ( حسداً من عند أنفسهم ) لەڕووی حەسەدو پیسی دەروونیانەوە کە لەگەڵ سروشتیانا تێکەڵە ، وە لەدڵیانەوە هەڵئەقوڵێ ، وەك هەموو حەسوودێك کە یەکێك ببینێ لە خۆشییەکا کوێرایی دابێو حەز بە نەمانی ئەو خۆشییە بکات •

ئەمئاواتەش کە ئەیانخواست ( من بعد ما تبیّن لهم الحق ) دوایئەوەی کە پێغەمبەریەتی محمدیان بۆ دەرکەوت چ بە قورئانو چ بە ناونیشانەکانی تەوراتو ئینجیل •

مەبەس لەمئایەتە بێدارکردنەوەی مسڵمانانە بە پیسی دڵو دەروونی خاوەننامەکان تا بیانناسن ، وە هەمیشە خۆیانیان لێبپارێزن •

لەمحەلەدا کە دڵپیسی خاوەننامەکان دەرکەوت، ئنجا قورئان مسڵمانەکان بانگ ئەکات ، کە بەرانبەریی حەسەدیان بە حەسەدو خراپییان بە خراپە نەکەن ، ئەفەرموێ ( فاعفوا واصفحوا ) ئێوە لێیانخۆش بنو ڕوویان

(١) ئەم مەعنایەی کە لێکمانداپەوە لە ئایەتی « ماننسخ من آیة » تا ئێرە مەعنای شیخ محمد عبدەو شیخ محی الدینی عەرەبییە •

حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ، إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١٠٩)
وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ ، وَآتُوا الزَّكَاةَ ،

تا خوا فەرمانی خۆیتان بۆ ئەنێرێ ، بێگومان خوا تەوانایە بەسەر هەمووشتێکا (١٠٩) نوێژ بکەن‌و زەکات بدەن ،

لێوەرگێرن ( حتى يأتي الله بأمره ) تا خوا لەکاری خۆی ئەبێتەوە ، وە زاڵتان ئەکات‌و سەرتان ئەخات •

لێرەدا ئەگونجێ یەکێك بڵێ : ئەم لەوێچە مسڵمانە رەش‌و رووتانە لەکوێ وا بەهێز ئەبن کە شایستەی خۆش‌بوون‌و چاوپۆشیی بن لە مەردوم ، ئنجا خوا وەرام ئەداتــەوە ، ئەفەرموێ ( ان الله على كل شيء قدير ) خوا بەدەســەلاتە بەسەر هەمووشتێکا ، واتــە ئەوخوایەی کــە ئەم ئاینەی داونێ‌و رێی راستی نیشان داوون ، ئەتوانێ وا بەهێزیان بکات کە هەموو دەوڵەتێك شەرمیان لێ‌بکات، کە ئەمە بەراستی هاتەدیی ، وە دەوڵەتی ئیسلام وای لێ‌هات حکم‌رانیی ئەکرد لە رۆژهەڵات‌و رۆژئاوادا •

لەدوای بەڵێن‌دان بە یارمەتیی مسڵمانان‌و ئامۆژگاری‌یان بە پشت‌بەستن بە خوا ، ئنجا فەرمانی هێندێك شتی‌وایان پێ‌ئەدات کە مایەی هاتنەدیی ئەم‌بەڵێنانە بێ ، ئەفەرموێ ( وأقيموا الصلاة ) نوێژ بکەن ، وە بە دڵ رووبکەنە خوا ، وە بەم‌رەنگە بیروباوەڕتان لەگەڵ خوادا شەوورۆژی پێنج‌جار تازە بکەنەوە •

( وآتوا الزكاة ) وە زەکات بدەن ، وە نەبوونیی‌و نامانگووریی هەژاران هەڵگرن لەناوا ، وە خۆشیی بخەنە دڵی خۆیان‌و ماڵ‌و منداڵیانەوە ، وە خەشم‌و قین‌و ناحەزی‌یان بگێرن بە خۆشەویستیی‌و دۆستایەتیی ، وە بەم‌جۆرە یەکێتی کۆمەڵەو گەل رابگرن •

دوای ئەوەی کە فەرمووی نوێژو زەکات مایەی سەرکەوتن‌و زاڵ‌بوونە لەجیهانا ، ئنجــا ئەیانکات بە مایەی خۆشیی‌و خۆشــبەختی رۆژی دوایش ،

وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنْفُسِكُمْ مِنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِنْدَ اللهِ ، إِنَّ اللهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (١١٠) وَقَالُوا لَنْ يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَنْ كَانَ هُوداً أَوْ نَصَارَى تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ، قُلْ : هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (١١١)

---

وە هەرچی پێشخەن لـە چاکـە بۆخۆتان ، لای خوا دەستتان ئەکەوێتـەوە ، بێ‌گومان خوا بینایە بەوەی کە ئەیکەن (١١٠) ( جوولەکەو گاوور ) ووتیان : کەس ناچێتە بەهەشت جوولەکە یا گاوور نەبێ ، ئەمە ئاواتیانە ، ( پێ‌یان ) بڵێ : بەڵگەتان بێنن ئەگەر راست ئەکەن (١١١)

---

ئەفەرموێ ( وما تقدموا لأنفسكم من خير ) هەرچی پێشخەن لە چاکە بۆخۆتان ( تجدوه عند الله ) دەستتان ئەکەوێتەوە لای خوا ( إن الله بما تعملون بصير ) بەراستی خوا بینایە بەوەی کە ئەیکەن •

* * *

ئنجا قسەی خاوەن نامەکان ئەباتە دواوە لە گاوورو جوولەکەکان ، کـە هەرلایە پێی‌وایە کە هـەر خۆی خاوەنی رێنموونی‌یە ، وە بەهەشت هـەر بۆئەوە ، وە کەسی‌تر ناچێتە ناوی ، تا لەپاشا خۆی باسی ، رێ‌راستەکە ئەکات ، ئەفەرموێ ( وقالوا : ) جوولەکـەو گاوورەکان ووتیان : ( لن يدخل الجنة ) کەس ناچێتـە بەهەشت ( إلا من كان هوداً أو نصارى ) جوولەکـە یا گاوور نەبێ ، واتە جوولەکە ئەی‌ووت : هەر جوولەکەو ، گاوور ئەی‌ووت : هەر گاوور ئەچێتە بەهەشت ، وەئەمە بیروباوەرری هەردوولایەکیانە تا ئەمررۆ •

ئنجا ئەفەرموێ کە ئەم‌قسەیە هیچ بەڵگەو پاڵپشتێکی نی‌یە لـە نامەکانی خۆیانا ، وە ئەڵێ ( تلك أمانيهم ) ئەمە ئاواتی پرروپووچی خۆیانە ، لەبەرئەوە خوا بە پێغەمبەر ئەفەرموێ : داوای بەڵگەیان لێ‌بکە ، وە ( قل ) پێ‌یان بڵێ : ( هاتوا برهانكم ) بەڵگەتان چی‌یە لەسەر ئەم قسەیە بیهێنن ( إن كنتم صادقين ) ئەگەر راست ئەکەن ، واتە درۆ ئەکەن وە هیچ بەڵگەیەکتان بەدەستەوە نی‌یە •

بَلىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ ـ وَهُوَ مُحْسِنٌ ـ فَلَهُ أَجْرُهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ (١١٢)

---

نەء وا نییە ! ( بەڵکو ) هەرکەسێك بەراستی رووبکاتە خوا ـ وە ئەوکەسە خاوەن چاکە بێ ـ بۆی هەیە پاداش لەلای پەروەردگاری‌یەوە ، نە ترسیان لەبەرەو نە خەم ئەخۆن (١١٢)

---

لێرەدا قورئان دەستوورێکی ئیسلامی دائەمەزرێنێ بەتێکرایی بێ‌ئەوەی کە تەماشای گەلێکی تایبەتیی بکات ، ئەفەرموێ ( بلی ) نەء ٠٠ وانی‌یە وەکو ئێوە ئەڵێن : کە هەر گاوور یا هەر جوولەکە ئەچێتە بەهەشت ، بەڵکو خەڵقی‌تریش ئەچنە بەهەشت باگاوورو جوولەکەش نەبن ، چونکە میهرەبانیی خوا وەنەبێ هەر بۆ گەلێك بێ ، بەڵکو بە هەمووکەسێکە لە هەرگەلێك ، کە داوای بکات‌و هەوڵی بۆبدات ، هەوڵەکەش بەم‌رەنگە بێ کە ئەفەرموێ ( من أسلم وجهه الله ) هەرکەسێك خۆی بداتە دەست خوا ، واتە بە دڵ رووی تێ‌بکات‌و بی‌پەرستێ ( وهو محسن ) وە ئەوکەسە خاوەن چاکە بێ لە گوفتارو کردارا ( فله أجره عند ربه ) بۆ ئەو هەیە پاداش لای پەروەردگاری خۆیەوە ( ولا خوف عليهم ) نە ترسیان لەبەرە ( ولا هم يحزنون ) و نە خەم ئەخۆن ، چونکە پشتیان بەخوا قایمە ، بەڵام ئەوانەی کە پشت ئەبەستن بەم‌و بەو ، ئەوانە بە هەموو چاوفرڕینێك ، یا قرەی قەلەرەشێك ، یا خوێندنی کوندەبەبوویەك ، دڵیان دائەچڵەکێ‌و رەگ‌و دەماریان سست ئەبێ ٠

بەڵام خواپەرستی بەراستیی ، ئەزانێ کە کەس هیچ نی‌یە خوا نەبێ ، وە هەر کەسێك بەپێی دەستوورو باوی خوا برروا بەرێدا ، خۆشبەختە لە هەردو جیهانا ، وە ئەگەر جارێك تووشی ناخۆشیی‌و خەم‌و تەمێك بوو خێرا ئەگەررێ بەشوێن هۆیەکەیا ، وە بەشوێن ئەو هەڵەیەی کە کردوویەتی ، تا جارێکی‌تر نەیکاتەوە ، وە ئەگەر شتێك رووی‌دا کە هیچ چارەی نەبوو ، ئەوحەلە کاری خۆی ئەداتە دەست خوا ، وە زۆر خەمبار نابێ ٠

واتە ئەی خاوەن‌نامەکان دوای هیوای هیچ‌وپووچ‌و ئاواتی بێ‌سەروبێ

وَقَالَتِ الْيَهُودُ : لَيْسَتِ النَّصَارَى عَلَى شَيْءٍ ، وَقَالَتِ النَّصَارَى : لَيْسَتِ الْيَهُودُ عَلَى شَيْءٍ ـ وَهُمْ يَتْلُونَ الْكِتَابَ ـ كَذَلِكَ قَالَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ

جوولەکە ئەڵێن : گاوور لەسەر هیچ ( ئایینێك ) نین ، وە گاوور ئەڵێن : جوولەکە لەسەر هیچ ( ئایینێك ) نین ـ ( لەگەڵ ئەمیشە ) کە ئەوان دەوری نامەکان ( یان ) ئەکەنەوە ـ ( کە تەوراتە مژدە بە عیساو ئینجیلە پشتیوانیی مووسا ئەکات ) ، هەر بەم رەنگەیان ئەوت ئەوانەی کە نەزانن ( لە بتپەرستان )

مەکەوون ، بەمە یاخیی مەبن کە بەدرۆ ئەڵێن ئێمە لەسەر رێی فلان پێغەمبەرو فیسار پێغەمبەریین ، رێی بەهەشت هەر ئەوەیە کە بەدڵ رووبکەنە خوا ، وە بەراستیی خۆتان بدەنە دەست ئەو ، وە هەرچی کردەوەی چاك هەیە بیکەن ، وە لە هەموو گوفتارێکی خراپ خۆتان بپارێزن •

دوای ئەوەی کە قسەی گاوورو جوولەکەکانی بردەدواوە کە ئەیانووت: کەس ناچێتە بەهەشت هەر جوولەکە ، یا هەر گاوور نەبێ ، ئنجا باسی قسەی خۆیان ئەکات دەربارەی یەکتریی ، ئەفەرموێ ( وقالت الیهود : ) جوولەکە ئەڵێن ( لیست النصاری علی شيء ) گاوور لەسەر هیچ ئایینێك نین ( وقالت النصاری : ) وە گاوور ئەڵێن : ( لیست الیهود علی شيء ) جوولەکە لەسەر هیچ ئایینێك نین ، لەگەڵ ئەمیشە ( وهم یتلون الکتاب ) کە ئەوان هەریەکە دەوری نامەی خۆی ئەکاتەوە ، واتە جوولەکە دەوری تەورات ئەکەنەوە کە مژدەی داوە بە پێغەمبەرێك لەخۆیان وەك عیسا بێ ، کەچی برروایان پێ‌نەهێنا ، وە بەگوێی نامەکەی خۆیانیان نەکرد ، هەروا گاورەکان دەوری ئینجیل ئەکەنەوە کە بەزبان عیساوە ئەفەرموێ : من هاتووم بۆ پشتیوانیی تەورات ، نەك بۆ هەڵوەشاندنەوەی ، کەچی برروایان پێ‌نەهێناو بەگوێیان نەکرد ، واتە هەرچی نامەی ئاسمانیی هەیە هەموو وەك‌یەك وان ، وە پشتیوانی یەکترن ، کەسێك برروای بە یەکێکیان بێ ئەبێ برروای بەوانیکەی‌تریشی بێ •

لەپاشا ئەفەرموێ ( کذلك قال الذین لا یعلمون مثل قولهم ) هەر

فَاللهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ (١١٣)

ئنجا خوا لە رۆژی دوایی‌دا بڕیار ئەدات لەناویانا لەوشتانەی کە تیا دووبەرەکیی کەوتوون (١١٣)

بەم‌رەنگەیان ئەووت ئەوانەی کە نەزانن ، وە نامە شك‌نابەن ، وەك بت‌پەرستەکانی عەرەب‌و پێش‌ئەوان ، کە بە خاوەن ئاینەکانیان ئەووت : ئێوە لەسەر هیچ ئاینێکی بەراستی نین ، واتە هەموو دەمارفرۆشیی‌و رەگەزپەرستیی‌یان هێناوەتە کایەوە ، وە لەرێی راست لایان‌داوە ، کە ئەویش بڕوایە بەخوا ، لەگەڵ کردەوەی چاك‌و گوفتاری پاکا ، ئەگەر مەردوم ئارەزووبازی‌یان نەکردایە ، وا دووبەرەکیی نەئەکەوتن لەئاینا ، وە شارزێی راست‌و دروستیان وون‌نەئەکرد ( فالله يحكم بينهم يوم القيامة ) ئنجا خوا لە رۆژی دوایی‌دا بڕیاری خۆی ئەدات لەناویانا ( فيما كانوا فيه يختلفون ) لەوشتانەی کە تیا دووبەرەکیی کەوتوون •

جێی داخ‌و خەفەتە کە ئێستا مسڵمانەکانیش لەناوخۆیانا وایان لێ‌هاتووە ، هەر دەستەیەك خۆی بە مسڵمان ئەزانێ‌و دەستەکەی‌تر بەهیچ • لەگەڵ ئەمیشە کە هەموولایەکیان دەوری قورئان ئەکەنەوە ، وە قورئانیش فەرمان ئەدات بە یەکێتیی‌و برایەتیی ، وە جڵەوگیریی ئەکات لە جیاوازیی‌و دووبەرکیی، وە ئەفەرموێ « واعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا » آل عمران /١٠٣ •

واتە هەموو دەست بگرن بە کەمەندی خوا ، وە لە یەك مەپچڕێن •

خاوەن‌نامەکان دەمارفرۆشیی ئەکەن لەگەڵ یەکا ، وە هەر بەئارەزوو جوولەکە گاوور بە بێ‌بڕواو گاوور جوولەکە بە بێ‌بڕوا ئەزانێ لەگەڵ ئەمیشە کە تەورات‌و ئینجیل بەدرۆیان ئەخاتەوە ، هەروا بت‌پەرستەکانی عەرەب‌و پێش ئەوانیش وابوون ، وە هیچ خاوەن‌نامەیەکیان بە خاوەنی ئاینی راستەقینە نەزانیوە • ئەوە بت‌پەرستەکانی مکە ، کە پێغەمبەرو مسڵمانەکانیان لە مکە دەرکرد ، وە نەیان‌هێشت خواپەرستیی بکەن لە کعبەدا ، لەپاشا لە ساڵی

وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ مَنَعَ مَسَاجِدَ اللهِ أَنْ يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَى فِي خَرَابِهَا ؟

کێ لەوکەسە ستەمکارترە ، کە قەدەغەی مزگەوتانی خوا ئەکات لەوەی کە ناوی خوایان تیا ببرێ ، وە هەوڵ ئەدا بۆ وێرانی‌یان ؟

« حديبية » شا کە پێغەمبەر لەگەڵ هێندێك لە مسڵمانەکان بە بێ‌چەك چوون بۆ مکە بۆ عومرەو زیارەتی کعبە ، بێ‌بڕرواکان نەیانهێشت بچنە ناوشارەوە ، وە لە قەراغ شاری مکە گێررانیانەوە .

ئەوە « تیطس »ی روومانیی کە بت‌پەرست بووە ، دوای عیسا بە حەفتا ساڵ چوو بۆسەر « بيت المقدس » و وێرانی کرد ، وە بەردی بەسەر بەردی‌یەوە نەهێشت ، وە هەرچی نسخەی تەورات بوو لە بيت المقدس‌دا هەمووی سووتاند ، وەکو ئیشارە بۆ ئەم دوو بەسەرهاتە ئەکات بەکورتیی ، بەمڕەنگە :

دەربارەی یەکەمیان ، ئەفەرموێ ( ومن أظلم ممن منع مساجد الله ) کێ لەوکەسە ستەمکارترە کە قەدەغەی مزگەوتانی خوا ئەکات ( أن يذكر فيها اسمه ) لەوەی کە ناوی خوایان تیا ببرێ .

وە دەربارەی دووهەمیـان ، ئەفەرموێ ( وسعى في خرابها ) وە هەوڵ ئەدات بۆ وێرانکردنیان ؟ واتە ئەم دوودەستەیە لە هەمووکەسێك خراپترو ستەمکارترن ، چونکە خواپەرستیی هەر قازانجی هەیە ، وە نەکردنی هەر زیانی هەیە ، وە قەدەغە کردنی مزگەوتان لە خواپەرستیی مایەی رووخاندنی ئایین‌و لەبیرچوونەوەی خوایە کە خواش لەبیرچووەوە ، ئەوحەلە مەردوم گەلێ گەلێ لە جانەوەر خراپتر ئەبێ ، وە ژیان ئەبێ بە زەنجیرەیەك لە دەست‌درێژیی بۆ سەرو ماڵ‌و ناموسی مەردوم ، وە کەس لەکەس دڵنیا نابێ ، وە هەرکەسێك هەرچێکی بۆ هەڵکەوێ ئـەیکات ، بەڵام خواپەرستیی بەراستیی مەردوم لـە سنووری خۆی رائەگرێ ، وە نایەڵێ کەس دەست‌درێژیی بکات بۆ کەس ، هەر لەبەرئەوەیە کە ئایینی ئیسلام فەرمان ئەدات بە رێز « إحترام »ی کڵێسەو

أُولَئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَنْ يَدْخُلُوهَا إِلَّا خَائِفِينَ ، لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ ، وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (١١٤)
وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ ،

وا شایستە بوو بۆ ئەوان کە هەر بەترسەوە بچوونایەتە ناویانەوە ، هەیە بۆ ئەوان لە جیهانا ، ریسوایی ، وە لە رۆژی دواییدا سزای گەورە (١١٤) رۆژهەلاتو رۆژئاوا بۆخوایە ، بۆ هەرلایەك رووبکەن ئەوێ روو بەخوایە ،

کەنشتەو هەموو جێگایەکی خواپەرستیی لە جیهانا ، ( أولئك ) ئەوانەی کە قەدەغەی مزگەوتان ئەکەن لە خواپەرستیی ، یا هەووڵ ئەدەن بۆ وێرانیی‌یان ( ما کان لهم أن یدخلوها إلا خائفین ) وا شایستە بوو بۆئەوان کە لەترسی خوا هەرچەند بچوونایەتە مزگەوتانەوە ـ بە ترسو لەرزەوە بچوونایەتە ناوی ، نەك رێی خواپەرستان بگرن ، وە جێی خواپەرستیی برروخێنن •

ئنجا خوا هەررەشەیان لێ ئەکات لەسەر ئەم زۆرو ستەمەیان ئەفەرموێ ( لهم في الدنیا خزي ) هەیە بۆ ئەو جۆرەکەسانە لە جیهانا ریسوایی ( ولهم في الآخرة عذاب عظیم ) وە لە رۆژی دواییدا سزای گەورە •

ریسوایی جیهانیان بەهۆی ئەو بەربەرەڵلایی‌و وێرانیی‌یەوەیە ، کە زۆرو ستەمو دەستدرێژیی ئەوان بەجێی دێڵێ لەووڵاتا ، نەخوازەلا ئەو زۆرو ستەمەی کە سنووری ئایین ئەشکێنێ‌و دەرگای بێ‌شەرعیی ئەکاتەوە ، وەك وێرانکردنی مزگەوتانو جڵەوگیریی مەردومان لە نوێژو بانگدانو خواپەرستیی •

سزای رۆژی دوایش هەر خوا خۆی ئەزانێ چۆنە •

گەلانی پێش ئیسلام لایانوابووە کە خواپەرستیی ئەبێ هەر لە پەرستگە « معبد »دا بێ ، ئەگینا دروست نی‌یە ، ئنجا بۆئەوەی نیشان بدات کە لەئایینی ئیسلاما وانی‌یە ، وە دروستە بۆ هەمووکەسێك لە هەمووشوێنێك خواپەرستیی بکات ، وە بۆ هەرلایەك کە بە رووگەی بزانێ رووی تێبکات ، فەرمووی ( ولله المشرق والمغرب ) رۆژهەلاتو روژئاوا بۆخوایە ، واتە هەموو زەویی هی خوایە ( فأینما تولوا ) ئنجا بۆ هەرلایەك رووبکەن لە نوێژا ( فثم وجه الله ) ئەوێ روو

إنَّ اللهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (١١٥) وَقَالُوا اتَّخَذَ اللهُ وَلَداً ،

---

بێگومان خوا لە هەموو شوێنێك هەیەو ئاگادارە ( بەوانەی رووی تێئەکەن ) (١١٥) ووتیان خوا منالی هەیە

---

بەخوایە ، بەڵام چونکە خوا لـە هەمووشوێنێکە ، وە رووتێکردنی بەمەعنایە ناگونجێ ، لەبەرئەوە شوێنێکی تایبەتی کرد بە رووگە،تا رووکردن بۆ ئەوشوێنە وەك رووکردنە خوا وابێ ، جگە لەوە کـــە مسڵمانانیش لە هەموو جیهـانا کۆئەکاتەوە لەنوێژا بۆ یەكلا ، وە یەکێتی ئەخاتە ناویانــەوە ، وە رزگاریان ئەکات لەوەی کە هەریەکە رووبکاتە لایەك •

( ان الله واسع ) خوا لە هەموو شوێنێك هەیە ، وە بێسنوورە نایەوێ تەنگ بە بەندەی خۆی هەڵچنێ ( علیم ) ئاگادارە بەوانەی کە بە دڵ رووی تێئەکەن ، کەواتە لە هەرلایەك بوون ، خواپەرستن ، وە لە هەرشوێنێك بوون رووی تێبکەن ، بە رووکردنە رووگە •

ئەم ئایەتە وەك سەرەتا وایە بۆ باسی گۆرینی رووگە ، کـە لە ئایەتی ١٤٢ وەوە دەستی پێئەکات •

* * *

ئەوەبوو لەمەپێش نەنگی گرت لە خاوەن‌نامەکان بە ئایەتی « وقالوا : لن یدخل الجنة الا من کان هوداً أو نصاری » وە بە ئایەتی « وقالت الیهود لیست النصاری علی شيء » ، وا دووبارە هاتەوە سەر ئەوباسە ، ئەفەرموێ ( وقالوا : اتخذ الله ولدا ) گاوورو جوولەکەو هاوبەش پەیداکەرەکان ووتیان : خوا منالی هەیە ، واتە بەلای هێندێك لـە جوولەکەوە « عُزَیْر » و بـەلای گاوورەوە « عیسا » کوری خوان ، هەروەك بەلای هێندێك لە هاوبەش پەیداکەرەکانی عەرەبیشەوە « فریشتە » کچی خوان ، ئنجا ئەم قسە ناقۆلایانە ئەباتەدواوە ،

سُبْحَانَهُ ! بَلْ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلٌّ لَهُ قَانِتُونَ (١١٦) بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ : كُن فَيَكُونُ (١١٧)

---

ئەو پاكو بەدووره لەوه • بەڵكو هەرچی هەیە لە ئاسمانو زەویدا هی ئەوه هەموو فەرمانبەری ئەوون (١١٦) دروست‌كەری ئاسمانانو زەوی‌یە كاتێك كە ویستی شتێك بكات هەر ئەوەندەی پێ‌ئەوێ ، كەپێی‌بڵێ : ببە ئیتر ئەبێ (١١٧)

---

( سبحانه ) پاكیی‌و بێ‌نەنگیی بۆخوایە ، نە لە كەس بووەو نە كەسی لێ‌بووه (بل له ما في‌السماوات والارض) بەڵكو هەرچی لە ئاسمانانو زەویی‌دایە، هی ئەوه وه بۆئەوه ( كل له قانتون ) هەموو بەندەو فەرمانبەری ئەوون ( بديع السماوات والارض ) دروست‌كەری ئاسمانانو زەوی‌یە بەم‌جوانیی‌و رێك‌وپێكی‌یە ، ئنجا كەوابوو ئیتر چۆن دروستە لەناو ئەمانەدا شتێك بەتایبەتیی پاڵبدرێ بۆلای خوا كە گۆیا كورریەتی ، وه هاوتەحرو وێنەیەتی ( واذا قضى أمرا ) هەركاتێك ویستی كارێك بكات ( فانما يقول له كن ) هەر ئەوەندەی پێ‌ئەوێ كە پێی‌بڵێ : ببە ( فيكون ) ئیتر ئەبێ بەورەنگەی كە خۆی ئەیەوێ ، بێ‌ئەوەی كە هەناسەیەك دواكەوێ ، بەڵام ئەو ویستنە چی‌یە ؟ وه چۆن پەیوەندیی ئەكات لەگەڵ ئەوشتەدا ؟ ئەمە كەس نەیزانیوەو نایزانێ •

لێرەدا جێی‌ئەوەیە كە باسێكی « قەزا » و « قەدەر » بكەین •

قەدەر : ئامادەكردنی شتێكە بۆ بوون •

قەزا : هێنانەدیی ئەوشتەیە •

كەواتە خۆپاراستن لە قەدەر ئەبێ ، بەڵام لە قەزا نابێ ، ئەگێرنەوه كە جارێك پێغەمبەر ، لە بەر ئەشكەوتێكا ئەوێستێ كە وورگی دابوو ، خێرا لێی دوورئەكەوێتەوه ، لێی‌ئەپرسن : تۆ لەدەست قەزا رائەكەیت ؟ ئەفەرموێ : لەدەست قەزا رائەكەم بۆلای قەدەر •

تائێستا قسە لەو هاوبەش پەیداكەرانە بوو كە ئەیانووت : خوا منالی هەیە ، ئنجا قسە لەوكەسانەئەكات كە برروایان بە پێغەمبەریەتیی پێغەمبەر نی‌یە ،

وَقَالَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ : لَوْلَا يُكَلِّمُنَا اللهُ أَوْ تَأْتِينَا آيَةٌ ! كَذَلِكَ قَالَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ مِثْلَ قَوْلِهِمْ ، تَشَابَهَتْ قُلُوبُهُمْ

نادانەکان وتیان : ( ئەگەر خوا بڕوای لە ئێمە ئەوێ ) بۆچی خۆی قسەمان لەگەڵ ناکات ، یا نیشانەیەکمان بۆ نایەت ، هەروەك ئەمانیان وتووە ئەوانەی کە لەپێش ئەمانیشا بوون ، دڵو دەروونیان لە یەك ئەچێ ،

وە داوای معجزەی ناقۆلای لێئەکەن ، ئەفەرموێ ( وقال الذين لا يعلمون ) نادانە بتپەرستەکانی عەرەب ـ کە بێنامەن ـ ووتیان : ئەگەر خوا بڕوای لە ئێمە ئەوی ( لولا يكلمنا الله ) بۆچی خۆی قسەمان لەگەڵ ناکات ، وە پێمان ناڵێ کە تۆ پێغەمبەریت ( أو تأتينا آية ) یا نیشانەیەکمان بۆ نایەت لەونیشانانەی کە داوامان کردووە ، وەك لە سوورەی « اسری »دا باسیان ئەکات ئەفەرموێ « وَقَالُوا : لَنْ نُؤْمِنَ لَكَ حَتَّى تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الْأَرْضِ يَنْبُوعاً[1] ... » ( كذلك قال الذين من قبلهم مثل قولهم ) هەروەك ئەمانیان ووتووە ئەو نەزانانەی کە لەپێش ئەمانیشا بوون ، وە پێغەمبەریان بۆ چووە ، وە هەر بەئارەزوو بڕوایان نەهێناوەو داوای معجزەی ناقۆلایان لێکردوون ، بەم رەنگە یاپێیان ووتوون : « أَرِنَا اللهَ جَهْرَةً »[2] نساء/١٥٣ . وە یا پێیان ووتوون « هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ »[3] مائدة /١١٣ . ( تشابهت قلوبهم ) دڵو دەروونو بیروباوەڕی هەمووڵایەکیان لەیەك ئەچێ ، واتە بێبڕواکانی زەمانی پێغەمبەرو زەمانی مووساو عیسا بە دڵ بێبڕوان ، وە بەئارەزوو پەڵپ ئەگرن .

(١) واتە ووتیان بڕوات پێناهێنین تا کانییەکمان لەزەویی بۆ هەڵنەقوڵێنێت .

(٢) واتە خوامان نیشانبدە بەئاشکرا .

(٣) واتە ئاخۆ پەروەردگاری تۆ بتوانێ کە خوانێکمان لە ئاسمان بۆ بنێرێتە خوارەوە .

قَدْ بَيَّنَّا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ (١١٨) إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ
بَشِيراً وَنَذِيراً وَلَا تُسْأَلُ عَنْ أَصْحَابِ

---

بێ گومان نیشانەهامان باس کردووە بۆ گەلێك کە بڕروا بێنێ (١١٨) ئێمە تۆمان نارد بە ئایینێکی راستو دروستەوە بە مژدە دەرو ترسێنەر ، وە تۆ بەرپرسیار « مسئول » نیت لە یارانی

---

بەراستی ئەمقسەیە زۆر ناقۆڵایە ، چونکە ئەگەر خوا قسە لەگەڵ هەموو کەسێك بکات ، ئەوجەلە بڕروا بەناچاریی پەیدا ئەبێ ، وە پێویست بە پێغەمبەران نامێنێ ، وە دەستووری تکلیف تێك ئەچێ ، لەگەڵ ئەمیشە کە پێویستە مەردوم خۆی بیر بکاتەوە ، وە بەئارەزووی خۆی بڕروا بێنێ ، بۆئەمەش ( قد بینا الآیات ) ئێمە نیشانەی زۆرمان لە ئەرزو ئاسمانا داناوە ، وە لەسەر زمانی پێغەمبەران راڤەمان کردووە ( لقوم یوقنون ) بۆ گەلێك کە بی یەوێ تێ بگاتو بڕروا بێنێ ، بەڵام ئێوە ناتانەوێ بڕروا بێنن یا نشانەی زۆریشتان نیشان بدرێ •

بەراستیی دەوری شتانی پێچەوانەی دەستوورو باوی تێکرایی سروشت « خوارق » بەسەرچوو ، رۆژی بیرکردنەوەیە ، ووردبوونەوەی چەنددەمێك ، لە هەزاران خەوارق بەکەڵکترە •

* * *

دوای ئەوەی کە قسەی گاوورو جوولەکەو بتپەرستەکان برانە دواوە ، ئنجا رووئەکاتە پێغەمبەر ، وە پیشە « وظیفە »ی چی بێ ، پێی ئەڵێ ، وە پەردە هەڵئەداتەوە لەسەر ئەو کێشەیەی کە لەناوەندی ئەوو گاوورو جوولەکەدا هەیە ، ئەفەرموێ ( إنا أرسلناك بالحق ) ئێمە تۆمان رەوانە کرد بەئایینێکی راستو دروستو دەستوورێکی رێك وپێکی واوە ، کە مایەی خۆشیی هەردو جیهانە ، ئنجا کە ناردووشمانیت ( بشیراً ونذیرا ) ببە مژدەدەری چاکانو ترسێنەری خراپان ، واتە پیشەی تۆ هەر ئەمەندەیە ( ولا تسأل عن أصحاب

الْجَحِيمِ (١١٩) وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَى حَتَّى
تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ، قُلْ : إِنَّ هُدَى اللهِ هُوَ الْهُدَى وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ
أَهْوَاءَهُمْ بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ ،

---

دۆزەخ (١١٩) هەرگیز نە جوولەکەو نە گاوور لێت رازیی نابن تا دوای ئایینیان نەکەویت ، ( پێیان ) بڵێ : هەر رێنموونیی خوایە ، رێنموونیی بەراستیی ، وە ئەگەر دوای ئارەزوواتی ئەوان بکەویت ( ئەی محمد ) دوای ئەو زانینەی کە ( لەخواوە ) بۆت هاتووە ،

---

الجحيم ) وە پرسیار لە تۆ ناکرێت لەوکەسانەی کە بەهۆی خراپیی خۆیانەوە ئەچنە دۆزەخەوە ، چونکە تۆ بۆ ئەوە نەنێرراویت کە بەزۆر بیرو بڕوا بەیتە دڵی مەردومەوە ، وە ئەگەر یەکێك بڕوا نەهێنێ تۆ پرسیار لێکراو نیت •

( ولن ترضى عنك اليهود ولا النصارى ) جوولەکەو گاوور هەرگیز لە تۆ رازیی نابن ( حتى تتبع ملتهم ) تاکو دوای ئایینیان نەکەویت ، واتە هەمیشە لەگەڵتا ئەجەنگن‌و چاوورراووت لێ‌ئەکەن ، مەگەر دەست لە ئایینەکەی خۆت هەڵگریت‌و دوای ئەوان بکەویت ، وە تۆش وەکو ئەوان هاوبەش بۆ خوا پەیدا بکەیت‌و کوڕری بۆ دابنیت •

ئنجا خوا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر بە فەرمانێکی توندو تیژ ، ئەفەرموێ ( قل : إن هدى الله هو الهدى ) پێیانبڵێ : هەر رێنموونیی خوایە رێنموونیی بەراستی ، کە مەردوم بگەیەنێ بە رێی راست ، وە بێجگە لەوە هیچ رێنموونی‌یەکی‌تر نی‌یە ، کەوابوو دەست لێ‌هەڵگرتنی نی‌یە ، واتە ئەگەر بتەوێ رازی‌یان بکەیت ئەوان رازیی نابن تا دوای بیروباوەڕیان نەکەویت ( ولئن اتبعت أهواءهم ) وە ئەگەر دوای ئارەزوواتی ئەوان بکەویت ( بعد الذي جاءك من العلم ) دوای ئەو زانینەی کە لەخواوە بۆت‌هاتووە ، تۆ هەرگیز

مَالَكَ مِنَ اللهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ (١٢٠) أَلَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ ، أُولَئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ ، وَمَنْ يَكْفُرْ بِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ (١٢١)

---

هیچ سەرپەرشتی‌کەرو یاریدەدەرێکت نابێ لەلایەن خواوە (١٢٠) ئەوانەی کە نامەمان داونێو بەراستی دەوری ئەکەنەوە ، ئەوانە برروا ئەهێنن بە رێنموونیی خوا (کە ئیسلامە) ، وە ئەوانەی بێبرروا بن پێی ، هەر ئەوانن زەرەرمەند(١٢١)

---

سەرناکەویت ، وە بە پایەو پلەی خۆت ناکەیت ، چونکە ( مالك من الله من ولي ولا نصير ) خوا سەرپەرشتییت ناکاتو یارمەتییت نادات •

ئائیستا باسی ئەوەی کرد کە بەشی زۆری گاوورو جوولەکە هیوای مسلمان بوونیان لێناکرێ ، ئنجا ئەفەرموێ ئـەم خاوەن‌نامانە هەرچەند بەشی زۆریان وان ، بەڵام هی‌واشیان هەیە کە هیوای مسلمان بوونیان لێ ئەکرێ ، وە ئەوانە ئەو گاوورو جوولەکانەن کـە وورد ئەبنەوە لە نامەکانیان ، وە راستو درۆ لە یەك جیا ئەکەنەوە ، وەکو ئەفەرموێ ( الذین آتیناهم الکتاب ) ئەوانەی کە نامەمان داونێ لە گاوورو جوولەکە ، وە ( یتلونه حق تلاوته ) دەوری ئەکەنەوە بەراستیی ، وە لێی وورد ئەبنەوە ( أولئك یؤمنون به ) ئەوانە برروا ئەهێنن بە رێنموونیی خوا کە ئایینی ئیسلامە ( ومن یکفر به ) وە ئەوکەسەی بێبرروا بێ پیێ ( فأولئك هم الخاسرون ) هەر ئەوانن زەرەرمەند •

* * *

لەدوای ئـەم تۆمار « تقریر »ە دوورو درێژەی کـــە دای دەربارەی جوولەکە لـــە ئایەتی چلـەوە تائێرە ، وە لـەدوای ئـەم مێژووچـەیـەیان لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکانیان ، وە لەدوای ئەم هەموو بانگ‌کردنو دڵخوشی‌دانەوەیەیان دەمێ بە نەرمیو دەمێ بە توندیی ، وەك لێیان ناهومێد بێ ، وە بێ‌یەوێ دواهەمین جار بانگێکی‌تریان بکاتەوە بەناوی نەوەی پێغەمبەرانەوە ، وەك لەسەرەتای باسەکەوە بانگی کردن ، وە ئەو ئایەتە نەرمو شلەی لەپێشی

يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ ، وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ (١٢٢) وَاتَّقُوا يَوْماً لَا تَجْزِي نَفْسٌ عَنْ نَفْسٍ شَيْئاً ، وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ ، وَلَا تَنْفَعُهَا شَفَاعَةٌ وَلَا هُمْ يُنْصَرُونَ (١٢٣)

---

ئەی نەوەی یعقوب پێغەمبەر بیری ئەو چاکانە بکەنەوە کە رشتوومن بەسەرتانا ، وە من باوی ئێوەم دا بەسەر هەموانا (١٢٢) وە خۆتان بپارێزن لە رۆژێك کە کەس لەجیاتی کەس تۆڵەو پاداش نادرێتەوە ، وە بارمتەی لێ وەرناگیرێ وە هیچ تکایەك کەڵکی ناکرێ ، وە یارمەتیی نادرێن (١٢٣)

---

پێشەوە دای بە گوێچکەیانا تا دڵیان داچڵەکێنێ ، دووبارە بیداتەوە بە گوێچکەیانا، فەرمووی ( یا بني اسرائیل ) ئەی نەوەی یعقوب پێغەمبەر ( اذکروا نعمتي التي انعمت علیکم ) بیری ئەو چاکانە بکەنەوە کە وەختی خۆی رشتوومە بەسەرتانا ( وأني فضلتکم علی العالمین ) وە من باوی باوو باپیرەکانی ئێوەم دا ـ لەکاتی مووساو دوای ئەو تا ماوەیەك ـ بەسەر جیهانیانا ، بەناردنی نامەو رەوانەکردنی پێغەمبەران یەك لەدوای یەك ( واتقوا یوماً ) وە خۆتان بپارێزن لە سزای رۆژێك ( لا تجزی نفس عن نفس شیئا ) کە کەس لەجیاتی کەس تۆڵەو پاداش نادرێتەوە ( ولا یقبل منها عدل ) وە بارمتەی لێ وەرناگیرێ ( ولا تنفعها شفاعة ) وە هیچ تکایەك کەڵکی ناگرێ ( ولا هم ینصرون ) وە بە هیچجۆرێك یارمەتیی نادرێن •

★ ★ ★

ئەوەبوو لە ئایەتی چلەوە ، تائێرە باسی سەرچەوتیی جوولەکەی کرد ، لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان لە مووساو عیساوە تا محمد ، ناوبەناو ، ناوی گاوورەکانیشی ئەبرد کە هەردوولا پێیانوابوو کە بەهەشت هەر بۆ ئەوانە ، هەروەك، کەمکەم ئیشارەتیشی ئەکرد بۆ بتپەرستەکانی عەرەب •

گاوورو جوولەکەکان خۆیان بە نەوەی إسحاقی کوڕی إبراهیم ئەزانی ،

وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ،

کاتێك کە خوا إبراهیمی تاقی کردەوە بە چەند فەرموودەیەك ، کە ئەویش بەجێی هێنان ،

وە شانازی‌یان ئەکرد بەو پەیوەندی‌یەوە ، وە بەو بۆنەیەوە پێ‌یان‌وابوو کە رێنموونیی‌و سەرۆکایەتیی ئایین ، ئەبێ هەر بۆ ئەوان بێ ، وە لەناو ئەوان نەچێتە دەرەوە •

هەروەك هاوبەش پەیداکەرەکانی عەرەبیش خۆیان بە نەوەی إسماعیلی کوڕری إبراهیم ، وە بە چاودێری کعبە ئەزانی ، وە سەرۆکایەتیی ئایینی‌یان بە هی خۆیان دائەنا لەناو عەرەبا •

ئنجا بەم‌بۆنەیەوە باسێکی ابراهیم‌و اسماعیل‌و اسحاق ئەکات لەگەڵ باسی دروست‌کردنی کعبەو گۆڕرینی رووکە لە « بیت المقدس »ەوە بۆ کعبەو یەکێتی ئایین لە نوح‌و ابراهیمەوە تا مووساو عیساو محمد ، کەواتە نابێ سەرۆکایەتیی ئایین هەر لەناو گەلێکا بێ ، بەڵکو برروا بەخواو بنیاتی ئایین لەناو هەر گەلێکا بێ ، ئەوانە لە کوڕرو نەوەی پێغەمبەران شایستەترن بەو سەرۆکایەتی‌یە چونکە ئایین ئایینی خوایە ، وە لەناوەندی خواو بەندەگانا خزمایەتیی‌و خۆیشایەتیی نی‌یە ، برروای پاك نەبێ •

ئنجا ئەمانەمان بۆ باس‌ئەکات لەکاتێکەوە کە خوا ابراهیمی هەڵبژاردو کردی بە پێشەوای مەردوم ، تا پێغەمبەری ئیسلام هات‌و مسڵمانێتی بڵاو کردەوە ، ئەفەرموێ ( واذ ابتلی ابراهیم ربه ) بی‌گێررەرەوە بۆ مسڵمانان‌و خاوەن نامەکان ، کاتێك کە خوا ابراهیمی تاقی کردەوە ( بکلمات فاتمهن ) بە چەند فەرمووەو فەرمانێك ، کە ئەویش هەمووی بەجێ‌هێنا ، وەك خوا لە سوورەی « نجم »دا گەواهیی بۆ ئەدات ئەفەرموێ « وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّى »[1]• ئنجا لەبەرئەوە ، إبراهیم بوو بە شایستەی ئەم مژدە خۆشەی کە

(١) واتە ئەو إبراهیمەی کە ( فەرمانی خوای ) بەجێ‌هێنا •

قَالَ : إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ، قَالَ : وَمِنْ ذُرِّيَّتِي ؟ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينْ (١٢٤)

( خوا ) فەرمووی : من تۆ ئەکەم بە پێشەوای مەردوم ( إبراهیم ) ووتی : لە نەوەشم ئەکەیت ؟ فەرمووی : پێغەمبەریەتیی من ناگات بە ستەم کاران (١٢٤)

ئەفەرموێ ( قال إني جاعلك للناس إماماً ) خوا پێی فەرموو : من تۆ ئەکەم بە پێغەمبەرو پێشەوای مەردوم • بەڵێ کردی بە پێغەمبەرێکی گەورەی خاوەن‌نامە ، وە قەڵای پتبەرستی پێ رووخاند ، وە بازاڕی ئەوانەی پی کز کرد کە هاوبەش‌و مانندیان بۆ خوا پەیدا ئەکرد ، وە إسحاق‌و إسماعیلی کوڕی و یعقوبی کوڕەزای‌و دوانزە کوڕەکانی یعقوبی کرد بە پێغەمبەر کە یەکێکیان یوسف بوو ، لەپاشا هەر لە نەوەی ئەو ، مووساو زکریاو یحیاو عیساو گەلێك پێغەمبەری‌تری تیا هەڵخست تا لەدواییدا هەر لە نەوەی ئەو ، دواترین پێغەمبەری نارد ــ کە محمدە ــ وە دوای ئەو ، دەرگای پێغەمبەریەتیی داخست ، لەبەرئەوە إبراهیم ناوبراوە بە باوکی پێغەمبەران •

ئنجا وەك یەکێك لێرەدا بڵێ : إبراهیم چی‌ووت دوای ئەو مژدە خۆشە ؟ خواش ئەفەرموێ ( قال ومن ذريتي ؟ ) ابراهیم ووتی : خوایە لە نەوەشم ئەکەیت بە پێغەمبەرو پێشەوای مەردوم ؟ ( قال : لا ينال عهدي الظالمين ) خوا فەرمووی پێغەمبەریەتیی من ناگات بە ستەم‌کاران ، واتە بەڵێ لە نەوەشت ئەکەم بە پێشەوا بەڵام لە باشەکانیان نەك لە خراپەکانیان •

★ ★ ★

إبراهیمی خەلیل لەگەڵ « سارە »ی ژنیا لە فەلەستین دائەنیشت ، لەپاشا « هاجر »ەشی مارەکرد ، وە اسماعیلی لێبوو ، کە خوا کردی بە پێغەمبەر ، ویستی شوێنێکی کەناری پاکی دوور لە هەموو شارستانێتی‌یەك بکات بە مەرکەزی پێغەمبەریەتی‌یەکەی ، هات جێگا شاری « مکە »ی هەڵبژارد ، وە هاجرو اسماعیلی برد لەشوێن بیری « زەمزەم » دایانان ، وە خواش ئاوی « زەمزەم »ی

وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِلنَّاسِ وَأَمْناً ، وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى ،

کاتێك کە کعبەمان گێررا بە پەناگای مەردومانو جێی ئاسایش ، وە ( پێمان ووتن ) جێ‌نوێژ بگرن لە شوێنی إبراهیم ،

بۆ هەڵقولاندن ، إبراهیم دەمێ لە فەلەستینو دەمێ لە حجاز دائەنیشت ، دوای ئەوەی کە اسماعیل گەورەبوو خوا سرووشی بۆ إبراهیم کرد کە لەگەڵ اسماعیل‌دا کعبە دروست بکەن ، هەردوکیان بە جووتە دروستیان کرد ، ئنجا ابراهیم لەخوا پاررایەوە کە ئەوشوێنە بکات بە شارێکی پرر لە ئاسایش‌و دڵنیایی، وە هەمووجۆرە خواردەمەنی‌یەکیان بۆ بنێرێ ، وە پێغەمبەرێکی خاوەن نامەو ئایین‌یان بۆ تیا رەوانە بکات ، بەراستیی خوا ، نزاکەی گیرا کرد ، وە خێڵی « جورهوم » هات لەوێ هەڵی‌دا ، وە إسماعیل ژنی لێ‌هێنان ، وە لەوحەلەوە کعبە زیارەتگایە ، تا خوا لەسەر نزای ابراهیم ، پێغەمبەری ئیسلامی نارد لە نەوەی اسماعیل ، وە ئایینی إبراهیمی پێ تازە کردەوە ، وە لەوحەلەوە هەمووساڵێك بە سەد هەزاران کەس لە هەموو قوررنەیەکی جیهانەوە ئەچن بۆ زیارەتی کعبەو تازەکردنەوەی بیرو باوەرریان ، وەکو ئەفەرمووێ ( واذ جعلنا البیت مثابة للناس ) بیر بکەرەوە کاتێك کە کعبەمان گێررا بە پەناگای مەردومان، تا مسڵمانان لەهەمووساڵێکا بێن‌و بچن بۆ حەج ، وە چاویان بکەوێ بە هەزاران مسڵمانان کە لە هەموو قەراغ‌و بیجارری جیهانەوە بۆی‌ئەچن ، وە یادێکی دوورو درێژی پێغەمبەرو یارانی تیا بکەن ، وە پەشیمان بنەوە لەو خراپانەی کە کردوویانە ، وە رووپەررەی رەشی کردەوەیان هەڵگێررنەوە بە رووپەررە- یەکی سپی بێ‌خاڵ ( وأمنا ) وە گێررامان بە مایەی ئاسایش‌و دڵنیایی ، چونکە لەوێدا کەس دەستی ناچێتە کەسەوە ، وە زورکەس براکوشتە یا باووك‌کوشتەی خۆی تیا ئەبینێ‌و دەستی بۆ نابات ( واتخذوا من مقام ابراهیم مصلی ) وە پێمان‌ووتن کە جێ‌نوێژ بگرن لە شوێنی ابراهیم کە هەموو مسجد الحرامە ، واتە ئەوماوەیەی کە لە مکەدان بەشی زۆری لە مسجد الحرام بن ، وە بە خواپەرستیی‌و نزاو

وَعَهِدْنَا إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ : أَنْ طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ (١٤٥) وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا بَلَداً آمِناً

---

وە سپاردمان بـە ابراهیم‌و اسماعیل کـە خانەی من پاك بکەنەوە بۆ ئەوانەی بەدەوری کعبەدا ئەخولێنەوەو ئەوانەی کە تیا ئەمێننەوەو ئەوانەی کە سجدەو رکووعی تیا ئەبەن (١٢٥) کاتێك کە ابراهیم ووتی : خوایە ئەم‌شوێنە ( کـە مکەیە ) بیکە بە شارێکی پارێزراو ،

---

پاڕانەوەوە خەریك بن • ( وعهدنا الی ابراهیم واسماعیل ) وە سپاردمان بـە ابراهیم‌و اسماعیل ( أن طهرا بیتی ) کە خانەی من پاك بکەنەوە لە هەمووشتێکی ناشایستە ( للطائفین ) بوئەوانەی کە بە دەوری کعبەدا ئەخولێنەوە ( والعاکفین ) وە بۆ ئەوانەی کەتیا ئەمێننەوە بۆ ماوەیەك بەناوی خواپەرستیی‌یەوە ( والرکع السجود ) وە بۆئەوانەی نوێژی تیا ئەکەن‌و سجدەو رکوعی تیا ئەبەن •

★ ★ ★

( واذ قال ابراهیم ) بیر بکەرەوە کاتێك کە ابراهیم ووتی : ( رب اجعل هذا بلداً آمناً ) خوایە ! ئەم‌شوێنەی کە من خانەی تۆم لێ دروست کردووە ، بیکە بە شارێکی پارێزراو لەستەمی ستەم‌کاران‌و دەست‌درێژان • بەراستیی خوا نزاکەی گیرا کرد ، وە هەر زۆردارێکی ستەم‌کار دەست‌درێژیی تیا کردبێ ، خوا لە دەستی داوە ، وەك لەشکری « ئەبرەهە » کە بە خۆیان‌و ئەو فیلانەی کە بردیانە سەر کعبە خوا قڕیی‌کردن •

لە ئایەتی پێشووەوە کە خوا بە ابراهیمی فەرموو « لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ » ابراهیم وا تێگەیشت کە لە داواکردنی رۆژیشا بۆ دانیشتووانی مکە ئەبێ هەر بۆ برواکەرەکانی داوا بکات ، لەبەرئەوە ابراهیم لە نزاکەی

وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ ـ مَنْ آمَنَ مِنْهُمْ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ـ قَالَ : وَمَنْ كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلاً ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَى عَذَابِ النَّارِ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ (١٣٦)

---

وە رۆژیی دانیشتووانی بدە لە میوەهات ـ ئەوانەی کە برروایان هەیە بە خواو رۆژی دوایی ـ ( خوا ) فەرمووی رۆژیی بێبرروواش ئەدەم بۆ چەند رۆژێکی کەم ، لەپاشا ناچاری ئەکەم بە سزای ئاگری دۆزەخ کە خراپترین جێگایە (١٣٦)

---

خۆیا فەرمووی ( وارزق أهله من الثمرات ) رۆژیی دانیشتووانی ئەوشارە بدە لە میوەهاتو خواردەمەنی ( من آمن منهم بالله واليوم الآخر ) ئەو دانیشتووانەی کە برروایان هەیە بە خواو رۆژی دوایی • بەراستیی خوا نزاکەی گیرا کرد ، وە هەمیشە هەموو جۆرە خواردەمەنیو میوەهاتێك بەزۆریی لــە مکەدا هەیە ، نەخوازەلا لەکاتی حەجا •

بەلام رۆژیی جیهان وەك پێغەمبەرێتی نی‌یە کە هەر بدرێ بە چاکان ، بەلکو ئەم بە چاکانیش ئەدرێو بە خراپانیش ، لەبەرئەوە ( قال : ومن كفر فامتعه قليلا ) خوا فەرمووی : رۆژیی بێبرروواش ئەدەم ، وە چەند رۆژێکی کەم بەهرەمەندی ئەکەم لەجیهانا ( ثم اضطره الى عذاب النار ) لەپاشا ، واتە لە رۆژی دوایی‌دا ناچاری ئەکەم بە سزای ئاگری دۆزەخ ، واتە مادام بێبرروایان بەئارەزووی خۆیان رێی بێبرروایی ئەگرن ، ئەو رێ‌یە بەناچاریی ئەیانبا بۆناو ئاگری دۆزەخ ( وبئس المصير ) کە جێگایەکی زۆر خراپو بەدە •

* * *

ئنجا خوای گەورە دیمەنێکی إبراهیمو إسماعیل‌مان نیشان ئەدات کە چۆن دەستیان کردووە بە دروست‌کردنی کعبە ، بەجۆرێکی‌وا وەك ئەوساتە لەلایان بووبیت ، وە چاووت لە کردارو گوێت لە گوفتاریان بووبێت وایە ، ئەفەرموێ

وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ • رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (١٢٧) رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ ، وَمِنْ ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُسْلِمَةً لَكَ ، وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا

---

کاتێك کە إبراهیمو إسماعیل بناغەکانی کعبـەیان بەرزئەکردەوە ( ئەیانووت ) خوایە ئەم کردەوەیەمان لێ گیراکە ، بەراستی هەر تۆیت ژنەوای دانا (١٢٧) خوایە بمانکە بە فەرمانبەری خۆت ، وە لە نەوەشمان گەلێك بکە بە فەرمانبەری خۆت ، وە رێگایانی خواپەرستیمان نیشان بدە ،

---

( واذ یرفع ابراهیم القواعد من البیت واسماعیل ) بیر بکەرەوە کاتێـك کـە ابراهیمو اسماعیل بناغەکانی کعبەیان بەرز ئەکردەوە ــ ئەیانووت ( ربنا تقبل منا ) خوایە : لێمان گیراکە ئەم کردەوەیەمان کە بۆتۆیە ( انك أنت السمیع العلیم ) بەراستی هەر تۆیت ژنەوا بە پاررانەوەمانو دانا بە دڵو دەروونمان •

لەمئایەتەوە دەرئەکەوێ کـە پێویستە لەسـەر هەموو کەسێك کـە خوا پەرستیی‌یەکی کرد بەوجۆرەی کە خوا فەرمانی پێ‌داوە ــ لەخوا بپاررێتەوە کە لێی گیرا بکات ، وە نەیداتەوە بەسەریا ، هەروەك نابێ وابزانێ کە خواپەرستیی‌ـ یەکەی لێ گیرا کراوە ئ

( ربنا واجعلنا مسلمین لك ) خوایە : بمانگێرە بە فەرمانبـەری خۆت بەجۆرێك کە هەر تۆ بناسینو رووت تێ‌بکەین ، وە یامەتیی هەر لە تۆ داوا بکەین ، هەرچی بکەین هەر بۆ تۆی بکەین ، وە هەرچی نەکەین هەر لەبەر تۆ نەیکەین ( ومن ذریتنا أمة مسلمة لك ) وە لـە نەوەمان گەلێـك بکە بـە فەرمانبەری خۆت ، تا ئیسلامیی‌یەت پەرە بسێنێو درێژە بەستێ ، وە بـەهێز بێ بەهۆی مسڵمانانەوە ( وأرنا مناسکنا ) وە نیشانمان بدە رێگایانی خواپەرستیی ،

وَتُبْ عَلَيْنَا ، إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (١٢٨) رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ ، وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (١٢٩)

---

وه پەشیمانيمان لێ گیرا بکە ، بەراستیی هەر تۆیت گیراکەری پەشیمانيو میهرەبان (١٢٨) خوایە : لەناو نەوەکانمانا پێغەمبەرێك بنێرە لە خۆیان ئایەتانی تۆیان بەسەرا بخوێنێتەوە ، وە نامەو زانیاريیان فێرکاتو پاکیان کاتەوە لە هەموو ژەنگێك ، بێگومان هەر تۆیت تەواناي دانا (١٢٩)

---

واتە حەجکردنمان فێرکە تا بزانین چۆنی بکەین ( وتب علینا ) وە پەشیمانیشمان لێ گیرا بکە ( إنك أنت التواب الرحیم ) بەراستی هەر تۆیت میهرەبانو گیراکەری پەشیمانیی •

ئنجا ابراهیم بە چاوی دڵ ئەبینێ کە ئەم خێزانەی لە مکە ، وە لە پاشەرۆژێکی دوورو درێژا کۆمەڵەو گەلێکی لێئەکەوێتەوە ، وە بەمبۆنەیەوە لەخوا ئەپاڕێتەوە کە بەرەکەتیان تێبخات ، وە پێغەمبەرێکیان تیا هەڵخات ، وەکو ئەفەرموی ( ربنا وابعث فیهم رسولاً منهم ) خوایە : لەناو نەوەکانم ــ کە لەم شوێنە ئەکەونەوە ــ پێغەمبەرێك بنێرە لەخۆیان ( یتلو علیهم آیاتك ) ئایەتانی تۆیان بەسەرا بخوێنێتەوە ( ویعلمهم الکتاب والحکمة ویزکیهم ) وە نامەو زانیاريیەکیوایان فێرکات کە دڵو دەروونیان پاك بکاتەوە لە هەموو ژەنگێك ( انك أنت العزیز الحکیم ) بێگومان هەرتۆیت تەواناي دانا •

بەڵێ خوا نزای ابراهیمو اسماعیلی گیرا کرد ، وە لەدوای هەزاران ساڵ ، دواترین پێغەمبەری نارد لە شاری مکە ، وە لە نەوەی ابراهیمو اسماعیل ، تا سرووشی خوایان بەسەرا بخوێنێتەوە ، وە بە قورئانو فەلسەفەی شریعەت دەرسیان دابداتو پاکیان بکاتەوە لە نادانییو بێبڕواییو بێڕەووشتو خوویی•

* * *

وَمَنْ يَرغَبُ عَنْ مِلَّةِ إبْراهِيمَ إلَّا مَنْ سَفِهَ نَفْسَهُ ؟ وَلَقَدِ
اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ (١٣٠)
إذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ ،

---

کێ روو وەرئەگێرێ لە ئایینی إبراهیم مەگەر کەسێك کە خۆی هەرزە کردبێ ؟
بێگومان إبراهیممان هەڵبژارد لە جیهانا ، وە ئەو لە رۆژی دوایی‌دا لە چاکانە
(١٣٠) ( هەڵی‌بژارد ) لەکاتێکا کە خوا پێی‌ووت : فەرمانبەربە ،

---

دوای تاقی‌کردنەوەی إبراهیم بە چەند فەرموودەو فەرمانێك ، وە دوای فەرمان پێدانی بە دروست کردنی کعبە ئەفەرموێ ئایینی ابراهیم ئاسینی خوایە بە تاكو تەنیاو روو تێ‌کردنیەتی بە دڵ ، کە ئەمە رێکی سروشتی ئادەمی‌یە ، وە مەردوم نابێ لێی‌لابدات ، وەکو ئەفەرموێ ( ومن یرغب عن ملة ابراهیم ) کێ هەیە روو وەرگێرری لە ئایینی ابراهیم ( إلا من سفه نفسه ) مەگەر کەسێك کە خۆی هەرزەو پەتەرریی کردبێ ، وە پەردەی بەسەر ژیریی‌و بیریا هێنابێ ، واتە ئایینەکەتان ئایینی إبراهیمی باپیرە گەورەتانە ، کە شانازیی پێوە ئەکەن ، ئیتر چۆن لێی‌لائەدەن ( ولقد اصطفیناه في الدنیا ) بەراستیی ئێمە ابراهیممان هەڵبژارد لەجیهانا بۆ پێشەوایی مەردوم ( وإنه في الآخرة لمن الصالحین ) وە ئەو لە رۆژی دوایی‌دا لەوچاکانەیە کە خاوەنی پلەو پایەی بەرزن ، وە شایستەی ئەوەیە کە دوای خۆی‌و ئایینی بکەوون •

کەس پشت لەم ئایینە ناکات ، نەفامێك نەبێ کە نە بە چاوی پەند تەماشای ئاسمان‌و زەویی بکات ، وە نە بە دڵ وورد بێتەوە لە دروست کراوانی خوا •

خوا ابراهیمی لە جیهانا هەڵبژارد ، بەم‌رەنگە ( اذ قال له ربه اسلم ) کە پەروەردگاری پێی‌ووت : فەرمانبەری خوا بە • ئەمیش بێ‌ئەوەی سێ‌و دووی

قَالَ : أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ (١٣١) وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ : يَا بَنِيَّ إِنَّ اللهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ (١٣٢) أَمْ كُنْتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ

---

( ئەویش ) ووتی : وا خۆم سپارد بە پەروەردگاری جیهانیان (١٣١) ابراهیمو یعقوب ئامۆژگاریی کوررانی خۆیانیان کرد بـە ئیسلامی‌یەت ( وە هەردوولا پێیان‌ووتن ) : ئەی کوررانی خۆمان ! خوا ئایینی ئیسلامی بۆ هەڵبژاردوون ، کەواتە مەمرن بە مسڵمانێتی نەبێ (١٣٢) ( ئەی خاوەن نامەکان ) ئایا ئێوە لەوێ بوون کاتێك کە یعقوب هاتەسەر مردن

---

لێ بکات ( قال : أسلمت لرب العالمين ) ووتی : وا خۆم سپارد بە پەروەردگاری جیهانیـان •

ابراهیم هـەر بە خۆی دەستی هەڵنەگرت بەڵکو ئـەم بیرو باوەررەی بەجێ‌هێشت بۆ نەوەو ، وەچەشی ، وەکو ئەفەرموێ ( ووصى بها ابراهيم بنيـه ويعقوب ) ابراهیمو یعقوبی کوررەزای ئامۆژگاریی کوررانی خۆیانیان کرد بە ئیسلامی‌یەت ، بەم‌رەنگە هەردولا بە کوررەکانی خۆیانیان ووت : ( يا بني ) ئەی کوررانی خۆمان : ( ان الله اصطفى لكم الدين ) خوا ئایینی ئیسلامی بۆ هەڵبژاردوون ( فلا تموتن إلا وأنتم مسلمون ) مەمرن بە مسڵمانێتی نەبێ •

* * *

ئەمە ئامۆژگاریی ابراهیمو یعقوب بوو بۆ کوررەکانیان ، تا یعقوبی کورری إسحاق ـ کە باپیرە گەورەی جوولەکەیە ـ هاتە سەر مردن ، وە گیانەڵاو ئەو ئامۆژگاری‌یەی لەبیر نەبردەوە ، وەکو ئەفەرموێ « أم كنتم شهداء •• » •

ئەگێررنەوە کە جوولەکەکان بە پێغەمبەریان ووت : ئایا نازانیت کە یعقوب وصیتی کردووە بۆ کوررەکانی کە جوولەکە بن ، ئنجا خوا بەدرۆیان ئەخاتەوە ، ئەفەرموێ ( أم كنتم شهداء إذ حضر يعقوب الموت ) ئەی خاوەن نامەکان بۆچ

إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنْ بَعْدِي ؟ قَالُوا : نَعْبُدُ إِلٰهَكَ وَإِلٰهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلٰهاً واحِداً وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ (١٣٣) تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُمْ مَا كَسَبْتُمْ

---

كە بە كوررەكانی ووت : دوای من كێ ئەپەرستن ؟ ( ئەوانیش ) ووتیان : خوای تۆو خوای باوو باپیرانت كـە ابراهیمو اسماعیلو اسحاقە ئەیپەرستین كە تاقە خوایە ، وە ئێمە فەرمانبەری ئەوین (١٣٣) ئەو پێغەمبەرانە دەستەیەك بوون تێپەرریین ، هەرچی‌یان كرد بۆ خۆیانیان كرد ، وە ( ئێوەش ) هەرچی بكەن بۆخۆتانی ئەكەن

---

ئێوە لەوێ بوون كە یعقوب هاتەسەر مردن ( إذ قال لبنیه ) كە بە كوررەكانی خۆی ووت : ( ما تعبدون من بعدي ) دوای من كێ ئەپەرستن ؟ ( قالوا ) هەموو ووتیان : ( نعبد إلهك وإله آبائك ابراهيم واسماعيل واسحاق إلهاً واحداً ) خوای تۆو خوای باوو باپیرانت إبراهیم وإسماعیل وإسحاق ئەپەرستین كە تاقە خوایە ( ونحن له مسلمون ) وە ئێمە فەرمانبەری ئەوین ، واتە ئەی ئەو جوولەكەو گاوورانەی كە پێغەمبەری ئێمە بەدرۆ ئەخەنەوە ، بۆچ ئێوە لای یعقوب بوون كە هاتە سەر مردن ؟ كەوا ئەڵێن یعقوب جوولەكە ، یا گاوور بووە ، واتە ئێوە لەوێ نەبوون ، وە لەخۆتانەوە قسەی درۆ هەڵمەبەستن •

دوای وصیتی ابراهیمو یعقوب بۆ كوررەكانیان ، ئەگونجێ ئەم كورران‌و كوررەزایانە لە دڵی خۆیاناً بڵێن : ئەم باوو باپیرە گەورانەی كە ئێمە هەمانە ، لە رۆژی دوایی‌دا تكامان بۆ بكەن لای خوا ، وە بەهۆی خزمایەتیی ئەوانـەوە رزگارمان ببێ ، ئنجا بۆ لابردنی ئەم بیرو باوەررە فەرمووی ( تلك أمة قد خلت ) ئەوانەی باس‌كران لە ابراهیمو اسماعیلو اسحاقو یعقوب دەستەیەك بوون رۆین بەرێێ خۆیانەوە ( لها ما كسبت ) هەرچی‌یان كرد بۆ خۆیانیـان كرد ( ولكم ما كسبتم ) وە هەرچی بكەن ئێوەش لە چاكەو خراپە بۆخۆتانی

وَلا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٣٤) وَقَالُوا كُونُوا هُوداً أَوْ نَصَارَى تَهْتَدُوا ،

---

وە بەرپرسیار نین لە کردەوەی ئەوان (١٣٤) ( جوولەکەو گاورەکن ) ووتیان ( بە مسڵمانەکان ) : ببن بە جوولەکە یا گاور تا ڕێنموونیی بکەن ،

---

ئەکەن ، وە هەرکەس خۆیو کردەوەی خۆی ( ولا تسألون عما كانوا يعملون ) وە ئێوە بەرپرسیار نین لـە کردەوەی ئەوان ، واتە ئێوە ئەگەر خراپبن ، لـە کردەوەی باشی ئەوان بەهرەمەند نابن . کەوابوو هەر پشت بەخۆتان ببەستن ، نەك بە باوو باپیران •

إمامی غەزالیی ئەفەرموێ : برسیی چەند تێر ئەخوات بـە نانخواردنی باوکی ، وە تینو چەند تێرآو ئەبێ بە ئاو خواردنەوەی باوکی ، گوناهباریش هەر ئەوەندە بەهرەمەند ئەبێ لە باشیی باوکی •

★ ★ ★

ابراهیم باپیری عەرەبو جوولەکەیە ، وە باپیری مووساو عیساو محمدە ، دوای ئەوەی کە لەگەڵ اسماعیلی کورریا کعبـەی دروست کرد ، پاررایەوە لەخوا بۆ وەچەو نەوەکانی ، کە بەرەکەتیان تێبخات ، وە بەرزیان بکاتەوە بە زانینو زانیارییو نامەی ئاسمانییو فەلسەفەی ئایین ، لەپاشا ئەوەبوو باسی وصیەتی ابراهیمو یعقوبی کرد بۆ کوررەکانیان کە پێیانووتن : مەمرن بـە مسڵمانێتی ، وە لەسەر ئایینی ابراهیم نەبێ ، ئایا ئەبێ لەدوای ئەمە ، مەردوم پاشەوپاش بگەررێنەوە بۆسەر ئایینی جوولەکەو گاوور ، کە ئەویان « عزیر »و ئەمیان « عیسا » بە کورری خوا ئەزانن ، یا ئەبێ وصیەتەکەی ابراهیمو یعقوب بگرنە گوێ ، وە هەر سێلا ، بە جوولەکەو گاوورو عەرەبەوە ، مسڵمان ببن ، وەکو ئەفەرموێ ( وقالوا ) جوولەکەو گاوورەکان ووتیان بە مسڵمانەکان ( کونوا هوداً أو نصاری تهتدوا ) ببن بە جوولەکە یا گاوور ، واتە جوولەکەکان ووتیان

قُلْ : بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفاً ، وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ (١٣٥)
قُولُوا : آمَنَّا بِاللهِ ، وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ
وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ ،

---

بڵێ : بەڵکو پەیڕەویی ئاینی پاکی إبراهیم ئەکەین کە لە هاوبەش پەیداکەران نەبووە (١٣٥) بڵێن (ئەی مسڵمانینە) بڕوامان هێنا بە خواو ئەو قورئانەی کە بۆخۆمان نێرراوەتە خوارەوە ، وە بەو نامەیەی کە نێرراوە بو إبراهیمو إسماعیلو إسحاقو یعقوبو کوڕرانی یعقوب ،

---

ببن بە جوولەکەو گاوورەکان ووتیان ببن بە گاوور ، تا ڕێنموونیی بکەن ( قل ) پێیان‌بڵێ ئەی محمد ( بل ملة ابراهیم حنیفاً ) بەڵکو ئێمەو ئێوە پەیڕەویی ئاینی پاکی باپیرە گەورەمان ـ ابراهیم ـ ئەکەین کە قورئان زیندووی ئەکاتەوە ، وە لە هەموو ئاینێکی خراپ بەدوورە ( وما کان من المشرکین ) وە لەوانە نەبووە کە هاوبەش بۆ خوا پەیدابکات .

چەند جوانە ئەم وەرامی قورئانە کەوا ئەیەوێ برایەتی بخاتە ناو هەموو خاوەن نامەکانەوە بێ‌ئەوەی بە یەکێکیان بڵێ : وەرنەسەر ئاینی محمد ، بەڵکو پێیان ئەڵێ : وەرنەسەر ئەو ئاینە گەورەیەی کە پێغەمبەرانی پێشووی لەسەر بوون ، کە ئەویش ئاینی ابراهیمە .

ئنجا بانگی مسڵمانان ئەکات بۆ إعلان کردنی یەکێتی ئاین ، لە ابراهیمەوە تا مووساو عیساو محمد ، ئەفەرموێ ( قولوا : ) ئەی مسڵمانینە بڵێن : ( آمنا بالله وما أنزل الینا ) ئێمە بڕوامان هێنا بەخواو بەو قورئانەی کە بۆخۆمان نێرراوەتە خوارەوە ( وما أنزل الی ابراهیم واسماعیل واسحاق ویعقوب والأسباط ) وە بەو نامەیەی کە نێرراوە بۆ ابراهیمو اسماعیلو اسحاقو یعقوبو

وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ (١٣٦) فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنْتُمْ بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوْا ،

---

وە بەوەی کە دراوە بەمووساو عیسا ، وە بەوەی کە دراوە بە هەموو پێغەمبەران لە پەروەردگاریانەوە ، جیاوازیی ناکەین لە ناوەندی هیچ کامێکیانا ، وە ئێمە فەرمانبەری خواین ( ١٣٦ ) ئنجا ئەگەر برروایان هێنا بەو وێنەیەی کە ئێوە برروواتان پێهێناوە ، ئەوا بێگومان رێی راستیان دۆزییەوە ،

---

کوررانی یعقوب ( وما أوتي موسی وعیسی ) وە بەونامانەی کە یەکەمجار دراوون بە مووساو عیسا نەك بەو تەوراتو ئینجیلە تێکدراوەی کە ئێستا بەدەستیانەوەیە ( وما أوتي النبیون من ربهم ) وە بەونامانەی کە دراوە بە پێغەمبەرانیتر لە پەروەردگاریانەوە ( لا نفرق بین أحد منهم ) ئێمە جیاوازیی ناکەین لەناوەندی هیچکامێکیانا ، واتە برروا ئەهێنن بە هەموو پێغەمبەران بەخۆیانو نامەیانەوە وەك یەك ، ئنجا ئەم پێغەمبەرانە ناوبرابن لە قورئانا ، یا ناونەبرابن ( ونحن له مسلمون ) وە ئێمە فەرمانبەری خواین ، وە پێغەمبەران بە رەوانەکراوی خوا ئەزانین نەك بەکورانی •

دوای ئەم إعلانی یەکێتی ئاینە ، ئیتر ئەم خاوەن نامانە یا هەموو مسڵمان ئەبن ، وە یا لەسەر رێی کۆنی خۆیان ئەمێننەوە ، وە لەسەر دوژمنایەتیی ئیسلام درێژە ئەسێنن ، ئنجا لەم حەلەیانا ، پەنا هەر بە خوایەو یارمەتیی هەر لەوەوەیە، کە مسڵمانان بپارێزێ لە فررووفێڵیان ، وەکو ئەفەرموێ ( فان آمنوا بمثل ما آمنتم به ) ئنجا ئەگەر خاوەن نامەکان برروایان هێنا بەوورەنگەی کە ئێوە برروواتان هێناوە : لە فەرمانبەریی خواو برروا هێنان بە هەموو پێغەمبەران ، بەخۆیانو نامەیانەوە ، بە بێجیاوازیی ( فقد اهتدوا ) ئەوا بێگومان رێی

وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ ، فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (١٣٧) صِبْغَةَ اللهِ

وە ئەگەر پشتیان هەڵکرد وا ئەوان لە دووبەرەکییدان ، وە خوا ئاگاداریی تۆ ئەکات لەوان ، وە هەر خوایە ژنەوای دانا (١٣٧) خوا ڕەنگی کردیین بە ڕەنگی خۆی ( کە ئیسلامییەتە )

ڕاستیان دۆزییەوە ( وإن تولوا ) وە ئەگەر پشتیشیان هەڵکرد لەم بیرو باوەڕە ( فانما هم في شقاق ) وا ئەوان لەلایەکەوە لەگەڵ یەکاو ، لەلایەکیترەوە لەگەڵ ئێوەدا لە دووبەرەکییدان ، وە بەو ڕەنگە ئەمێننەوە ، وە هەمیشە چاووڕراوو دوژمنایەتییتان لەگەڵا ئەکەن ( فسیكفیكهم الله ) ئنجا خوا ئاگاداریی تۆ ئەکات لە خراپەی ئەوان ، واتە مسڵمانانیش تا لەسەر بیروباوەڕی پێغەمبەر بن ، وە لەڕێی ڕاستیی ئەو لانەدەن خوا ئاگاداریییان ئەکات ، وە ئەیانپارێزێ ( وهو السمیع العلیم ) وە هەر خوایە ژنەوای دانا .

بەڕاستیی دواهەمین ئایین ئەبێ وابێ: جیاوازیی هەڵگرێ لەناوەندی پێغەمبەرانو نامەیانا ، وە جیاوازیی لە زبانو ڕەنگو سنوورو وڵاتا نەخوێنێتەوە ، وە بە یەك چاو تەماشای هەموولایەك بکات ، وە ئایینێکی جیهانییو برایەتییەکی جیهانیی دابمەزرێنێ ، بەڵێ ئەمە ( ١٤٠٠ ) ساڵە ئایینی ئیسلام ئەم خزمەتە گەورەیەی کرد ـ لە « مراکش »ەوەتا درگە « جزیرە »کانی « فلیپین » ، وە لە درگەی « سیلان »ەوە تا « بخارا »و « تاشقند » هەمووی یەكخست ، وە هەرچی جیاوازیی بێ لەناویانا هەڵیگرت ، وە بە ڕەنگو بۆی ئیسلام ڕەنگی کردن ، کەواتە ( صبغة الله ) جیا مەبنەوە لەو ڕەنگو بۆیەی کە خوا ڕشتوویەتی بەسەر ئیسلامو ئایینی ئیسلاما ، تا ئەو یەكڕەنگییە ببێ بە بنیات بۆ یەکێتیی هەموو ئادەمیی بەتێکڕایی ، بەجۆرێك کە دەماری ڕەگەزبازیی و تیرە پەرستیی لەناویانا نەمێنێ ، وە کەس نرخ نەدا نە بە باوو باپیرو نە بە جیاوازیی ڕەنگو

وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُ عَابِدُونَ (١٣٨) قُلْ : أَتُحَاجُّونَنَا فِي اللهِ

کێ باشترە لە خوا لە رەنگ رشتنا ؟ وە ئێمە پەرستش هەر بۆ ئەو ئەکەین (١٣٨) بلێ : ئایا دەمەوەریی‌مان لەگەڵ ئەکەن لە کاری خوادا

زبانو سنوور ( ومن أحسن من الله صبغة ؟ ) رەنگی کێ لەمڕەنگی خوایی‌یە جوانترە ؟ واتە هەر خوایە کە بەندەی خۆی رەنگ ئەکات بە رەنگی برروا بە هەموو پێغەمبەران بە خۆیانو نامەیانەوە ، بە بێ‌جیاوازیی لەناویانا ، وە پاکی ئەکاتەوە لە چڵکی بێ‌برروایی •

بەم‌ئایەتـە ئیشارەت ئەکات بۆئەوەی کـە ئایینی ئیسـلام کردەوەیەکی تایبەتیی دانەناوە بۆ جیاکردنەوەی مسڵمان لـە یەکێکی‌تر ، وەك گاوورەکان ئاوێکی زەردیان داناوە کە ئەبێ هەموو منالێـکی تێ‌هەڵکێشرێ کـە پێی‌ئەڵێن « معمودیة » وە بەم تێ‌هەڵکێشانە گۆیا ئەو منالە پاك ئەبێتەوە ، وە ئەم کردەوەیە لای گاوور وەك خەتەنە کردن وایە •

( ونحن له عابدون ) وە ئێمەی مسڵمان خواپەرستین ، وە پەرستش بۆ خوا ئەکەین •

گاوورو جوولەکەکان ئەیانووت: پێغەمبەران هەموو لە ئێمە بوون، وە پێغەمبەر لە عەرەب هەڵنەکەوتووەو هەڵناکەوێ ، وە بەم‌بۆنەیەوە دەمێك ئەیانووت : « لَنْ يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَنْ كَانَ هُوداً أَوْ نَصَارَى »(١) وە دەمێك ئەیانووت : « كُونُوا هُوداً أَوْ نَصَارَى تَهْتَدُوا »(٢) ئنجا خوا بە پێغەمبەر ئەفەرموێ ( قل : أتحاجوننا في الله ) پێ‌یان بڵێ ئەی محمد : ئایا دەمەوەریی‌مان لەگەڵ ئەکەن لە کاری خوادا کەوا پێغەمبەرێکی وەك محمدی هەڵبژاردووەلە عەرەب لە نەوەی اسماعیلی کورری إبراهیم ، وە ئێوە ئەم نزیکی‌یەتان لەخواوە

(١) واتە هەر جوولەکەو گاوور ئەچێتە بەهەشت •

(٢) واتە ئە مسڵمانیینە ببن بە جوولەکە یا گاوور تا رێ‌نموونیی بکەن •

وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ ، وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُخْلِصُونَ ؟ (١٣٩)

لەکاتێکا کە ئەو پەروەردگاری ئێمەو ئێوەیە ، وە کردەوەی خۆمان بۆ خۆمانەو کردەوەی خۆتان بۆ خۆتانە ، وە ئێمە پاکین لەگەڵ خوادا (١٣٩)

لەکوێ دەست کەوتووە ( وهو ربنا وربكم ) لەکاتێکا کە ئەو خوایە پەروەردگاری ئێمەش‌و ئێوەشە ، وەنەبێ هەر خوای لایەك بێ ، وە میهرەبانیی هەر بۆ ئەولایە بێ ، بەڵکو چاکیی‌و خراپیی هەر بە کردەوەیە ، وە هەرکەسە بەری کردەوەی خۆی ئەچنێ ، وەکو ئەفەرموێ ( ولنا أعمالنا ولكم أعمالكم ) کردەوەی خۆمان بۆ خۆمانەو کردەوەی خۆتان بۆ خۆتانە ( ونحن له مخلصون ) وە ئێمە پاکین لەگەڵ خوادا لە کردەوەو بیرو برروامانا ، بەڵام ئێوە هەموو هیوایەکتان هەر بە باوو باپیرو پێشینانتانە ، وائەزانن کە سبەینێ لای خوا تکاتان بۆ ئەکەن ، وە بە تکای ئەوان رزگار ئەبن ، لەگەڵ ئەمیشە کە ئێوە لەرێی ئەو پێشینانەش لاتان‌داوە ، وە لە کردەوەی پاك‌و بیرو باوەرری چاکیان دوور کەوتوونەتەوە •

خولاسە گیانی ئایین ، خواپەرستیی‌و ناسینێتی بە تاك‌و تەنیا ، وە بیروباوەرری چاك‌و کردەوەی پاکە ، لەگەڵ پاکیی دڵ‌و دەروون لە هەموو ژەنگ‌و قەڵبی‌یەك •

هەردەمێك ئایین بێ‌گیان بوو ، وە هەموو شتێکی بوو بە دیمەن پەرستیی وەك بەشی زۆری مسڵمانانی ئەمرۆ کە هەر بە نوێژو رۆژوو ، وە بە هێندێ کردەوەی‌تر خۆیان بە مسڵمان ئەژمێرن ، وە ئەم کردموانە هیچ کارێکیان نەکردە سەر هەست‌و رەووشت‌و خوویان‌و دڵ‌و دەروونیان ، ئەوحەلە هیچ بەهرەیەك لەو کردەوانە نابینن ، نە لەم جیهان‌و نە لەو جیهانا •

تائێستا بە گاوورو جوولەکەکانی ووت : بۆچی ئەبێ پێغەمبەر هەر لە ئێوە بێ ؟ ئەگەر ئەڵێن : ئەمە لەخواوەیە ، خوا هەر وەك خوای ئێوەیە خوای ئێمەشە ، وە پەروەردگاری هەردولایەکمانە ، ئنجا لەمەولا بەجۆرێکی‌تر کێشەو

أَمْ تَقُولُونَ : إِنَّ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطَ كَانُوا هُوداً أَوْ نَصَارَى ؟ قُلْ أَأَنْتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللهُ ؟

---

یاخۆ ئەڵێن إبراهیمو إسماعیلو إسحاقو یعقوبو کوررانی یعقوب جوولەکە بوون یان گاوور ؟ بڵێ ئایا ئێوە داناترن یاخوا ؟

---

دەمقاڵێیان لەگەڵا ئەکاتو ئەیانباتە دواوە ، ئەفەرموێ ( أم تقولون ) یاخۆ ئەڵێن ( إن ابراهیم واسماعیل واسحاق ویعقوب والاسباط کانوا هوداً أو نصاری ) إبراهیمو اسماعیلو اسحاقو یعقوبو کوررانی یعقوب جوولەکە بوون یا گاوور ؟ وە بەمبۆنەیەوە جوولەکەیەتیو گاووریەتی پایەی بەرزبۆتەوە ، ئنجا ئەگەر واڵەڵێن درۆ ئەکەن چونکە ناوی جوولەکەیەتیو گاووریەتی لەدوای مووساو عیسا پەیدا بوون ، وە إبراهیم لەپێش ئەوانا بووە ، وەك خوا ئەفەرموێ « يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تُحَاجُّونَ فِي إِبْرَاهِيمَ ، وَمَا أُنْزِلَتِ التَّوْرَاةُ وَالإِنْجِيلُ إِلَّا مِنْ بَعْدِهِ ؟.. أَفَلا تَعْقِلُونَ »[1] آل عمران /٦٥ • وە ئەفەرموێ « مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِياً وَلا نَصْرَانِياً ، وَلٰكِنْ كَانَ حَنِيفاً مُسْلِماً ، وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ »[2] آل عمران /٦٧، وە ئێوە خۆتان ئەمە ئەزانن ، وە ئەزانن ئەمەی کە ئەیڵێن درۆیەکی زۆر گەورەیە ، لە بەرئەوە خوا بە پێغەمبەر ئەفەرموێ ( قل : أأنتم أعلم أم الله ) پێیان بڵێ : ئایا ئێوە داناترن بەمە ، یاخوا ؟ واتە خوا لە نامەکانتانا دوو گەواهیی داوە ، پێش ئەوەی کە جوولەکەیەتیو گاووریەتیی پەیدا ببێ ، یەکەم کە ئایینی ابراهیم ئایینێکی پاكو بێخەوشە ، وە خوا هەڵیبژاردووە بۆ مەردوم ، دووهەم کە ئایینی دواترین پێغەمبەران ئایینی ابراهیمە ، بەڵام ئێوە ئەم دوو

---

(١) واتە ئەی خاوەن نامە بۆچی دەمقاڵیی ئەکەن لە ابراهیما ( ئەم ئەڵێ جوولەکەو ئەو ئەڵێ گاوور بووە ) لەکاتێکا کە تەوراتو ئنجیل دوای ئەو هاتوونەتە خوارەوە ؟ .. نابێ تێبگەن ؟

(٢) واتە ابراهیم نە جوولەکە بووەو نە گاوور ، بەڵکو مسڵمانێکی پاك بووە ، وە لە هاوبەش پەیداکەران نەبووە •

وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ كَتَمَ شَهَادَةً عِنْدَهُ مِنَ اللهِ ؟ وَمَا اللهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ (١٤٠) تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ، لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُمْ مَا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٤١)

---

کێ ستەمکارترە لەوکەسەی کە گەواهی‌یەکی لە خوا وەرگرتبێو بی‌شارێتەوە ؟ خوا بێ‌ئاگا نی‌یە لەوەی کە ئەیکەن (١٤٠) ئەو پێغەمبەرانە دەستەیەك بوون رۆین ( بەرێی خۆیانەوە ، ) هەرچی‌یان کرد بۆ خۆیانیان کرد ، وە ئێوەش هەرچی بکەن بۆ خۆتانی ئەکەن ، وە ئێوە بەرپرسیار نین لە کردەوەی ئەوان (١٤١) •

---

گەواهی‌یە ئەشارنەوە ، وەکو ئەفەرموێ ( ومن أظم ممن کتم شهادة عنده من الله ) کێ لەوکەسە ستەمکارترە کە گەواهی‌یەکی لەلابێ کە لەخواوە بۆی‌هاتبێ ، وە لە نامەی ئاسمانیی‌دا بۆی باس‌کردبێ ، کەچی بی‌شارێتەوە ( وما الله بغافل عما تعملون ) وە خوا بێ‌ئاگا نی‌یە لەوەی کە ئەیکەن ، وە ئەبێ بزانن کە پاداش بەپێی کردەوەیە ، وە هیچ‌کەسێك لە چاکەی یەکێکی‌ترەوە ، بەهرەمەند نابێ ، وەکو ئەفەرموێ ( تلك امة قد خلت ) ئەو پێغەمبەرانەی کە لەپێش جولەکەیەتیی‌و گاورێتی‌دا بوون ـ کۆمەڵێك بوون لە چاکان رۆین بەرێی خۆیانەوە ( لها ما کسبت ولکم ما کسبتم ) کردەوەی باشی خۆیان بۆ خۆیانەو کردەوەی خراپیی ئێوەش بۆ خۆتانە ( ولا تسألون عما کانوا یعملون ) وە هیچ‌کەسێك برسیاری کردەوەی یەکێکی‌تری لێ‌ناکرێ ، بەڵکو هەرکەسە پرسیاری کردەوەی خۆی لێ ئەکرێ ، وە بەپێی کردەوەی خۆی کاری لەگەڵ ئەکرێ •

ئەم دەستوورە چونکە دەستورێکی بەرزو گرنگە ـ قورئان لێرەدا دوو جار ئەم ئایەتەی فەرمووەوە ، وە لەگەڵێ لای‌تریشەوە ئەم مەعنایە ئەفەرموێتەوە هەرلایەی بەجۆرێك •

* * *

تەفسیری ئەم جزمە تەواوبوو لە رۆژی دووشەممە ٢١/ی شعباني ١٣٨٦ بە ریکەوتی ٥/١٢/١٩٦٦ لــە شاری ســلێمانی ، خوا بیپارێزێ لــە هەموو ناخۆشییو ئاژاوەیەك ٠

# ناوەرۆك

لاپەرەە


٣ پێشکەشکردن •

٥ سەرەتا •

٨ مێژووی دەستکردن بە هاتنە خوارەوەی قورئان •

١٠ مکیو مدنی •

١٠ چۆنێتی کۆکردنەوەی قورئان •

١٣ نووسینەوەی قورئانو کۆکردنەوەی •

١٥ باسی حەوت شێوەی قورئان •

١٨ بەتەنگ قورئانەوە بوونی مسلمانان •

٢٠ شۆرشی محمدعلی پاشای والی مصر •

٢٠ شۆرشی مافی ئادەمیی لە فەرەنسە •

٢١ شۆرشی کرێکاران لە رووسیا •

٢١ شۆرشی پێغەمبەری ئیسلام •

٢٥ خەتو نووسین لەپێش ئیسلاما •

٢٦ ئیملای عثمان •

٣٢ بیروباوەرری زانایان لە ئیملای عثمانا •

٣٤ خەریکبوونم بە نووسینەوە •

٣٥ سوورەی ( فاتحه ) •

٣٩ جۆرەکانی رێنموونیی •

٤٣ سوورەی ( بقرة ) •

٤٣ مەبەس لەو پیتانەی کە لە سەرەتای هێندێ سوورەتەوە هێنراوون •

٤٦ باسی بڕواداران •

٤٧ فەلسەفەی نوێژ •

٤٨ فەلسەفەی زەکات •

لاپەڕە

٥٠ باسی بێبڕروایان •
٥١ باسی ناپاکان •
٦٤ هەموو پێغەمبەریك بەپێی ڕۆژ معجزەی دراوەتێ •
٦٨ ئیعجازی قورئان •
٧٥ پەیدابوونی بوونەوەر •
٧٦ یەکێتی بوونەوەر •
٧٦ درێژبوونی شەووڕۆژ لە چوار سەعاتەوە بۆ ٢٤ سەعات •
٧٨ بچڕرانی مانگ لەزەویی •
٧٨ فروانبوونی بوونەوەر •
٧٩ خڕیی زەویی •
٧٩ سووڕرانەوەی زەویی بەدەوری ڕۆژا •
٨٠ ووردکردنی ذرە •
٨٠ نێرو مێ لە هەمووشتێکا •
٨١ متوربەکردنی هەوور •
٨٢ تا بەرەوژوورتر بیتەوە ئوکسجین کەمتر ئەبێتەوە •
٨٢ دەرچوون لە هێزی کێشندەی زەوییو ئەستێرەکان •
٩١ باسی ئەستێرە گەڕۆکەکان •
٩٥ باسی دروستبونی ئادەم •
١٠١ باسی فریشتە •
١٠١ باسی شەیتانو ئیبلیس •
١٠٢ باسی پەریی •
١٠٤ بەهەشتی ئادەم باخێك بووە لە سەرزەویی •
١٠٨ گوناه خوییە •

لاپەڕە

١١٠ باسێکی دووڕو درێژی جوولەکە •
١١٦ بەڵای گەورە ئەوەیە کە دین ببێ بە پیشەی ژیان •
١١٧ فەلسەفەی خۆراگرتن •
١١٩ باسی شەفاعەت •
١٢١ ڕۆینی مووساو جوولەکە لە میسر ، ڕووەو دەریای سوور •
١٢٢ خنکانی فیرعەونو لەشکرەکەی لە دەریای سوورا •
١٢٢ گوێرەکە پەرستنی جوولەکە •
١٢٥ داواکردنی جوولەکە لە مووسا کە خوایان نیشان بدات •
١٢٨ داواکردنی ئاوی خواردنەوە لە مووسا لەلایەن جوولەکەکانەوە •
١٣٠ داواکردنی سەبزەو دانەوێڵە لە مووسا لەلایەن جوولەکەکانەوە •
١٣٣ پەیمان وەرگرتنی مووسا لە جوولەکەکان لە بن کێوی توورا •
١٣٥ شەممە شکاندنی جوولەکەکان •
١٣٦ فەرماندانی مووسا بە سەربڕینی مانگایەك •
١٤٣ باسی هۆکارێکی ئەمەریکایی کە لێدانی دڵ ئەنووسێ •
١٥١ چاکەکردن لەگەڵ باوكو دایكو خزمو خوێشو هەتیوو بێچارانا •
١٥٥ پەیمان وەرگرتن لە جوولەکە کە یەکتریی نەکوژنو یەکتریی دەربەدەر نەکەن •
١٦٧ حەزکردنی جوولەکە لە ژیان لە هەمووکەس زیاترە •
١٧٢ باسی هارووتو مارووت •
١٧٥ مەعنای اذنی خوا •
١٨٧ جڵەوگیریی پێغەمبەر لە چوونە ناو شاری مکە لەلایەن بێبڕرواکانی مکەوە •
١٨٧ ڕووخاندنی بیت المقدس لەلایەن تیطسی ڕوومانیەوە •
١٩٠ باسی قەزاو قەدەر •

لاپەڕە


١٩٦ تاقی‌کردنەوەی ابراهیم لەلایەن خواوە •

١٩٧ دانانی هاجرو اسماعیل لە شوێن بیری زەمزەم لەلایەن ابراهیمەوە •

١٩٩ سپاردنی پاك‌کردنەوەی کعبە بە ابراهیم •

٢٠١ بەرزکردنەوەی دیواری کعبە لەلایەن ابراهیم‌و اسماعیلەوە •

٢٠١ پاڕانەوەی ابراهیم •

٢٠٤ وصیتی ابراهیم‌و یعقوب بۆ کوڕەکانیان •

٢٠٥ نەوەی خراپ بەهرەمەند نابێ لە باشی باوو باپیر لە ڕۆژی دواییدا •

# تێبینی

**تکایە لەپێش خوێندنەوەدا ئەم هەڵانە چاکبکەن**

| لاپەڕە | دێر | چەوت | ڕاست |
|---|---|---|---|
| ١ | ٦ | جزمی یەك | جزمی یەکەم |
| ١٥ | ٢٥ | ٦٥١٦ | ٦٩٦ |
| ١٩ | ١٧ | وەرگیرڕراوە | وەرگیرڕراوە |
| ٣٨ | ١٧ | وە چشمان | وە چیشمان |
| ٣٩ | ٩ | کشتیاری | یا کشتیاری |
| ٤٠ | ١٤ | بیریش | بیریشی |
| ٤٨ | ٢ | لەوەی | وە لەوەی |
| ٥٠ | ٤ | نەیانترسێنێت | نەیانترسێنیت |
| ٧٧ | ٨ | بە ڕووناکیی ڕۆژ شەو دائەپۆشێ | بەتاریکیی شەو ڕۆژ دائەپۆشێ • |
| ٩٠ | ٥ | (٢٨) لەپاشا | (٢٨) خوا ئەوخوایەیە هەرچی لە زەویدایە دروستی کردووە بۆ ئێوە ، لەپاشا |
| ١١٤ | ١٦ | پێیان ، ئەفەرموێ | پێیان ئەفەرموێ |
| ١٣٨ | ٦ | مامناوەندەیی | ملمناوەندیی |
| ١٣٩ | ١٨ | واتە تازانین | واتە نازانین |
| ١٤١ | ١٦ | یەکیکیان | یەکێکتان |
| ١٤٢ | ٥ | ئاواوە | ئاوا ، وە |
| ١٩١ | ٢٢ | هەڵنەقوڵێنێت • | هەڵنەقوڵێنیت • |